تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
ناكۆ عەبدولكەریم شو
شاری سلێمانی
١٩١٨ - ١٩٣٢
لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی / سیاسییە
www.iqra.ahlamontada.com
٢٧٠١ی كوردی
٢٠٠٢ زاینی

# شاری سلێمانی

## (١٩١٨-١٩٣٢)

" لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی/ سیاسی یە"

ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی

٢٠٠٢زاییینی ٢٧٠١ کوردی

ناوی کتێب: شـــاری سلێمانی ١٩١٨ – ١٩٣٢ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی /سیاسییە

ناوی نووسـەر: ئاکـــۆ عەبدولکەریم شـوانی

چاپ: چاپی یەکـەم

شوێنی چاپ: سلێمانی

ساڵی چاپ: ٢٠٠٢

تیـــراژ: (١٠٠٠) دانە

چاپخانە: زانســت

ژمارەی سپاردنی (٣٥٨) ساڵی ٢٠٠٢ی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی پێدراوە.

پێشکەشە بە:

* هەمـــوو کوردێکـــی نەتەوەپەروەر

* رووناکبیری شەهید "جەمال عیرفان"

* باوکم و دایکم

لـــــەبیرم دێ سـلێمانی کـــە دارولمولکی بابان بـــــوو
نە مەحکومی عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

شێخ رەزای تاڵەبانی

# پێشەكی

دوای كۆتـایی هـاتنی جـەنگی یەكـەمی جیـهانی نێوچـەكانی ژێـر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی رووبـەرووی قۆنـاغێكی نـوێ بونـەوەو وێـرای ئەهامەتیەكانی ساڵانی جەنگ گەلانی نا توركی ژێر دەسەڵاتیئەو دەوڵەتە بە پشت بەستن بە گفت وبەڵێنەكانی وڵاتانی هاوپەیمان، چاویان لەوە بوو لە ژێر دەستەیی ڕزگاریان بێت وببنە خاوەن قەوارەی سەربەخۆ، لەم نێوانەشدا گەلی كورد وەك میللەتێكی ژێر دەستەی عوسمانی هیوایەكی زۆری بە بەڵێنـەكانی وڵاتـانی سەركەوتوو هـەبوو ،لەم پێناوەشـدا كەوتبوونـە چـالاكی پـەیوەندی بەسـتن لەگـەڵ وڵاتـانی وەك بەریتانیا و روسیای قەیسـەری ، لـە كوردسـتانی باشووریشـدا جموجۆڵ پـەیدا ببوو، بەتایبـەتی لـە شاری سـلێمانیدا كـە ئـەو كاتـە شـوێنێكی بـەرچاوی هـەبوو لـە كوردسـتاندا، بۆیـە مامەڵـەكردنی خـەڵكی ئـەم شـارە لەگـەڵ بارودۆخی نوێی دوای جـەنگدا سیمایەكی تایبـەتی هـەبوو دانیشـتوانەكەی بـە چـاوێكی جـودا دەیـان روانیـە پێشـهاتە سیاسـییەكانی ناوچەكـە ،بـە حوكمـی ئـەوەی سـلێمانی شـوێن وپێگـەی جیـاواز وتایبـەتی هەبووە لە چاو شارەكانی دیكەی كوردستانی باشوور.

ئەم شارە ماوەی شەست وحـەوت سـاڵ مەڵبـەند وپایتـەختی مـیر نشینی بابان بووە (١٧٨٤-١٨٥١)وهـەر لـە سـەرەتای بنیادنانیـەوە چـەندین زانـای ئـاینی ومـەلا دەرسـیان تێـدا وتۆتـەوە (مزگـەوتی گـەورە) پڕبـووە لـە فـەقێ لـە زۆر ناوچەی كوردستانەوە روویان تێكردووە بۆ خوێنـدن ،وێـرای ئەمەش سلێمانی ململانێی هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی بە خۆوە بینیوە ،ئەمـەش خۆی لـە خۆیدا هۆكارێكی دیكـەی پێشكەوتنی فیكری ئـەم شارە بووە .

دواتریش مەسەلەی كردنەوەی قوتابخانەی (روشدیەی عەسكەری) بۆتـە هۆكارێكی بەرچاوی تـری پێشـكەوتنی سـلێمانی ،بـە حوكمـی ئـەوەی ژمارەیـەكی زۆر لـە گەنجـەكانی دوای تـەواو كردنـی روشـدیەی عەسـكەری روویانكردۆتـە شـارەكانی بـەغداو ئەسـتەمبوڵ بەمەبەسـتی تـەواو كردنـی خوێنـدن وگەیشـتوونەتە پلـەی ئەفسـەری وزۆر شـوێنیان بینیـوەو چاویـان

کراوەتەوەو ئەزموونێکی زۆریان لا کەڵەکە بووەو ، دوای گەڕانەوەیان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە پێشخستنی سلێمانیدا وشوێن دەستیان لە ململانێ سیاسییەکانی نێو شارەکەدا دیار بووە، خزمەتێکی زۆری بواری ڕۆشنبیری وخوێندەواری ورۆژنامەگەریان کردووە لە سلێمانیدا.

ئەم هۆکارانەش هانیان دام شاری سلێمانی وەك بابەتی ماستەر نامەکەم هەڵبژێرم ،بەتایبەتی ڕەوشی سیاسی لە نێوان سالآنی (۱۹۱۸-۱۹۳۲) دا ، کە ئەو ماوەیە نەك هەر سلێمانی بەڵکو کوردستان بەگشتی ببووە شەرگەیەکی فراوان ،سلێمانیش بەهۆی تایبەتمەندی خۆیەوە وەك ئاماژەمان پێکرد ، ببووە مەکۆی ڕووداوە سیاسییەکانی باشووری کوردستان ، بە تایبەتی لە شەش ساڵی دوای جەنگدا کەسایەتیەکی وەك شێخ مەحمود ، سێ حکومەتی پێك هێناو ،دواتریش تا کۆتایی ساڵی ۱۹۳۱ ، گەورەترین کێشەی بۆ هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراق دروست کردبوو ، بێگومان سلێمانی تەوەری ئەو ڕووداو وجموجۆڵانەی پێك دەهێنا ،بەلآم تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت بەم شارە ئەنجام نەدراوە، گەر شتێکیشی لەبارەوە نووسرابێت ، ئەوا لە ڕوانگەی ڕووداوە سیاسیەکانی دەورووبەرەوە لە ڕۆڵی سلێمانیان ڕوانیوە ،یا ئەوەتە زیاتر بە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودە وە بەستراوەتەوە .

لەم توێژینەوەیەدا بە پێ ی توانا هەوڵمان داوە سەرجەم ڕووداو وپێشهاتە سیاسیەکان لە گۆشە نیگای تایبەتمەندێتی سلێمانییەوە وەربگرین و شارەکە بکەین بە تەوەری ڕووداوەکان .

ئەنجام دانی ئەم کارە بۆ توێژەر هێندە ئاسان نەبووە ، بە حوکمی ئەوەی ئەو ماوەیەی دەست نیشانم کردووە یەکجار چارەنووسسازو پڕ لە گۆڕانکاری بووە ، ئەمەش کارەکەی قورستر کردبوو ، جگە لەوەی بارودۆخی سیاسی کوردستان ڕێگربوو لەوەی دەستمان بگات بە زۆر سەرچاوەو بەڵگە نامەی گرنگ کە باسەکەی دەوڵەمەندتر دەکرد ، هەروەها ئەو کەسایەتیانەی لەو سەردەمەدا ژیاون بەشی هەرەزۆریان لە ژیاندا نەماون ژمارەیەکی کەم نەبێت، ئەوانەش دووربوون لێمانەوە .

ئەم تێزە لە چوار بەش پێك هاتووە هەر بەشێكیش بەسەر چەند باسێكدا دابەش كراوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشی یەكەم:

ئەم بەشە دەكەوێتە دەرەوەی ماوەی دەست نیشان كراو بۆ كارەكە زیاتر سالانی(١٨٩٠-١٩١٨) دەگرێتەوە، بەلام لەبەر گرنگی ئەو قۆناغە بەباشمان زانی بۆ دەوڵەمەند كردنی تێزەكە ئاورێك لە سەرجەم لایەنەكانی ( جوگرافی ، كارگێری سیاسی ، ئابوری ، كۆمەلایەتی ، خوێندن و خوێندەواری ، تەندروستی ) ئەو سەردەمە بدرێتەوە، ئەم بەشەمان لە شەش باس پێك هاتووە بەم شێوەیە:

باسی یەكەم:

سەبارەت بە شوێنی جوگرافی وپێگەی شارەكەیە ،وێرای ئاورێكی خێرا لە گرنگی مێژووی شوێنەكەی.

باسی دووەم:

دەربارەی رەگ وریشەی ناوی سلێمانیەو سەرجەم ئەو رایانەی تیادا هاتووە كە باس لەم مەسەلەیە دەكەن، چ بیروڕای بێگانەكان یا مێژوونووسان ولێكۆڵەرانی كورد.

باسی سێیەم:

ئەم باسە تەرخان كراوە بۆ بارودۆخی كارگێری وسیاسی سلێمانی لە دوا ساڵەكانی دەسەلاتی عوسمانیدا وچۆنیەتی بەڕێوەبردنی دام ودەزگا ئیداریەكان وسیاسەتی عوسمانی ،هەروەها تێڕوانینی دانیشتوانی شارەكە بۆ دەسەلاتی عوسمانی ومامەڵەكردنیان لەگەڵیدا و هەڵسوكەوتی كاربەدەستانی ئەو دەوڵەتە دەرهەق بە خەڵكی.

باسی چوارەم:

هەڵسەنگاندنێكی رەوشی كۆمەلایەتی وئابووریە لەو ماوەیەدا و تیایدا باس لە دۆخی كۆمەلایەتی وداب ونەریتی خەڵكی سلێمانی دەكرێت ، كاریگەری ئەو نەریتانە بۆ سەر دواكەوتنی شارەكە خراونەتە روو ،جگە لەمەش رەوشی ئابووری وچالاكی بازرگانی وباری گوزەران لە سلێمانیدا لە

سایەی دەسەڵاتی عوسمانیدا لایەنێکی دیکەی ئەم باسەیە ، کە وێرای سیاسەتی داگیرکەرانەی عوسمانی سەردەمانێك سلێمانی گەشەکردنێکی ئابووری باشی بەخۆوە بینیوەو جۆرەها پیشەسازی دەست کرد لەم شارەدا برەوی هەبووە.

باسی پێنجەم:

بارودۆخی خوێندن وخوێندەواری وفێرکردن تەوەری ئەم باسە پێك دەهێنێت لە سەرەتایی دروست بوونی شارەکەوە ، کە جگە لە مزگەوت وتەکیە وخانەقاکان قوتابخانەی روشدیەی عەسکەری باسی لێوە کراوە و رۆڵی ئەم نێوەندە زانستیانە خراونەتە روو و هەوڵماندراوە سیاسەتی عوسمانی لە بواری خوێندن وفێرکردندا بخەینە روو، کە بە چ مەبەستێکی شۆڤێنیانە هەوڵی ئاراستەکردنی ئەم بوارەیان داوە .

باسی شەشەم:

دەربارەی باری تەندروستی وئاستی خزمەتگوزاریە تەندروستیەکانە لە سلێمانیدا،وتیایدا مەسەلەی پشت گوێخستنی ئەم بوارە خراوەتە روو کە چ کاریگەرییەکی خراپی بۆ سەر باری تەندروستی شارەکەو رێژەی مردن هەبووەو هەوڵمان داوە ئەم فەرامۆشکردنە پەیوەست بکەین بە سیاسەتی داگیرکەرانەی عوسمانییەوە.

بەشی دووەم:

ئەم بەشە ماوەی نێوان سالأنی(١٩١٨-١٩٢٢) دەگرێتە خۆ ،لەم سەردەمەدا سلێمانی بە گەلێك رووداو پێش هاتی نوێ ئاشنا دەبێت کە هاتنی ئینگلیزو دامەزراندنی یەکەمین حکومداریەتی شێخ مەحمود هەرە پێشینەکەیانە ئەم بەشە بەسەر سێ باسدا دابەشکراوە :

باسی یەکەم:

لە چۆنیەتی هاتنی ئینگلیزبۆسلێمانی دەدوێت و باس لە بەراییەکانی پەیوەندی شێخ مەحمود وخەڵکی سلێمانی دەکات لە گەڵ ئینگلیزەکاندا وێڕای باس کردنی باری ناهەمواری شارەکە لەو سەرو بەندەدا و مامەڵەی ئینگلیز لەگەڵ دانیشتوانیدا.

باسی دووەم:

یەکەمین حکومداریەتی شێخ مەحمود تەوەری ئەم باسەیەو تیایدا هەیکەلی حکومەتەکەی شێخ مەحمود وکاروبارەکەی وپەیوەندییەکانمان باس کردووە ،جگە لە باسکردنی مامەڵەو هەڵسوکەوتی ئینگلیز دەرهەق بەم حکومەتە خراوەتە روو وقسەمان لە هۆکارەکانی تێکچوونی پەیوەندی شێخ مەحمود وئینگلیز کردووە کە بە رووخانی حکومەتەکە کۆتایی دێت.

باسی سێیەم:

ئەم باسە تایبەتە بە سەردەمی دەسەڵاتی راستەوخۆی ئینگلیز لە سلێمانیدا دوای دوورخستنەوەی شێخ مەحمود بۆ هندستان و چۆنیەتی مامەڵەو سیاسەتی ئیداری بەریتانیا لە سلێمانیدا، کە وێرای هەموو توندوتیژی وفشارێك جەماوەری شارەکە هەڵوێستێکی توندیان هەبوو بەرامبەریان، جموجۆڵ وچالاکیەکی زۆریان دەست پێکردبوو بۆ دژایەتی کردنی ئینگلیز، ئەمەش سەرەتایی دەست پێکردنی چالاکی سیاسی نهێنیو پەیدا بوونی گروپ ورێکخراوی سیاسی بوو لە شارەکەدا بەمەبەستی گوشار خستنە سەر ئینگلیز بۆ هێنانەوەی شێخ مەحمود

<u>بەشی سێهەم :</u>

ئەم بەشە ماوەی نێوان کۆتایی سالانی ١٩٢٢تا ناوەڕاستی ١٩٢٤ دەگرێتەوە، ئەم ماوەیەش سەردەمی حوکمداریەتی شێخ مەحمودە، کە تیایدا دوو کابینەی حکومەتی پێك هێناوە ، هەوڵمان داوە باس لە بارودۆخی سیاسی ئەو سەردەمە بکەین کە قۆناغێکی گرنگی شاری سلێمانی پێك دەهێنێت، بەشەکەشمان دابەش کردووە بۆ سێ باس بەم شێوەیەی خوارەوە-

باسی یەکەم :

دەربارەی هێنانەوەی شێخ مەحمود و سیاسەتی ئینگلیزە لەم هەنگاوەیدا ، وێرای خەملێنی هەستی جوودا خوازانەی خەڵکی سلێمانی کە بە ئاراستەیەکی زۆر جیاواز لە ویست و مەبەستەکانی ئینگلیز هەڵسو کەوتیان دەکرد، خودی شێخ مەحمودیش دوای مانگێك لە گەڕانەوەی و پێکهێنانی دووەمین حوکمداریەتی خۆی بە پێچەوانەی ویستەکانی بەریتانیا

جوڵایەوە، بەڵام کەوتە نێو بەرداشی ئینگلیز و تورکە کەمالیەکان و سلێمانی دوو چاری گێژاوێکی سیاسی دژوار هات و پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزدا گەیشتە بن بەست .

باسی دووەم :

سەبارەت بە سەردانی سمکۆی شکاکە بۆ سلێمانی ، کەلەو ڕۆژگارەدا ڕووداوێکی سیاسی گرنگ بوو لە مێژووی شارەکەدا و بە ڕوونی هەست بە ویستە نەتەوەییەکانی خەڵکی سلێمانی دەکرێت، هەرچەندە سمکۆ لەسەر ڕاسپاردەی ئینگلیزەکان ئەم سەردانە دەکات ، کەچی خەڵکەکە تێڕوانینێکی جیاوازیان هەبوو بۆ سمکۆ و مەبەستی سەردانەکەی، بەڵام لە کۆتاییدا سمکۆ سلێمانی جێدەهێڵێ بێ ئەوەی سەردانەکەی هیچ ئاکامێکی لێبکەوێتەوە .

باسی سێیەم :

ئەم باسە تایبەتە بە ڕەوتە سیاسیە جیاوازەکانی ناو شاری سلێمانی و ململانێی نێوان تورکخواکان و لایەنگرانی ئینگلیز وێڕای بوونی ژمارەیەکی کەم لەو ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەرانەی بڕوایان نە بەتورك و نە بەئینگلیز هەبوو ،کە زۆر جار هەردوو دەستەی یەکەم دژ بە دەستەی سێیەم دەوەستانەوە، بەڵام لە سەردەمی دووەمین حوکمدارییەتی شێخ مەحمود دا تورکخواکان لە هەموو کات زیاتر بە هێز بوون و فشاریان خستبووە سەر دەستەکانی تر .

بەشی چوارەم :

ناوەڕۆکی ئەم بەشە زیاتر لە شاری سلێمانی دەدوێت لە نێوان سالانی ١٩٢٥ –١٩٣٢، ئەم سەردەمە سلێمانی لە ژێر سایەی دەسەڵاتی ڕاستەو خۆی ئینگلیز و حکومەتی عێراق دابوو، لەم بەشەدا زیاتر لە چالاکیە سیاسیەکانی دانیشتوانی نێو شارەکە دەدوێین کە ڕۆڵێکی بەرچاویان گێڕاوە لە بزاڤی سیاسیدا دوور لە دەسەڵاتی شێخ مەحمود و هێزەکەی، ئەم بەشەشمان بۆ سێ باس دابەش کردووە :

باسی یەکەم :

سەرتاپای ئەم باسە تەرخان کراوە بۆ ڕۆڵی سلێمانی لە کێشەی ویلایەتی موسڵدا، بە تایبەتی لە کاتی هاتنی لیژنەکەی ( کۆمەڵەی گەلان ) بۆ سلێمانی کە ئەو کاتانە بە شێکی زۆری خەڵکی بە ئاشکرا داوای جیا بوونەوەو سەربەخۆییان دەکرد، بەڵام ڕایەکانیان بە هەند وەنەگیراوە .

باسی دووەم :

لەم باسەدا ئەو گروپ و ڕێکخراوو کۆمەڵە نهێنی و ئاشکرایانەمان خستۆتە ڕوو کە وێڕای فشاری زۆری ئینگلیز و حکومەتی عێراق لە سلێمانی دا پێکهاتوون بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی گەلی کورد، لەم پێناوەشدا چالاکی زۆریان نواندووە ، وەك ڕێکخراوەکانی (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان، جەمعیەتی زەردەشتی ، لقی خۆیبوون لە سلێمانی )، بەڵام ئینگلیزەکان بە خێرایی ئاشکرایان کردوون و هەڵیان وەشاندونەتەوەو ئەندامە چالاکەکانیان دوور خستوونەتەوە .

باسی سێیەم :

ئەم باسەمان تەرخان کردووە بۆ چالاکیەکانی سلێمانی لە ڕۆژانی بەستنی پەیمانی عێراقی – بەریتانی ساڵی ١٩٣٠ کە هیچ ئاماژەیەکی بۆ مافەکانی کورد نەکرد بوو لەبەرامبەریشدا، جەماوەری سلێمانی کەوتنە دژایەتی کردنی ئەم پەیمانەو ڕۆشنبیران و پیاو ماقوڵانی شارەکە دەستەیەکیان پێکهێنا بە نێوی ( هەیئەتی وە تەنیە ) و کەوتنە هاندانی خەڵکی دژ بە پەیمانەکە ، لە ئاکامیشدا ئەو ململانێیەی نێوان حکومەتی بەریتانیو عێراقی و جەماوەری سلێمانی بە کارەساتی ڕۆژی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ کۆتایی هات، وێڕای هەموو نەهامەتی و قوربانیەکان ئەو ڕاپەڕینە بە خاڵی وەرچەرخان دەژمێردرێ لە گواستنەوەی قورسایی خەباتی سیاسی لە لادێیەوە بۆ شار .

بۆ نووسینی ئەم ماستەر نامەیە ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەمان بە کار هێناوە ، هەریەکە بەپێی گرنگی و سەنگ و قورسایی خۆی کە زیاتر بە

هەردوو زمانی کوردی وعەرەبی بوون، دەتوانین بەم شێوەیەی لای خوارەوە پۆلێنیان بکەین :

-یادداشتی ئەو کەسایەتیانەی کە لەو سەردەمەدا ژیاون و لە نزیکەوە ئاگاداری ڕووداوو گۆڕانکاریەکان بوون و خۆیان تیایدا بەشدار بوونە ، جا چ بڵاوکراوە بێت یا دەستنووس، وەك یادداشتەکانی ( ڕەفیق حلمی ، ئەحمەد خواجە ، ئەحمەد تەقی ، مەلا عەبدوللای زێوەر ، شێخ لەتیفی حەفید ، شێخ قادری حەفید ، ڕەشید شەوقی ، ئەحمەدی حەمە ئاغای پشدەری ،......هتد).

-ئەو سەرچاوانەی سەبارەت بە شاری سلێمانی نووسراون لە لایەن نووسەران و مێژوونوسانی کوردەوە ، وەك نووسینەکانی ( ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە و جەمال بابان ) ئەم دوو سەرچاوەیە وێڕای گرنگیان زیاتر گێڕانەوەن و هیچ لێکدانەوەیەکیان تێدا بەدی ناکرێت، هەرچەندە لە ڕووی زانیاری تایبەت بە شارەکەوە زۆر دەوڵەمەندن .

-ئەو نووسینانەی لە شێخ مەحمود و ڕاپەڕینەکانی دواون و لەو نێوانەشدا ئاوڕیان لە سلێمانی داوەتەوە ، بەڵام شێخ مەحمودیان کردۆتە تەوەری ڕووداوەکان، وەك بەرهەمەکانی ( محەمەد ڕەسول هاوار ) کە لە دووبەرگدا چاپکراون، نووسەر دەستی گەیشتۆتە زۆر بەڵگەنامەو سەرچاوە کە ئێمە پێیان ئاشنا نەبووین، هەروەها لە کەسانی وەك ( تۆفیق وەهبی، شێخ بابا عەلی شێخ مەحمود و شێخ ڕەئووفی شێخ مەحمود ) نزیك بووەو لە لایەکەوە سوودی لە یادداشتەکانیان وەرگرتووە لە لایەکی ترەوە زۆر مەسەلەی گرنگی لە زاری ئەوانەوە گێڕاوەتەوە کە خۆیان بۆیان باس کردووە، بەڵام هەست بە دووبارەبوونەوەیەکی زۆر دەکەین لە بابەتەکانیدا.

-ئەو ڕۆژنامەو بڵاوکراوانەی لە ساڵانی دەستنیشان کراو بۆ ماوەی تێزەکە لە سلێمانی دا چاپ و بڵاوکراونەتەوە ، جا چ لە سایەی ئینگلیز دابێت یا لە سایەی دەسەڵاتی حکومەتەکانی شێخ مەحمود دا دەرچووبن، وەك ( پێشکەوتن، بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان ، بانگی هەق ، ئومێدی ئیستقلال، ژیانەوەو ژیان )، بابەتەکانی نێو دوو توێی ئەم ڕۆژنامانە

سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراون بۆ لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە وەك شایەتێکی حاڵی ڕۆژگاری خۆیان .

–ئەو نووسینانەی لە لایەن بێگانەکانەوە نووسراوە سەبارەت بە لایەنەکانی ئابووری ، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، سیاسی کوردستان و تیایدا باسی سلێمانیشیان کردووە وەك بەرهەمەکانی ( ریچ ، مێجەرسۆن ، ئەدمۆندز ، ویلسن ، لۆنگریك ... هتد ).

–ئەو بەرهەمانەی بۆ لێکدانەوەو باسکردنی مێژووی نوێ و هاوچەرخی عێراق تەرخان کراون و لە زۆر شوێندا ئاماژە بۆ شاری سلێمانی دەکەن و ڕۆڵی لە ڕووداوە سیاسیەکانی گۆڕەپانی عێراقدا دەخەنە ڕوو وەك بەرهەمەکانی ( عبد الرزاق الحسنی ) بەڵام لەزۆر شوێندا گیانێکی نازانستیانە بەسەر نووسینەکانیاندا زاڵە ، ئەمەش بۆ بیری شۆڤێنیانەیان دەگەڕێتەوە .

–نووسین و لێکۆڵینەوەکانی ( د.کەمال مەزهەر ) سودێکی زۆر پێگەیاندوین ، بە تایبەتی ئەو بەڵگەنامانەی بە لێکۆڵینەوەوە لە سەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاوی کردونەتەوە ، زۆر لایەنی ئەم تێزەیان دەوڵەمەند کردووە .

–ژمارەیەك نامەی ماستەر و دکتۆراو چەندین بابەت و لێکۆڵینەوەی جیاوازی نێو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان سەرچاوەیەکی دیکەی نووسینی ئەم ماستەر نامەیە بوونە و سوودیان لێوەرگیراوە .

هیوادارم ئەو هەوڵەی بەردەستیشتان بەهەند وەرگرن ، دڵنیام بێکەم و کوڕی نیە ، بەڵام هەر هێندەم لە توانادا بوو کە لەماوەی دووساڵدا هەوڵمداوە بە شێوەیەکی زانستیانە دایبڕێژم.

# بەشی یەکەم

## سلێمانی لە دواساڵەکانی حوکمڕانیی دەوڵەتی عوسمانی دا
## (١٨٩٠ - ١٩١٨)

- باسی یەکەم: شوێنی جوگرافی شاری سلێمانی.
- باسی دووەم: رەگ و ڕیشەی ناوی (سلێمانی).
- باسی سێیەم: بارودۆخی کارگێڕی و سیاسی.
- باسی چوارەم: بارودۆخی ئابوری و کۆمەڵایەتی.
- باسی پێنجەم: بارودۆخی خوێندن و خوێندەواری.
- باسی شەشەم: بارودۆخی تەندروستی.

## باسی یەکەم:
## شوێنی جوگرافی

ناوچەی سلێمانی سنوری لای باکووری ناوچەی هەولێرە ، و لای باشوریەوە ناوچەی دیالەیەو لای خۆرهەڵاتی وڵاتی ئێرانەو بەلای رۆژئاواشیدا ناوچەی کەرکوك‌و تکریتە.

پانتایی ناوچەکە (١٣٣٦٨)کم٢، ئەم شارە لەنێوچەکی شاخاوی سەخت دا شوێنی خۆی کردۆتەوە[1] و لای باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی بە زنجیرە شاخەکانی (سورداش، ئەزمڕ، پیرەمەگرون) دەوردراوە لای رۆژئاواشیەوە زنجیرە چیای قەرەداغ سنورەکەی پێك دەهێنێت‌و چیای گۆیژەش دەکەوێتە لای رۆژهەڵات‌و باکووری رۆژهەڵاتی سلێمانی.

شاری سلێمانی‌مەڵبەندی بەرێوەبردنی پارێزگای سلێمانیە، کە یەکێکە لەپارێزگا گرنگەکانی کوردستانی گەورە بەگشتی‌و هەرێمی کوردستانی باشوور بەتایبەتی.[2] ئەم شارە بەسەر دەشتی شارەزووردا دەڕوانێت کە لەڕووی کارگێڕیەوە ناوەندی لیواکەیە.[3]

بەرزترین دوو لوتکە شاخی سلێمانی بریتین لە (تەختە)ی سەر سنوری ئێران کە بەرزاییەکەی (٢٦٢٦) مەترەو پیرەمەگرونی رۆژهەڵاتی رێگای سلێمانی – کەرکوك کە (٢٦٧٠)م بەرزە[4] خودی لیواکە لەنێوان (٩٤٠٠) کم٢ و (٩٥٠٠)کم٢ دا دەخەمڵێندرێت.[5]

بەشێوەیەکی گشتیش وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد سلێمانی لەڕووی تۆبۆگرافیەوە بە بەشێك لەناوچەی شاخاوی دادەنرێت، تا لەخوارەوە بەرەو

---

[1] عبدالرزاق الحسنی: العراق قدیماً وحدیثاً، لبنان ١٩٥٦، ل ٢٢٧.

[2] محمد هادی الدفتر: العراق الشمالی، بغداد، ١٩٥٠، ل ٣٧٣-٣٧٤، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: کوردی سلێمانی و بەغدا لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانی‌دا، گۆڤاری پەیڤین، ساڵی ٢٠٠٠، ژ ٩ ل٢٠٤ .

[3] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردەکانی سلێمانی، پەیڤین -ژ-٩، ل ٢٠٤.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٤-٢٠٥.

[5] عبدالرزاق الحسني: العراق قدیماً وحدیثاً، ل٢٢٧.

ژوورتر بڕۆین یا لەرۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژئاوا بڕۆین، زەوی ژێر پێمان بەرزتر دەبێتەوە.[٦] هەر بۆیە تەنانەت شارەکەش بریتیە لەگردۆڵکەو دۆڵی گەورەو بچوك‌و ئاوهەواکەشی، زیاتر لەئاوهەوای دەریای سپی ناوەڕاست دەچێت. لەزستاندا ساردو باراناویە، بەڵام بەهۆی دووری لەدەریاوە، شێدار نیە، هاوینانیش گەرم‌و وشکە.[٧]

رەشەباش بۆخۆی دیاردەیەکی شروشتی، ناخۆش‌و هەراسانکەری ئەم شارەیە، لەزستاندا دەبێتە هۆی دابەزینی پلەی گەرماو، لەهاوینیشدا بە پێچەوانەوە، جاری وا هەیە ماوەیەك درێژە ئەکێشی، ئەوەتا ریچ لەم بارەیەوە، ئەنووسێ: "هەموو دانیشتوانی سلێمانی ئەم ساڵ بەدەست رەشەباوە هاواریانە، کە هەوای ئەمساڵی ئەوەندە گەرم کردووە بۆتە مایەی سستی‌و تەمبەڵی‌و لەسەرەتای هاوینەوە لەوەتەی دەستی پێکردووە سێ رۆژ لەسەر یەك بێ رەشەبا نەبووە.[٨]

---

[٦] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: کوردی سلێمانی، ل ٢٠٤-٢٠٥.

[٧] جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی یەکەم ، بەغداد،١٩٩٣ل١٤.

[٨] کلودیوس جیمس ریچ: گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، وەرگێڕانی محمدی حەمە باقی،تەورێز ١٩٩٢، ل٢٧٧ .

## باسی دووەم:
## رەگ‌و ریشەی ناوی (سلێمانی)

سەبارەت بەناوی شاری(سلێمانی)و رەگ‌و ریشەی ئەم ناوە چەندین بیرو رای جیاواز هەیەن بەڵام رای ریچ لەهەمووان باوترە، ریچ پێی وایە کە ئیبراهیم پاشای بابان، بەناوی سلێمان پاشای والی بەغداوە ناوی ناوە.[9] ئەم بیرو بۆچوونەش دواتر لەنوسینی زۆربەی نوسەرو مێژونوسەکاندا دووبارە بۆتەوە. تەنانەت زۆربەی مێژوونوسانی کوردیش هەمان بیرو بۆچونیان پەسەند کردووەو لەنوسینەکانیاندا رەنگی داوەتەوە هەر بۆ نموونە ئەمین زەکی، لەم بارەیەو دەڵێت "ئیبراهیم پاشا هەر لەنزیك سەراکەی مەحمود پاشای مامیەوە کە لەساڵی ١٧٨١ لەنزیك گوندی "مەڵکەندی"یەوە دروست کرابوو، دەستی کرد بە بینای شارێك لەدووری سەراکەداو، خانوو مزگەوت‌و حەمام‌و بازاڕو خانی دروست کردو لە ساڵی ١١٩٩ك — ١٧٨٤ز ئەم شارە تازەیەی تەواوکردو مەرکەزی ئەمارەتی لە (قەڵاچوالان)* ەوە، بردە ئەوێ‌و بەناوی سلێمان پاشای والی بەغدادەوە ناوی نا سلێمانی"[10].

هەروەها گەر ئاورێك لەنووسەرو مێژوونوسانی بێگانەش بدەینەوە دەبینین ئەوانیش بەهەمان شێوە هەمان بۆچونیان هەیە سەبارەت بەناونانی سلێمانی. ستیڤن همسلی لونگریك کاتێك دێتە سەر مەسەلەی ناوی شاری سلێمانی، لای خۆیەوە باس لەوە دەکات، کە هەڵبژاردنی ئەم ناوە، بەمەبەستی رێزگرتن‌و بەرزراگرتن‌و بەنەمری هێشتنەوەی ناوی (سلێمان

---

[9] گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، ل ١٣٨/١٣٧.

* قەڵاچوالان ناوی گوندێکە دەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتی سلێمانی و ( ١٧ ) کم لێوەی دوورە ، ئەم گوندە لە ساڵی ١٦٦٩ ز تا ١٧٨٤ ز پایتەختی میرنشینی بابان بووە ، کاتی خۆی میر سلێمانی کوڕی ( خان بۆداغ ) دوای فراوان کردنی قەڵەم ڕەوی دەسەڵاتی خۆی پایتەختی لە دارەشمانەو ماوەت گواستەوە بۆ ئەم شوێنە .(تۆفیق وەهبی : اصل تسمیة قەلاچوالان ، جریدة التاخي ، عدد ١٤٥٤ ، ١٩٧٣/١٠/٨ ؛ تۆفیق قەفتان : مێژووی حوکم دارانی بابان لە قەڵاچوالان تا دروستکردنی شاری سلێمانی ، بەغدا ، ١٩٦٩ ، ل ١٩ .

[10] تاریخی سلێمانی‌و وولاتی، بەغداد، ١٩٣٩ ،ل ٨٩–٩٠

پاشای گەورەی)ی والی بەغدا بووە.[١١] بەم جۆرە ناوی سلێمانی بۆ سلێمان پاشای والی بەغدا دەگێڕێتەوە[١٢] لەنێو مێژوو نووسانی عەرەبیشدا، عەبدولرەزاق حەسەنی لایەنگری ئەم بۆچوونەیە، هەر چەندە، ئاماژە بەوەش دەکات، کە بۆی هەیە بەناوی (سلێمان پاشا)ی باپیرە گەورەی ناوی نابێت.[١٣]

بەلام لەنێو مێژوونوسانی کورددا، جەمال بابان، پێی وایە، ئیبراهیم پاشای بابان، بۆ ناونانی شاری سلێمانی لەیەك کاتدا، (سلێمانی) بۆ بەنەمری هێشتنەوەی ناوی (بابا سلێمان)ی باپیری و ستایش کردن و رێز لێنانی (سلێمان پاشا)ی والی بەغدا، هەلبژاردووە.[١٤]

هەرچی (د. فوئاد حەمە خورشید)ە، بە هەموو شێوەیەك ئەوە رەت دەکاتەوە کە هیچ پەیوەندیەك لەنێوان ناونانی شاری سلێمانی و سلێمان پاشای والی بەغدادا هەبێت، لەم بارەیەشەوە راشکاوانە دەلێت " ئێمە پێمان وانیە کە ساویلکەیی و ملکەچی ئیبراهیم پاشا بگاتە ئەندازەیەك کە ناوی پێیتەختی نوێی میرنشینەکەی بەناوی پاشایەکی عوسمانیەوە ناو زەد بکات، کە بەواقیعی و لەراستیدا خۆی بەدوژمنی دەزانێت، بەلام گوێرایەلیەکی سەر زارەکی بۆی هەیە ".[١٥]

وێرای ئەم بۆچونە باوە، دوو بۆچوونی دیکەش لەم بارەیەوە هەیە ( یەکەمیان پێی وایەن ئەم شارە لەسەر شوێنەواری شارێکی کۆن بونیاد نراوە ناوی (سیلۆنا) بووە*، بۆچوونی دووەمیش، ئەوەیە کە کاتێك کرێکارەکان سەرقالی هەلکەندنی بناغەی ئەم شارە بوون ئەموستیلەیەکی کۆنیان

---

[١١] اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر الخياط، بغداد، ١٩٨٥. ل ٢٤٩

[١٢] س.ج، ادموندز: كورد، ترك، عرب، ترجمە، جرجيس فتح الله، اربيل ، ١٩٩٩، ل٥٦

[١٣] العراق قديماً وحديثاً، لبنان، ١٩٥٦، ل ٢٨٨.

[١٤] اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، جزء الاول / بغداد، ١٩٨٥، ل ١٥٤-١٥٥

[١٥] مدينە السليمانيە، دراسة في جغرافيتها التأريخية، گۆڤاری، کاروانن ژمارە ٥٤، ل١٥٤

* نەخشەکانی سەردەمی ئاشوورییەکان ئاماژە بۆ شوێنەواری شارێکی کۆن دەکەن کە لە هەمان شوێنی ئێستای سلێمانی دابووە بە نێوی ( ئاساری – Asari) . ( د. فؤاد حەمە خورشید : مدينة السليمانية دراسة ... ، گۆڤاری کاروان ، ژمارە ٥٤ ، ل ١٥٠).

دۆزیوەتەوە، ناوی سلێمانی لەسەر هەڵكۆڵراوە ئیدی ئیبراهیم پاشا بڕیاری داوە، كە ئەم شارە نوێیە ناو بنێت سلێمانی.[١٦]

رایەكی دیكە هەیە، پێی وایە كە ناونانی (سلێمانی) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، كاتێك ئیبراهیم پاشا بڕیاری دروست كردنی ئەو شارە دەدات و كاری تێدا دەكەن، مژدەی بونی كوڕێكی پێدەدەن، ئەویش ناوی دەنێت (سلێمان)، دواتر شارەكەی بەناوی ئەو كوڕەیەوە ناو دەنێت سلێمانی،[١٧] بەڵام جەمال بابان، ئەم رایە رەت دەكاتەوە، چونكە لەو كاتەدا ئیبراهیم پاشا هیچ كوڕێكی نەبووە، بەناوی (سلێمان). تا شاری سلێمانی، بەناوەوە بكات[١٨] جگە لەم بیرو رایانە، رایەكی دیكەی تاك و تەنها هەیە كەوای بۆچووە، ئیبراهیم پاشا شاری سلێمانی، بەنێوی (سلێمان پاشای جەلیلی) حوكمڕانی شاری موسڵەوە ناو ناوە، بەڵام، ئەم بۆچوونە، لەلایەن (د. فوئاد حمە خورشید)و (جەمال بابان)ەوە رەت كراوەتەوەو هەردووكیان ئەم ڕایەیان بە رایەكی دوور لەڕاستی زانیوە، چونكە هیچ مانای نابێت، ئیبراهیم پاشان گوێ لەفەرمان و قسەی (سلێمان پاشای جەلیلی)بگرێت، كە خۆشی لەژێر فەرمان و دەسەڵاتی والی بەغدا دابووە.[١٩] دوژمنی یەكتریش بوون.بەڵام پێمان وایە لە ناونانی سلێمانی‌دا، برایم پاشا ناوی والی بەغدای بەسەر زارەكی و رواڵەتیش بووبێ رەچاوكردبێ، چونكە گوشاری بەغدا بۆ سەر ئەم میرنشینە زۆر بووە و ناچار بووە دڵی والی بەغدا رابگرێ بەو ناو نانە.مێژووی ئەم دووسەد ساڵ زیاترەی لەمەو دوای كوردیش زیاتر ئەم رایە دەچەسپێنێ.پاشان ناونانی ئەم شارە بە ناوی (سلێمان بەبە)وە، واتە كورد شانازی بە مێژووی رابردوویەوە دەكات و هۆشێكی مێژوونووسیی هەیە، لە كاتێكدا كورد لە راستیدا ئەو هۆشەی نەبووە و ئەگەر وابووایە مێژووی خۆی دەنوسییەوەو ناوی سەركردەكانی بە نەمری دەهێشتەوە.

---

[١٦] محمد هادي الدفتر: العراق الشمالي، ل ٣٧٩.

[١٧] جمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب١،ل ٢٧-٢٨

[١٨] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨.

[١٩] گۆڤاری كاروان، ژ ٥٤ ، اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، ل ١٥٤-١٥٥

سەبارەت بەوەش، کە ئاخۆ ئیبراهیم پاشای بابان هۆی چیبوو پایتەختی میرنشینەکەی، لە قەڵاچوالانەوە گواستەوە بۆ سلێمانیو بۆچی ئەم شارە نوێیەی بونیاد نا، ئەوا لەم بارەیەوە، جەمال بابان، پێی وایە، کە هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە قەڵاچوالان، شوێنێکی چەپەكو لاڕێو بەرتەسك و بووەو بواری پەرەسەندنو گەورەبوونی نەبووەو نزیك بەسنوری ئێران بووەو لەژێر مەترسیدا بووە[٢٠] ئەمەش خۆی لەخۆیدا هۆیەك بوو کە میرنشینی بابان بەردەوام لەنێو جەرگەی ململانێی (عوسمانی — سەفەوی) دابێت، بەتایبەت لەسەردەمی نادرشاو سوڵتان مەحمودی یەکەم،[٢١] ئەمە جگە لەوەی ئیبراهیم پاشا کە بنیات نەرو دروست کەری شاری سلێمانی بوو، سەردەمی منداڵی لەبەر چەند هۆیەکی رامیاری لەبەغدا بەسەر بردووە، میرنشینی بابانیش لەرێی والی بەغداوە هەر سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوو، بۆیە لە شوێنێکی دواکەوتووی وەك قەڵاچوالانی ئەو رۆژەدا هەڵی نەکرد.

جگە لەوەی وەك هەر میرو سەردارێك چاوی لەوەبوو کە بەهۆی دروست کردنی ئەم شارەوە، ناوو شورەتێك بۆخۆی و بنەماڵەکەی بەدەست بهێنێ[٢٢]، ئەم فاکتەرانەو چەند فاکتەرێکی دیکەی ئیداریو رامیاری رۆڵی سەرەکیان بینی لەبونیادنانی ئەم شارە، وێرای ئەوەی شوێنی ئێستای شاری سلێمانی، لەڕووی جوگرافیەوە یەکجار لەبارترو شیاو تربوو بۆ هاتو چۆو هەڵسوڕانو باری ئاسایشی شارەکە،[٢٣] هەروەها سلێمانی لەرۆژگاری عوسمانیدا، لەڕووی کشتوکاڵو بازرگانیەوە شوێنێکی بەرچاوی هەبووە[٢٤]. دەشتەکانی دەوروبەری سلێمانی باشترین شوێن بوون بۆ چاندنی دانەوێڵەی وەك (گەنمو

---

[٢٠] سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب١ ، ل٢٣.

[٢١] د. فوئاد حمه خورشید: مدینه السلیمانیه دراسه فی جغرافیتها التأریخیه، مجله کاروان، ١٩٨٧ ژمارە، ٥٤،ل١٥١

[٢٢] جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی یەکەم ، ل ٢٣.

[٢٣] د. فوئاد حمه خورشید: مدینه السلیمانیه، مجله کاروان، ١٩٨٧ ، ژمارە ٥٤ ، ل ١٥٢.

[٢٤] عەلی سەیدۆ گۆرانی: لەعەممانەوە بۆ ئامێدی و: تالیب بەرزنجی، سلێمانی ، ٢٠٠٠، ل١٢٣.

جۆو نیسكو نۆك) و ناوچەیەكی ئاودار بووە كە ئەم مەسەلەیەش خۆی لەخۆیدا فاكتەرێكی بەهێزی گواستنەوەی پێیتەختی میرنیشنی (بابان) بووە، بۆ سلێمانی[25] هەر لەبارەی گرنگی شوێنی ستراتیژی سلێمانیەوە. نوسەرێك بەنێوی (ئیبراهیم حیلمی) لە ساڵی ١٩١٣ وتارێك سەبارەت بەلیوای سلێمانی دەنوسێت، لەوێدا دەڵێت " سلێمانی مەڵبەندێكی گرنگو خەتەر ناكە، لەسەرتاپای كوردستانی عوسمانیدا، شار نیە لەزۆربەی حاسڵاتو بەروبوومو فراوانی بازرگانی و گرنگی شوێنەكەیەوە بیگاتێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە تاقە شوێنێكە بۆهاتو چۆو كاروانسەرای كاروانە بازرگانیەكان، ئەو كاروانانەی لەویلایەتەكانی بەغداو بەسرەوە دەهاتنو دەچونە تارانو كوردستان . درۆناكەم گەر بڵێم لەجێی عەمبارێكی بازرگانیە لەنێوان توركیاو ئێران"[26]

وێرای ئەوەی بەدرێژایی مێژوو نێوچەی سلێمانی سەرە ڕێگای، ئەو سوپایانە بووە، كە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشتوون.[27]

ئیدی دەتوانین بڵێین شوێنی ئێستای شاری سلێمانیو سەرجەم هەرێمەكە گۆرەپانی شەڕو ململانێی نەتەوەو هۆزە جیاوازەكان بووە لە زۆربەی سەردەمە مێژووییەكاندا .[28]

بەم شێوەیە برایم پاشای بابان لەساڵی ١٧٨٤ ز دا، پێیتەختی میرنشینەكەی لە قەڵاچوالانەوە گواستەوە، بۆ شوێنێك كە (٢٠) میل لە باشوری خۆرئاوای زنجیرە چیای (ئەزمەر)ەوە دوورەو دەكەوێتە پشتیەوە، كە گوندی (مەڵكەندی) یەو لەوێدا شارە نوێیەكەی دروست كردو ناوی نا

---

[25] عباس العزاوی: شهرزور -السلیمانیة، اللواء والمدینة، مراجعة /محمد علی قرەداغی، ط١، بغداد، ٢٠٠٠،ل ٤٧.
جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب١،ل ٢٨.

[26] ئیبراهیم حیلمی: لیوای سلێمانی، رۆشنبیری نوێ، ١٩٨٨ ، ژمارە ١١٦، ل ٦٤.

[27] شاكیر خەسباك، لیوای سلێمانی، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە، عەتا قەرەداخی، سلێمانی، ٢٠٠٠ ل ٨.

[28] عباس العزاوی، شهرزور-سلیمانیە، ل٥٠

(سلێمانی)[٢٩] فەرمانیشی دا بەخەڵکی قەڵاچوالان، کە بگوێزنەوە بۆ سلێمانیو لەگەڵ خۆیاندا دەرگاو پەنجەرەو دارو بەردی خانووەکانیشیان بگوێزنەوە تاوەکو لەوێ دووبارە لەدروست کردنەوەی خانوودا بەکاریان بهێننەوە[٣٠].

د. جەمال رەشیدو د. فەوزی رەشید، بەو پەڕی دڵنیایەوە، دەڵێن " ئێمە دڵنیاین لەوەی کە نێوچەی سلێمانی، دڵی ئەو شوێنە پێك دەهێنێت، کە لولوبییەکانی تێدا نیشتەجێبوونو لەهەمان کاتیشدا پێیتەختی شانشینێك بووە کە لەمێژوودا بە (خەمازی) ناسراوەو لەهەزارەی سێهەمی پ. ز دا بوونی هەبووە . کە لولوبییەکان بەتایبەتی لەنێوچەکانی دەوروبەری سلێمانیدا ژیاون، کە لەسەردەمی ئاشوریەکاندا بە ولاتی (زاموا) ناسراوە ". [٣١]

بەڵام سەبارەت بەمێژووی نوێی سلێمانی، ئەوا ئەدمۆندز دەیگێڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی بابا سلێمان لەنیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا[٣٢].

---

[٢٩] س. ج، ادموندز: کردو ترکو عرب، و/ جرجیس فتح الله، اربیل، ١٩٩٩ ، ل٥٦ .

[٣٠] عباس العزاوي: شهرزور – السليمانية، اللواء والمدينة ، ل ١١١

[٣١] تأريخ الكورد القديم، اربيل، ١٩٩٠، ل٤٣

[٣٢] کرد وترك وعرب ،ل٥٥.

# باسی سێیەم:
# بارودۆخی کارگێڕیو رامیاری

ناوچە کوردیەکان، هەر لەدوای جەنگی (چاڵدێران)* ی ساڵی (١٥١٤)ز، ەوە جۆرە سەربەخۆییەکیان پێ درابوو، هەر بۆیە لە نێوچەی سلێمانیشدا میرنشینی بابان، ماوەیەکی زۆر حوکمڕانی کرد تا ئەوکاتەی لەئەنجامی ململانێی خۆبەخۆداو دەست تێوەردانو پلان گێڕی بەردەوامی عوسمانیەکانو ئێرانیەکان دەسەڵاتی ئەم میرنشینە کۆتایی هاتو لەساڵی ١٨٥٠ ز بەدواوە، شاری سلێمانی خرایەوە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی عوسمانیو عەبدوڵڵا پاشای بابان، کە دوامیری ئەم میرنشینە بوو لەلایەن حکومەتی عوسمانیەوە کرا بەقائیمقامو وەك موچەخۆرێکی دەوڵەت مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا. بەڵام دواتر لەکارخراو ماوەیەك لەبەغدا بەدەست بەسەری هێڵدرایەوە، دواتر رەوانەی ئەستەمبوڵ کراو[٣٣] ئیسماعیل پاشایەکی تورك کرا بەقایمقام. لەدوای ئەوەشەوە هەر قایمقامێك رووی کردبێتە ئەم شارە لەدووساڵ زیاتر حوکمڕانی نەکردووە و لابراوە، تەنانەت تا هاتنی ئینگلیز (٢٩) موتەسەڕیف رووی کردۆتە ئەم شارە[٣٤]. هەر بۆیە دەشێت بڵێین ساڵانی نێوان ١٨٥٠-١٩١٧ سەردەمی حوکمی راستەوخۆی عوسمانیەکان لەم

---

* ئەو جەنگە لە رێکەوتی ١٥١٤/٨/٢٣ لە دەشتی چاڵدێران رویدا لەنێوان هەردوو سوپای عوسمانی و سەفەوی ، سولتان سەلیم خودی خۆی فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی بوو لە بەرامبەر شا ئیسماعیلی سەفەوی. لە ئاکامدا سەفەویەکان شکستێکی گەورەیان بەسەرهات و شا ئیسماعیل بە برینداری مەیدانی جەنگی جێهێشت.
کوردەکان لەم شەڕەدا رۆڵێکی بەرچاویان بینی لە پشتگیریکردن و سەرخستنی عوسمانیەکاندا. لە ئەنجامدا بەشێکی زۆری کوردستان کەوتە ژێر دەستی عوسمانیەکانەوە.
(سعدی عثمان حسین: کوردستان والامبراطوریة العثمانیة، دراسة في تطورها السیاسي ١٥١٤-١٨٥١ ، ل٢٨-٢٩)

[٣٣] نەوشیروان مستەفا ئەمین: میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی رۆمو عەجەمدا، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٢١٠

[٣٤] جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٢،ل١٠
محمد امین زکی: تاریخ سلێمانی و ولاتی، ل٢٠٢،٢٠٣،٢٠٤

شـارەداو ڕەشـترین ڕۆژگـاری ئـەم وڵاتـەش بـوو. شـاریٚ سـلێمانیش وەك یەکەیـەکی کارگێڕی دەوڵـەتی عوسمـانی، کـە لـە نیـوەی دووەهـەمی سـەدەی نۆزدەیەمەوە ڕاستەوخۆ بە ویلایەتی موسڵ بەسترا بۆوە، ئەو کاتە مەڵبەندی قەزا (سنجق) بوو. ویلایەتی موسڵیش لەسیٚ لیوا پێك دەهات، کە بریتیبوون لـە موسـڵو سـلێمانیو شـارەزوور) کـە مەڵبـەندی کـەرکوك بـوو، قـەزای سلێمانیش بریتیبوو لە پێنج قەزاو یانزە ناحیەو ١٠٨٢ گوند بەڵام زۆرجار دەوڵـەتی عوسمـانی گۆڕانکـاری ئیـداری زۆری لـە سـلێمانیو دەوروبـەریدا دەکرد. بەتایبەتی لەئەنجامی کێشـەو ئـاژاوەی خێڵـەکانی ئـەم ناوچانـە، بـۆ نموونە، لەساڵنامەکانی ١٩٠٧-١٩٠٨و ١٩١١-١٩١٢، ئاماژە بەوە دەکات کە قـەڵادزیٚ وەك قەزایـەکی نـویٚ شـوێنی قـەزای (مەرگـە)ی گرتۆتـەوەو قـەزای (سورداش) خراوەتـە سـەر سلێمانی. ئەوکاتـە دەوڵـەتانی عوسمـانی هـەندێك لەقەزاکانی بەپێی گرنگیو فراوانبونیان ڕێك خستووە، واتە هەندێك لەقەزاکان پلە سیٚ بوون، وەك قەڵادزیٚ، بەڵام بازیان پلە دوو بووەو دواتر گرنگی زیاتر پێدراوە کراوە بە پلە یەك....

حوکمڕانـی عوسمـانی لـەم لیوایەشـدا هیـچ جیاوازیـەکی نـەبوو لەگـەڵ لیواکـانی دیکـەدا.سـاڵنامەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی زانیـاری زۆریـان تێدایـە سەبارەت بەکارگێڕی عوسمانی لـە لیوای سلێمانیدا بەڵام زانیارییەکان زیاتر بریتین لـەباس کردنـی پۆسـت و پلـە ئیداریـەکان، بیٚ ئـەوەی هیـچ زانیاریـەکی تێدا بێت سەبارەت بە میکانیزمی کارکردنی ئەو فەرمانگەو بەڕێوەبەرایەتیانە. تەنانـەت کـاتێك دێتـە سـەر ناوهێنـانی ئـەو فەرمانبـەرو موچەخۆرانـەی کـە لـە سلێمانیدا کاریان کردووە، تەنها ناوی خۆیان دەباتو کـەم جار نـاوی باوكو باپیریانی تۆمارکردووە، ئەمەش بۆخۆی دەبێتـە هـۆی ئـەوەی هیـچ یـەکێك لـەو فەرمانبەرانە نەناسرێن.

بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم ساڵنامەکانی عوسمـانی، هـەمان زانیـاری دووبـارە دەکەنـەوە سـەبارەت بـە بـارودۆخی کـارگێری لیـوای سـلێمانی کـە ناوەڕۆکەکانیان بریتین لەژماردنی، پلەو پایـەو نـاوی فەرمانبـەرو کاربەدەست، نـاوی فەرمانگـەو کارگێڕیـەکانی دەوڵـەت لـەناوی شـاری سـلێمانیو قـەزاو

ناحیەکانی دەوروبەریدا، ئەم شێوەیەی خوارەوە کە لەساڵنامەی ١٨٩٠-١٨٩١ دا هاتووە :-

١-بنەماڵەکانی لیوای سلێمانی (کاربەدەستە گەورەکان).

موتەسەڕیف، جێگری موتەسەڕیف، موفتی لیوا، بەرپرسی ژمێریاری لیوا، نەقیبی ئەشراف، بەڕێوەبەری موکاتەبات .

٢-ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی لیوا:- کە لەکاربەدەستە گەورەکانی لیواکە وچوار ئەندامی دیکەی هەڵبژێردراو دێت.

٣-فەرمانبەرانی لیوا ( مەئمورەکان)، بریتن لە :-

أ-بەڕێوەبەری فەرمانگەی تەلگراف.

ب-بەڕێوەبەری ئینحساری توتن (ڕێژی).

ج-بەڕێوەبەری باج

د-بەڕێوەبەری تەندروستی (کەرەنتینە)

وێڕای چەندین فەرمانگەو بەڕێوەبەرایەتی دیکە وەك (ژمێریاری و نفوس و شارەوانی و دام و دەزگای دادگاکان و یەکە سەربازیەکان و بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس.

بەلام لەساڵنامەکانی، سالانی ١٨٩٣-١٨٩٥، ناوی چەند فەرمانگەیەکی نوێمان بەرچاو دەکەوێت کە لە لیوای سلێمانیدا پەیدابوون وەك (فەرمانگەی قەرزە گشتیەکان و فەرمانگەی مەسح و لقێکی بانکی کشتوکاڵی... بەهەمان شێوە کاروباری کارگێری قەزاکانی دیکەی لیوای سلێمانی هیچ جیاوازیەکیان نەبوو لەگەڵ سەرجەم قەزاکانی لیوای موسڵ و لیواکانی دیکەی هەر سێ ویلایەتەکە.[35]

لەو سالانەدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەشێوەیەکی گشتی دووچاری داڕوخان و لاواز ببوو. سلێمانیش لەدوای نەمانی میرنشینی بابان، شیرازەی رامیاری و کارگێڕی لێك هەڵوەشابۆوە.[36] فاکتەری سەرەکی دواکەوتنی هەر سێ ویلایەتەکەش بە پلەی یەکەم بۆ سیاسەتی نالەبارو بەڕێوەبردنی

---

[35] د. عبد الفتاح علی یحی: السالنامات، ل٤٧،٤٨،٤٩-

[36] رەمزی قەزاز: بزوتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد، سلێمانی ١٩١٧، ل٨٦، ٨٧

ئیفلیجی عوسمانی دەگەڕێتەوە، کە جگە لەرووتاندنەو باج کۆکردنەوە، کاربەدەستانی ئەم وڵاتە هیچ شتێکی دیکەیان نەدەزانی.[٣٧]

رژێمی باجگری لەدەوڵەتی عوسمانیدا بەری سەدەها ساڵانی ناتەواوی و کەم و کوڕی بوو، کە لەبنەڕەتدا رژێمی ئابوری و باجگری ئەو وڵاتە لەسەر بناغەی دەرەبەگایەتی خێڵایەتی دامەزرابوون کە لەشوێنێك بۆ شوێنێکی تر جیاواز بوو بەهۆی پەیوەندی خێڵەکیەوە، بەڵام لە بنەڕەتدا یەك شت بوو، هەموو باجێك باجی تری بەدوادا ئەهات ئەم کردارە ناڕەوایەش بەزۆری ئەو موچەخۆرانەبوون کە ئەرکی باج کۆکردنەوەی دەخرایە ئەستۆیان تەنانەت کاتێك روویان دەکردە گوندێك، سێ ژەمە لەوێ نانیان دەخوارد. بەڵام دواتر بەبیانووی خراپی خواردنەکە، گوایە دانیانی ئازارداوە، باجێکی دیکەیان داهێنابوو بەناوی باجی ددان، کە دەبوایە جوتیار بیدایە پێیان. ئەم جۆرە باجانەو چەندین چەشنە باجی دیکەو دەردی بیرۆکراتیەت گیانی دەوڵەتی عوسمانی و گشت دەزگاکانی ئەو دەوڵەتەی پەك خست.[٣٨]

لەهەمان کاتدا بەحوکمی دوورە دەستی ئەم سێ لیوایە لەپایتەختەوە هێندەی دیکە پشت گوی خرابوون، تەنانەت لەئەستەمبۆل دا دووری ئەم ناوچانەیان بەنموونە دەهێنایەوە[٣٩]

لەراستیدا ئەم دووریە ببووە هۆی ئەوەی زیاتر بەدەست دواکەوتوویی و نائارامی و پێشێویەوە بناڵێنێت، ئەم فاکتەرە وای کردبوو کە هیچ فەرمانبەرو موچەخۆرێك ئامادە نەبوو روبکاتە ئەم وڵاتە دوورە دەستە، مەگەر بەزۆر بیان ناردایە، یا ئەوەتا وەك صدیق الدملوجی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت "لەفەرمانبەرێکی گەورەم پرسی، بۆچی ئەستەمبۆڵ ئەم فەرمانبەرە نا شایستەو هیچ و پوچانە بۆ وڵاتی ئێمە دەنێرێت؟ لەوەڵامدا پێی وتم، وڵاتەکەی ئێوە ئەوەندە دوور بێت لەئەستەمبوڵ و ئارامی و ئاسایشی تێدا بەرقەرار نەبێت، ئەوا بێگومان خاوەن لێهاتووییەکان حەز بەوە ناکەن روو لەم

---

[٣٧] صدیق الدملوجی: امارة بهدینان الکردیة،ط٢، اربیل، ١٩٩٩، ل٧٩

[٣٨] د. کاوس قەفتان: وتاری مێژوویی، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٢٥-٢٦

[٣٩] لونگریك: العراق الحدیث، ١٩٠٠-١٩٥٠، ج، ل١٩

ولاتە بکەن، هەر بۆیە ناچار ئەوانە ڕەوان دەکەن کە هیچ لەبارا نەبوون، یا دەیانەویت دەستیان لە پلەو پایە گیربێت، یا بەنیازی خۆ دەوڵەمەند کردن ڕوودەکەنە ولاتی ئێوە"[٤٠]

هەر بۆیە سەرجەم ئەو کاربەدەستو موچەخۆرانەی ڕوویان لەم سێ ویلایەتە دەکرد، هیچ سیفەتێکی لێپرسراوێتیان تێدا نەبوو، بۆیە بارودۆخی ئەم ولاتە لەڕووی کارگێڕییەوە لەو پەڕی گەندەلیدا بوو. فەرمانبەرانی عوسمانی لەکەسانێك دەچوون کە لەخانێکدا بژێتو دلنیا بێت ماوەیەکی دیکە چۆلی دەکاتو جێی دەهێڵێت، ئیدی هیچ بەلایەوە گرنگ نیە ئەو شوێنە چی لێدێت یا چارەنووسی بەچی دەگات.[٤١]

هەر بۆیە بەردەوام دەسەلاتی عوسمانی لەچاوی خەڵکدا بێزاروو بەدناو بووەو کەس خۆشی بەچارەیدا نەهاتووەو ئامادە نەبووە گوێرایەڵی بێت[٤٢]. بەڵکو بەردەوام خەڵکی پەیوەست بوون بە سەرۆك خێلەکانی خۆیانەوەو ڕێنماییەکانی ئەوانیان جێبەجێ کردووە نەك هی دەوڵەتی عوسمانی و کاربەدەستانی.[٤٣]

مێجرسۆن باس لەوە دەکات کە چۆن فەرمانبەرە تورکەکان لە دەرەوەی شارە کوردیەکاندا شوێنییان نەبۆتەوەو ڕێگەیان پێنەداون هیچ پۆستێکی ئیداری وەربگرن،[٤٤] هەرچەندە لەو سالانەدا ژمارەیەکی بەرچاو لەکاربەدەستو ئەفسەرو پۆلیسەکانی عوسمانی لە نێو شاری سلێمانیدا کورد بوونو موچەخۆری عوسمانی بوون وەك بنەماڵەی غەواسو بنەماڵەی ئاغا تەها.[٤٥]

---

[٤٠] امارة بهدينان الكردية ،ل٧٢

[٤١] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩.

[٤٢] د. كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات الحرب، ل١٢٧-١٢٨.

[٤٣] لونگريك: العراق الحديث ١٩٠٠-١٩٥٠ ج١، ل٢٩-٣٠

[٤٤] رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، ج١، بغداد ١٩٧٠، ل٢٥٦

[٤٥] ڕەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، دەوڵەتەکەی خواروی کوردستان، ب١، لەندەن١٩٩٠،ل٢٢٩،٢٣٢

بەڵام سەبارەت بە بارودۆخی سیاسیو کارگێڕی شاری سلێمانی ئەوا، هەر لەدوای رووخانی میرنشینی بابانو نەمانی ئەو دەسەڵاتە کوردیە، بۆشاییەکی گەورەی سیاسیو کارگێڕی دروست بوو، ئەو کاتەش بنەماڵەی شێخان، خەریك بوو لەبنەماڵەیەکی ئایینیەوە دەبوون بەدەسەڵاتدارو خاوەن موڵكو زەویو زار، هەر بۆیە ئەو بۆشاییەیان پڕکردەوە کە نەمانی بابانیەکان دروستی کردبوو، کە بێگومان کارێکی هێندە ئاسان نەبوو.[٤٦]

دەسەڵات پەیداکردنو دەوڵەمەندبوونی ئەم بنەماڵەیە بۆ ئەو پلەو پایە ئاینیە دەگەڕێتەوە کە لەشێخ مارفی نۆدێی و بەتایبەتی کاکە ئەحمەدی شێخەوە بۆیان مابۆوە،[٤٧] وێڕای ئەوەی کاتێك دەوڵەتی عوسمانی توانای بەڕێوەبردنی وڵاتی نەمابوو زەویەکانی بەکرێ دەدا کە پێی دەووترا (لزمە)ن ئیدی شێخ سەعیدی کورەزای کاکە ئەحمەدی شێخ بڕێکی زۆری لەو زەویو زارانە بەکرێ گرتو هەندێکی کڕیو هەندێکیشی زەوت کرد، نێوبراو لە بنەماڵەی شێخاندا لەهەموان زیاتر ناوی دەرکردو دەسەڵاتی پەیدا کرد.[٤٨]

دەوڵەتی عوسمانی ئەو سەردەمانە نەریتێکی پەیرەو دەکرد کە بریتی بوو، لەگرنگی پێدانو لەخۆنزیك کردنەوەی ئەو بنەماڵەو خانەوادانەی خاوەن ناوناوبانگو پلەو پایەو دەسەڵاتن بەتایبەت پیاوانی ئاینو سەرۆك خێڵو دەرەبەگەکان.[٤٩]

هەر بۆیە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ کاك ئەحمەدی شێخدا هەبوو، دواتریش بەهەمان شێوە لەگەڵ شێخ سەعیدی کورەزاشیدا پەیوەندیەکی بەتینیان هەبوو، شێخ قادری حەفید لە یاداشتەکانیدا سەبارەت بە پەیوەندی باوکی لەگەڵ سوڵتاندا باس لەوەدەکات

[٤٦] سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٦، عەلی سەیدۆ گەورانی، لەعەممانەوە بۆ ئامێدی، ل١٢٢.

[٤٧] رەمزی قەزاز، سەچاوەی پێشوو، ل٨٧

[٤٨] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، دهۆك، ١٩٩٥، ل١٦.

[٤٩] لونگریك: العراق الحدیث، ل٧٣

کە لە سەردەمی سولتان عبدالحمید دا نـەوەکانی کـاك ئەحمـەدی شـێخ زۆر جێی بایەخی سولتان بوونە بە تایبەتی شێخ سەعیدی حەفید.[٥٠]

جگە لەوەی لەو سالانەدا بنەماڵەی شێخان چەندین جار توانیویانە بەرگری لەشاری سلێمانی بکەن دژ بەهێرش و پەلاماری هەمەوەندەکان کە لەنێوان سالانی ١٨٧٩-١٩٠٨ ز دا چەندین جار هەڵیان کوتاوەتە سەر سلێمانی و جاری وا هەبووە چەند رۆژێك ئابلۆقەیان داوە،[٥١] پیرەمێردی شاعیریش لەیاداشتەکانیدا بەدرێژی باس لەیەکێك لەو هێرشانە دەکات و چۆن خەڵکی شار توانیویانە بەرەنگاری بکەن.[٥٢]

تا دەهات ناوو شۆرەتی شێخ سەعید زیادی دەکرد، ئەوەبوو لەساڵی ١٩٠١-١٩٠٢ ز، لەلایەن سوڵتانەوە بەرەسمی بانگهێشت کرا بۆ ئەستەمبوڵ، ئەویش بەیاوەری هەرسێ کورەکەی (شێخ ئەحمەدو شێخ مەحمودو شێخ قادر) و دەستەیەك لەپیاوانی ناوداری سلێمانی رووەو ئەستەمبوڵ چوون[٥٣] کە زێوەری شاعیریشیان لەگەڵدابوو، کە خۆی لەگەنجینەی مەرداندا لەم بارەیەوە باس لەوە دەکات کە ئەوانەی بەشداری سەفەرەکەی ئەستەمبوڵیان کرد ، زیاتر کەسانی زانا و پیاوماقوڵان بوون، منیش بەهۆی نزیکی و هاورێیەتیم لەگەڵ شێخ مەحمود دا بەشداریم کرد.[٥٤] ئیدی ئەم دەسەڵات و ناوبانگەی شێخ سەعید بووە هۆی ئەوەی کە هەندێك لەئەندامانی بنەماڵەکەو دەست و پێوەندەکانیان ئەم بارە بقۆزنەوەو بکەونە خۆ دەرخستن و ئازاردانی خەڵکی، بەتایبەتی دوای گەرانەوە شێخ سەعید لەسەفرەکەی ئەستەمبوڵ، دەست و پێوەندیەکانیان کەوتبوونە هەوای خۆیانەوەو لەهەموو کاروبارێکدا دەست درێژیان دەکردو سەر ئێشەیەکی زۆریان بۆ شێخان نایەوە. کە لەئاکامدا بووە هۆی ئەوەی ئەم خانوادەیە زیاترو زیاتر ناحەزو دوژمنیان بۆ

---

[٥٠] یاداشتەکانی شێخ قادری حەفید: دەستنوس، ل١.

[٥١] مێجرسۆن: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٩،٢٣٠،٢٤١،٢٤٢

[٥٢] یاداشتەکانی پیرەمێرد: ل٢،٣

[٥٣] عەلائەدین سجادی: شۆرشەکانی کوردو کۆماری عێراق، بغداد، ١٩٥٩، ل٧٩.

[٥٤] گەنجینەی مەردان، ل٥٧ .

پەیدا بێت، جا چ لەبنەماڵە بەنێوبانگەکانی ئەو رۆژگارەی سلێمانی، یا لەنێو بازرگان و پارەدارو ئەو تازە ئەفسەرانەی کە لەئەستەمبوڵ گەڕابوونەوە، تەنانەت دوژمنانی شێخ سەعید بۆ توانج پێیان دەوت "شێخی سوڵتان"[٥٥] بەتایبەتی کاتێك شێخ سەعید لەئەستەمبوڵ لەگەڵ (شوکت پاشا عابد"ی سەرەك وەزیراندا قسەیان کردبوو سەبارەت بەناردنی مەئموری تایبەتی سەرەك وەزیراندا بەمەبەستی زیادکردنی باج لەسەر بازرگانی، ئەم مەسەلەیەش بازرگانەکانی سلێمانی زیاتر برد بەقیندا،[٥٦] دوای گەڕانەوەی شێخ سەعید لەئەستەمبوڵ خۆی تاکە دەسەڵاتداری سلێمانی بوو، رەفیق حیلمی لەم بارەیەوە دەڵێت: "دوای گەڕانەوەی شێخ سەعید بۆ سلێمانی، ئەو مەتەسەرێف و سەرەك لەشکرانەی لە سلێمانی بوون، یا بۆی ئەنێردران، بێگومان لە قارو غەزەبی شێخ سەعید خۆیان ئەپاراست ئەکەوتنە ژێر نفوزیەوە، هەندێك لەمانە ئەگەیشتنە رادەیەکی ئەو تۆکە بێ پرس و رای حەفید پەنجەیان نەکەن بە ئاوا"[٥٧]

خەڵکە رەشوکیەکەش بەشی زۆریان هاتنە ژێر سایەی شێخەوەو بوون بە پیاوی، ئیدی بازرگانەکانی سلێمانی تەواو لەشێخ پەست بوون و بۆ هەلێك دەگەڕان تۆڵەی لێ بکەنەوە، باشترین هەلیش هاتنە سەرکاری کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی بوو کە لەساڵی ١٩٠٩ دا سوڵتان عەبدولحەمیدیان ناچار کرد دەست لەکاربکێشێتەوە[٥٨] بەدروشمی سەرنج راکێش خەڵکیان بەلای خۆیاندا بەکێش کردوو کەوتنە تەنگ پێ هەڵچنینی هەموو ئەوانەی کە پێشتر نێوانیان لەگەڵ سوڵتاندا خۆش بوو یالێوەی نزیك بوون.[٥٩] کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی لەزۆربەی شارەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا لقیان کردەوە، وەهاش لەشاری

[٥٥] رەسول هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل١٤٣-١٤٤-١٤٥

[٥٦] رەمزی قەزاز، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

[٥٧] یاداشت، ب١، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٨٨، ل٣٦.

[٥٨] د. ومیض جمال عمر نظمي ،د.شفيق عبدالرزاق،د.غانم محمد صالح: التطور السياسي في العراق المعاصر، ل٣٦-٣٧.

[٥٩] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل١٤٦

لەیاداشتەکانیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەسەرانی ئەو کۆمەڵەیە داوایان لە شێخ سەعید کردووە، سەرۆکایەتی لقەکەی سلێمانی بکات، بەڵام شێخ سەعید قەبوڵی نەکردووەو وتویەتی "خیانەت لە سوڵتان ناکەم حقی لطف و نعمەتی زۆرە".[٦٠]

زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لقێکی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی لە سلێمانیدا بەسەرۆکایەتی (مەحمود پاشای جاف) دامەزراوە کە زۆربەی ئەندامەکانی لەناحەزانی بنەماڵەی شێخ سەعید بوون، بەتایبەتی بازرگان و دەوڵەمەندو ئەفسەرەکانی شاری سلێمانی لەم کۆمەڵەیەدا بوون بەئەندام.[٦١]

کەمال رەئووف محەمەد، بە بەڵگەوە ئەوەی سەلماندووە کە دەستەی یەکەمی ئەم رێکخراوە لە سلێمانیدا لەرێکەوتی ١٩٠٨/٨/١٧ دەست بەکاربوون، کە بریتی بوون لە (ئاغا فەتحولا چەلەبی،فائق توفیق، ئەحمەد دەروێش)، هەروەها دەستەی دووەمی هەمان رێکخراو لەسلێمانیدا بەفەرمانێکی هەرێمی موسڵی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی لە ١٩٠٨/١٢/٢٠ دەست بەکاربوون و چەند کەسێکی نوێی هاتۆتە ریزەوە، کە ئەمانە بوون (عەزمی بەگ، موسڵی محەمەد جار کوڕی حاجی ئەمین ئاغا، ئیبراهیم بەگ زادە فەتاح و فەهمی ئەفەندی وەکیلی تابور ئاغیسی، موحاسیبی بانق عەبدولرەحمان بەگ کوڕی ئەحمەد ئاغا، ئەدیب ئەفەندی مودیری تەلەگرافی)، بەڵام بە پێچەوانەی هەموو سەرچاوەکان کەمال رەئووف محەمەد پێی وایە کە ( مەحمەد پاشای جاف ) هیچ پەیوەندیەکی بەلقی سلێمانی ئەم رێکخراوەوە نەبووە.[٦٢] لەکاتێکدا هەریەك لەشێخ قادری برای شێخ مەحمودو هەرسێ کوڕانی شێخ مەحمود جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە مەحمود پاشای جاف سەرۆکی بووە.

---

[٦٠] یاداشتەکانی شێخ قادری حفید، ل١.

[٦١] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل١٤٧، رەفیق حیلمی: یاداشت، ب١، ل٣٨.

[٦٢] جەمعیەتی ئیتحادو تەرەقی عوسمانی– لقی سلێمانی – ١٩٠٨، رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارەکانی (١٤٨٦)، ١٩٩٧/١٠/٣٠، (١٤٨٧)١٩٩٧/١١/٢، ( ١٦٠٦)١٩٩٨/٥/٥.

هەر بۆیە ناشێت مەحمود پاشا لەم مەسەلەیدا بەشدار نەبووبێت، لەکاتێکدا پەیوەندی نێوان بنەماڵەی شێخ سەعیدو عەشیرەتی جاف زۆر ئاڵۆز گرژبووەو ئەو ساردیەی نێوانیشیان زۆری خایاند.[٦٣]

ناحەزانی شێخ سەعید لەپەنای ئەم رێکخراوەوە کەوتنە هەوڵدان بۆ لێدانی شێخ سەعیدو کەم کردنەوەی دەسەلات، شێخ قادری حەفید لەم بارەیەوە لە یاداشتەکانی‌دا نوسیویەتی: کەوا ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە لە سلێمانی هەموو هەوڵ و کۆششێکیان خستەگەڕ بۆ لێدانی بنەماڵەی شێخان، لە بەرەی بازرگانەکانیش مەحمود پاشای جاف درێخی‌ی نەکرد، کەلە ئاکامدا شێخ سەعید و ژمارەیەك لە برا و کوڕەکانی دوورخرانەوە بۆ موسل.[٦٤]

هەر بەو جۆرە شێخ سەعیدو بەشێك لەبنەماڵەکەی بەدەست بەسەری رەوانەی موسڵ کران[٦٥] شێخ مەحمود خۆی لەم بارەیەوە باس لەوە دەکات کە بڕی سێ هەزار لیرەی زێر وەك بەرتیل دراوە بەکاربەدەستان تا ئەو پلانەیان لەدژ بکرێت.[٦٦]

دوای ناردنی شێخ سەعید و بنەماڵەکەی بۆ موسڵ، بەپێی پیلانێکی بەرنامە بۆدارێژراو لەلایەن کاربەدەستانەوە لەرێکەوتی ١٩٠٩/١/٥ دا لەئاژاوەیەکی دروست کراودا، شێخ سەعید و شێخ ئەحمەدی کوڕی و ژمارەیەکی زۆر لەدەست و پێوەندەکانی کوژران و شێخ مەحمود بە بریندار ی خۆی دەشارێتەوە.[٦٧]*

---

[٦٣] رەسول هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٢،٢٠٣

[٦٤] یادداشتەکانی شێخ قادری حەفید، دەستنووس، ل١.

[٦٥] یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ل١٨.

[٦٦] گۆڤاری کاروان، ژمارە٢٦، چاوپێکەوتن جزبوز لەگەڵ شێخ محمود.

[٦٧] رەسول هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٢

* لە موسڵ، ئاژاوەیەکی دەست کرد نرایەوە لە دووەم رۆژی جەژنی قوربانداا ،کە گوایە یەکێ لە پیاوەکانی شێخ سەعید کە ناوی (بەها ئەفەندی کوڕی عەبدوڵڵای حاجی ئیبراهیم ئەفەندی)ە توانجی گرتۆتە ئافرەتێك لە ناوبازاردا بەم شێوەیە ئاژاوەکە پەرەدەستێنێ‌و خەڵکی موسڵ هەڵدەکوتنە سەر ماڵی شێخ سەعید و ئەو کوشتارە روودەدات.(رەفیق حلمی : یاداشت ، ب١، ل٤٠-٤١)

دواتر شێخ مەحمود لەژێر فشاری عەشایەری کورددا کە هەڕەشەی ئەوە دەکەن گەر شێخ مەحمود ئازاد نەکرێت هێرش دەکەنەسەر موسڵ ڕێگا بەشێخ مەحمود دەدەرێت بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و لەگەڕانەوەیدا خەڵکێکی زۆر دەچن بەپیریەوە، ماتەمێکی گەورەی بۆ دەگێڕن[68] تەنانەت ڕەشید پاشا کە دوابەدوای ئەو ڕوداوەی موسڵ دەیکەن بەوالی (موسڵ)، لەکەرکوك خۆی دەگەیەنێتە شێخ مەحمود بە مەبەستی دڵدانەوەی، لەوێ لەگەڵ خۆیدا بەهێزێکی زۆرەوە دەیباتەوە بۆ سلێمانی.[69]

دوابەدوای ئەم کارەساتە شێخ مەحمود ناوبانگێکی زۆرتر پەیدا دەکا، هەرچەندە بەر لەو مەسەلەیەش کەسێکی ناسراو و لێهاتوو بووە، هەروەك خۆی باسی دەکات لەسالانی ١٩٠٥-١٩٠٦ دا لەگەڵ پیاوەکانیدا لەسەردەشت خۆی شاردۆتەوە، دواتریش دووبارە ماوەیەك لە گوندەکانی خۆیان لەدەوروبەری سلێمانی لەچاوی کاربەدەستان ون بووە.[70]

دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، شێخ مەحمود، پرسەیەکی گەورە بۆ کوژرانی باوك و براو خزم و کەسەکەی دادەنێت، کە بەشی هەرە زۆری خەڵکە ڕەشۆکیەکەو لایەنگرانی خانوادەی شێخ بەشداری ئەو پرسەیە دەکەن، بەڵام بازرگان و ئەفسەرو ناحەزانی بنەماڵەکەیان بەلای پرسەکەدا ناچن.[71] بەڵکو بەئەنقەست خەڵکیان هانداوە کە لەچایخانەکاندا دەنگی (گرامافۆن) هەڵبڕن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پیاوانی بنەماڵەی شێخان هەڵ کوتنە سەر ئەو شوێنانەو گرامافۆنەکان بشکێنن.[72]

کە دواتر وەك محمد ڕەسول هاوار لەزمانیەوە دەیگێڕێتەوە شێخ مەحمود خۆی باسی ئەو کردەوانەی ناحەزانیانی کردووە، ئەو ڕوداوەی موسڵ نەبووە هۆی ئەوەی کە شێخان دەسەڵاتیان کەم بێتەوە، بەڵکو بە

---

[68] چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، کە لە ٢٠٠٠/٢/١٧ کە لەبەغدا لەگەڵی ساز کراوە.

[69] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، ل٤٧.

[70] کەمال ڕەئوف محمد: مقابلە صحافیە فریدە مع الشیخ محمود ، گۆڤاری کاروان ژمارە ٢٦، ١٩٨٤،ل ١٢٠-١٢١.

[71] ڕەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل١٧٠.

[72] میجرسۆن: هەمان سەرچاوە، ج١، ل٢٧١.

پێچەوانەوە زۆری پێنەچوو خەڵکێکی زۆریان لەدەوروبەر کۆبۆوە[٧٣] رەفیق حیلمی سەبارەت بەدەسەلاتی شێخ مەحمود دەڵێت "نفوزی شێخ مەحمود رۆژ بەرۆژ بەرەو زیادیو ئەستێرەی بەختی سەر لەنوێ روو لەسەرکەوتنو بروزدا بوو، لەبەرئەمە حکومەت وردە وردە شکی لێ پەیدا ئەکردو ترسی ئەوەی لێ هەبوو کەبەهۆی عەشایەرەوە (کەینو بەین)ێك رێك بخاتو تۆڵەی کارەساتی موسڵ بسەنێتەوە"[٧٤].

بۆچوونەکانی حکومەت تا ئەندازەیەك راست بوو، هێندەی نەبرد لە سلێمانیدا ئاژاوەو پشێوی پەیدابوو، پاش ماوەیەك لەهاتنەوەی شێخ مەحمود، (عەبدوڵلا ئەفەندی) باوکی(بەهائەفەندی)کوژرا و لەم مەسەلەیەدا ، شێخ مەحمود تاوانبار کرا بەکوشتنی، ئیدی ناچار ماوەی ساڵێك خۆی شاردەوە، لەم ماوەیەدا دەسەلاتدارانی عوسمانیش مەسەلەکەیان پشت گوێ خست.[٧٥]

باسیل نیکتین، باس لەوە دەکات کە شێخ قادری حەفیدی کوڕی شێخ سەعیددوای کوژرانی باوکی ڕووی کردۆتە نیو خێڵی هەمەوەند بەمەبەستی بەرپاکردنی راپەرینێك لەدژی تورکەکان، بە قسەی نیکتین دەسەلاتدارانی تورك زۆر بەزەحمەت توانیویانە کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکەنەوە، ناچار بوون پلەو پایەی نەقیبیو ئەو موڵکانەی لەشێخ سەعیدیان سەندبوو هەمووی بدەنەوە بەشێخ مارفی برای.[٧٤] هەر لەهەمان ماوەدا محەمەد پاشای فەرماندەی هێزی عوسمانی بۆ چاوترساندنی شێخ مەحمودو لایەنگرانی، چەند گوندێکی سوتاندوەو تالانی کردوون، بەڵام نەیتوانیوە بەوەش جڵەوی بارودۆخی سلێمانی بگرێتەوە دەست.[٧٥]

---

[٧٣] شێخ مەحمودی قارەمان، ب١ ، ل١٦٩-١٧٠

[٧٤] سەرچاوەی پێشوو ،ب١،ل١٧٠

[٧٥] یاداشت، ب١، ل٤٨.

[٧٤] کوردو کوردستان، و/هێدی، هەولێر ١٩٩٨،ل٦٢١

[٧٥] د. صادقی شەرەفکەندی: کورتە مێژووی بزوتنەوە نەتەوایەتیەکانی کورد، سوید، ١٩٩٥، ل٥٦-٥٧؛ جلیلی جلیل واخرون، الحرکة الکردیة، ل٦٩.

دەولەتی عوسمانی لەو کاتانەدا تا دەهات لاواز ترو بی دەسەلات تر دەبوو، زیوەری شاعیر لەم بارەیەوە دەلیت:

"حکومەت بەناو هەبوو، زۆر لەمەئموران خۆیان دەهاویشتە باوەش شیخ مەحمود بۆ مەحفوز بوون لەبەلای ناگەهانی عەزل بوون، چونکە ئەو ئەیتوانی لای والی یا موتەسەریف ئەو مەئمورە ویقایە بکام"[76] ئەمە جگە لەوەی رووسەکانیش هەولیان ئەدا ئەو بارودۆخە بقۆزنەوەو پەیوەندی لەگەل کرودەکاندا ببەستن، لەو هەل و مەرجەشدا کەس لەشیخ مەحمود دیارو بەرچاوتر نەبوو، هەر بۆیە وەك شیخ لەتیف باسی لیوە دەکات جەنرال (باراتۆف) ناویك نامەی بۆ شیخ مەحمود ناردووەو داوای لیکردووە، شۆرش دژی دەولەتی عوسمانی بکات، بەلام شیخ مەحمود رازی نەبووە.[77]

بەر لەجەنگی جیهانی یەکەم شیخ مەحمود لەسلیمانی تەواو کەتبووە جموجۆل وپەیوەندی لەگەل بەدرخانیەکانیشدا پەیداکردبوو، لەسالی ١٩١٣ هەولی پەیوەندی کردنی دا لەگەل (کامیل بەگ و حۆسین بەگ) کورانی بەدرخان پاشا بەمەبەستی یاخی بوون لەدەولەتی عوسمانی،[78] هەرچەندە کوردستانی باشوور لەسالانی پیش جەنگی جیهانی یەکەمەوە تا کۆتایی جەنگیش هیچ کۆمەلەو ریکخراویکی سیاسی تیدا دروست نەبووە،[79] بەلام هەستی نەتەوایەتی لەنیو کوردەکانی باشووردا لەجۆش و خرۆش و گۆراندابوو.[80]

ئەم بارودۆخەش سەرجەم کوردستانی گرتبۆوە، هەر بۆیە د. کەمال مەزهەر دەلیت "گەر جەنگی جیهانی هەلنەگیرسایە کورستان دەبوو بە بەلقانیکی نویێ بۆ دەولەتی عوسمانی"[81]

---

[76] گەنجینەی مەردان، ل١٣٠-١٣١.

[77] یاداشتەکانی شیخ لەتیفی حەفید، ل٢١.

[78] د. کەمال مظهر احمد: کردستان في سنوات، ل١٠٧.

[79] د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەرەیەك لەمیژووی گەلی کورد، بغداد،١٩٨٥، ل١٤٦.

[80] د. کەمال مظهر احمد: کردستان في سنوات، ل١٠٧.

[81] سەرچاوەی پیشوو، ل١٢٧-١٢٨

میجرسۆنیش باس لەوە دەکات کە خەلکی سلیمانی لەو سالآنەدا بە ئاشکرا بیرو باوەری خۆیان دەردەبری و گالتەیان بەتورکەکان دەکرد، لە چایخانەکان دادەنشین لەبەر بی شەکری چایان نەدەخواردەوە جگەرەیان دەکیشاو باسی سیاسەتیان دەکرد.[٨٢] بەلام هیشتا کوردستانی باشور ئەو جمو جۆلەی پیوەدیار نەبوو کە لەکوردستانی تورکیاو ئیران دا هەستی پیدەکرا،[٨٣] ئیدی بەرە بەرە گۆرانکاری گەورەی بەسەردا دەهات. دواتر کوردستانی باشور بوو بە مەلبەندی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، چونکە شوینو پیگەی تورك لەم پارچەیەدا لاوازو دوورە دەست بوو.[٨٤] کاتیکیش دەولەتی عوسمانی بریاری دا بەشداری بکات لەجەنگی جیهانی یەکەمدا، وەك لەباسی بارودۆخی ئابووریو کۆمەلآیەتیدا ئامارەی پیدەکەین ،کوردستان بەگشتیو سلیمانی بەتایبەتی راپیچی نیو ئەو شەرە کرانو نەهامەتی زۆریان بەسەرهات، ئەوەبوو دەولەتی عوسمانی لەریکەوتی ٢٨/ی تەمموزی /١٩١٤ جاری (نەفیری عام)ی داو دژ بە هاوپەیمانان چووە جەنگەوە، لەمەشدا سیاسەتمەدارانو ئەفسەرانی ئەلمانیا رۆلی بەرچاویان بینی بۆ هاندانی دەولەتی عوسمانی.

ئیدی جەنگ لەنیوان دەولەتی عوسمانیو بەریتانیادا هەلگیرساو، لەریکەوتی ١٩١٤/١١/٦ هیزەکانی بەریتانیا لە فاو دابەزینو سوپای عوسمانی شکستی خواردو بەرەو دواوە کشایەوە،[٨٥] لیرەوە شەر لەنیوان هەردوو سوپای ئینگلیزیو عوسمانی گەرم بوو، لەو کاتانەدا کە دەولەتی عوسمانی سەرقالی شەربوو، لەنیو شاری سلیمانیدا هەر بەناو دەسەلاتی هەبوو، شیخ مەحمود دەسەلاتیکی زۆری پەیداکردبوو، عوسمانیەکانیش ئەو کاتە دەیانوویست بەهەر شیوەیەك بیت کاریکی وەها بکەن کە شیخ مەحمود بەشداری شەر بکات و سوپا کۆبکاتەوە، هەر بۆیە (خەلیل پاشا)ی والی لەو

٨٢ رحلة المتنكر، ج٢، ل٣١-٣٥

٨٣ د. کەمال مظهر احمد: کردستان في سنوات، ل١٠٤

٨٤ جلیلی جلیل واخرون: الحرکة الکردیة في عصر الحدیث، ل٩٣

٨٥ شکری محمود ندیم: حرب العراق، ١٩١٤-١٩١٨ ، ط٧، بغداد، ١٩٦٨، ل٢١

رۆژانەدا دێت بۆ سلێمانی و چاوی بەشێخ مەحمود دەکەوێت و پاش گفتوگۆیەکی چەند سەعاتی لەگەڵ شێخ مەحمودا، گەڕایەوە.[٨٦] لێرەدا پێدەچێت ئەم (خەلیل پاشا)یە بەمەبەستی پلان دانان هاتبێت بۆ لای شێخ مەحمود، تەنانەت شێخ مەحمود خۆشی دان بەو راستیەدا دەنێت کە بەشداری کردنی ئەو لەشەڕی (شوعەیبە) دا ئەرکێکی سەرشانی بووە وەك موسڵمانێك، شێخ مەحمود، دەکەوێتە خۆ ئامادەکردن و ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکانی سلێمانی و دەوروبەری لەگەڵ خۆیدا دەبات.[*] عوسمانیەکان لەم شەڕەشدا شکستیان خواردوو ژمارەیەکی زۆر کوژراو بریندارییان هەبوو، لەنێویاندا چەندین چەکداری کوردیش نەگەڕانەوە، بەڵام کە شێخ مەحمود زانی عوسمانیەکان توانای شەڕیان نیە بەخۆی و چەکدارەکانیەوە پاشەکشەی کردو گەڕایەوە بۆ سلێمانی.[٨٧] کە لەو سەردەمانەدا لەوپەڕی ناهەمواریدا بووە خەڵکی وێڕای برسێتی و هەژاری، بەردەوام لەچاوەڕوانی هەواڵێکدا بوون کە مانگی جارێك یا دوو جار (ئاژانسی حەربی) دەگەیشتە شارو دایك و باوکی لاوە بێ سەرو شوێنەکان دەچوون بەپیریەوە، بەڵکو هەواڵێکی منداڵەکانیانی تێدا بێت.[٨٨]

لەسایەی ئەو بارە نالەبارو دژوارەدا، هیچ جموجۆڵێك لەسلێمانیدا نەبوو، تەنانەت هیچ کۆمەڵ و گروپێکیش پێك نەهات، چونکە حکومەتی عوسمانی، رۆشنبیرو منەوەرەکانیشی ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ کردبوو، یا بارودۆخی ژیانیانی شێواندبوو، سەرەڕای ئەوەی رۆشنبیری ئەو سەردەمە

---

[٨٦] ئەحمەد خواجە: چەند بیرەوەریەکی مێژوویی، رۆشنبیری نوێ ژ١١١، ل٨٤.

[*] سەبارەت بەژمارەی کوردانی بەشدار بوو لەو شەڕەدا جیاوازی لەنێوان نوسەران و سیاسەتمەداراندا هەیە، بۆ نموونە مس بێل، ئەم کوردە چەکدارانە بە هەزار کەس دەخەمڵێنێت، لەکاتێکدا عبدالرزاق الحسێنی، مێژوونوس (١٥٠٠) کەس مەزەندەی کردوون، بەڵام ( شکری محمود ندیم)ی ئەفسەری عێراقی، پێی وایە (٢) هەزار چەکدار بوون، بەشداری شەڕی شوعەیبەیان کردووە، لەکاتێکدا د. کەمال مەزهەر ئەم ژمارەیە بەزیاتر دەخەمڵێنێت و ئەوەش بەپشت بەستن بە بەڵگەنامەیەکی جەنگی بەریتانیا.(د.کەمال مەزهەر : کورد و شەڕی شوعەیبە ، گۆڤاری رۆشنبیری‌نوێ، ژ١٢٥، ١٩٩٠،ل٣٦-٣٧).

[٨٧] د. کمال مظهر احمد: کردستان في سنوات، ل١٧٨-١٧٩

[٨٨] ئەحمەد خواجە: چەند بیرەوەریەکی مێژوو، رۆشنبیری نوێ، ژمارە١١١، ل٨٣-٨٤.

کەسێکی ئاسایی و خاوەن توانا و لێهاتوویەکی بەرچاوو نەبوو. رۆشنبیر لەسایەی دەوڵەتی عوسمانیدا، مرۆڤێکی چەوساوەبوو، لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵی خۆی تا رادەیەك نامۆبوو، هەر ئەوەندە لەکەلتورو فەرهەنگی ئەوروپا گەیشتبوو کە هۆکاری مێژوویی و ئابووری دواکەوتوویی وڵاتەکەی بزانێت، هەرگیز پشت ئەستوور نەبوو بەخۆی"[89] هەر بۆیە بەردەوام بوار لەبەردەم کەسایەتیەکی وەك شێخ سەعیدو شێخ مەحمودا فراوان بوو، هەلی دەرکەوتن هەر بۆ ئەوان دەرەخسا. بەر لەکۆتایی هاتنی جەنگیش، شێخ مەحمود هەر لەجموجۆڵدا بوو، دوای گەڕانەوەی لە (شوعەیبە)، جارێکی تر لەسەر داوای تورك، شێخ مەحمود بەخۆیی و هێزەکەیەوە بەرەو ناوچەی مەریوان و پێنجوێن ملی ناو رۆڵێکی بەرچاوی بینی لەبەر بەستکردن و شکاندنی هێزی رووس،[90] وەك ئەحمەد خواجە لەزاری شێخ مەحمودەوە دەگێڕێتەوە "شێخ مەحمود وتی بۆیە بەڵێنم دابوو بەخەلیل پاشای والی کەشان بەشانی تورك بوەستم بە ئومێدی ئەوەی کە شەڕ بڕایەوە تورکەکان (ئۆتۆنومی) ئەدەن بەکورد".[91] بەڵام بە پێچەوانە، پیاوانی شێخ مەحمودیان، بەتاڵانچی و دز تاوانبار کردو ژمارەیەکیان لێ گوللە باران کردن، هەر ئەمەش وای کرد کە شێخ مەحمود زۆر لەجاران زیاتر لێیان بەداخ بێت ئیدی شێخ گەڕایەوە بۆ سلێمانی، لێرەوە لاپەڕەیەکی نوێ لەهەوڵەکانی شێخ مەحمود بۆ پەیوەندی کردن بە ئینگلیزو هاتنی ئەوان بۆ شاری سلێمانی دەست پێدەکات.

---

[89] د. سادقی شەرەفکەندی: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣-٦٤.

[90] عەلائەدین سجادی: سەرچاوەی پێشوو: ل٨٠: ئەحمەد خواجە: چیم دی، بغداد، ١٩٦٨،ل١٠

[91] چیم دی،ب١، بغداد ١٩٦٨، ل١٤.

## باسی چوارەم:
## بارودۆخی کۆمەڵایەتیو ئابووری

شاری سلێمانی لەسەرەتای دروست بوونیەوە، خەڵکانێکی زۆر روویان تێکردووەو تێیدا نیشتەجێبوون، وێڕای دانیشتوانی قەڵاچوالانو گوندەکانی دەوروبەری، خەڵکێکی زۆر لەکوردستانی رۆژهەڵاتەوە روویان تێکردووە، بەتایبەتی لەشاری هەمەدان وسنەوە، ژمارەیەك کورد بەرەو سلێمانی هاتوونو گەڕەکێکیان بەنێوی (دەرگەزێن) لەسلێمانیدا ئاوەدان کردۆتەوە.[٩٢]

کوردستان بەگشتی و شاری سلێمانی بەتایبەتی، لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا هیچ ئامارو سەرژمێرێکی دانیشتوانی تێدا ئەنجام نەدراوە، تا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم لەساڵی ١٨٣١ ز دا یەکەم سەرژمێری بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام ئەم سەرژمێرەش تەنها هەنگاوێکی سەرپێی بووەو جۆرێك بووە لەکاری خەملاندنو مەزەندەکاری، بەمەبەستی باج سەندنو سەربازگرتن ئەنجام دراوە.[٩٣]

وێڕای ئەم پشت گوێ خستنە، گەریدەو بێگانەکانو پیاوانی سەر بەدامو دەزگاکانی بەریتانیا لەم وڵاتەدا، باسیان لە ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی، کردووە، پێدەچێت ریچ لەم بوارە دەست پێشخەر بووبێت، نێوبراو دەڵێت " بەپێی باشترین زانیاری کە چنگم کەوتووە، (٢٠٠٠) دوو هەزار خانووی موسڵمانو (١٣٠) خانووی جولەکەو (٩) نۆ خانووی دیانی کلدانیو (٥) پێنج خانووی ئەرمەنیشی تێدایە[٩٤].

(مێجرسۆن)یش ساڵی ١٩١٩ لەراپۆرتی ساڵانەدا باس لەژمارەی دانیشتوانی سلێمانی دەکاتو لەساڵی ١٨٣٠ دا بە (١٠) هەزار کەس دەیخەملێنێت، بەڵام لەهەمان راپۆرتدا ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی لە ساڵی

---

[٩٢] ئەدمۆندز: هەمان سەرچاوە، ل٧٨.

[٩٣] عەبدوڵلا غەفور: جوگرافیای کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٤٧-١٤٨.

[٩٤] گەشتی ریچ١٨٢٠ ، ل١٣٨.

١٩١٤ دا بە (٢٠) هەزار کەس مەزەندە دەکات،[٩٥] ئەم ژمارەیە تا ئەندازەیەك لەڕاستیەوە نزیکە، چونکە سالّنامەی دەوڵەتی عوسمانی سالّی ١٩١١-١٩١٢، دانیشتوانی سلێمانی بە (١٥) هەزار دادەنێت، بەلاّم وادیارە ئەم سەرژمێرە، رەگەزی مێینەی لەخۆنەگرتبێت، لەم ژمارەیەشدا هەزاریان جولەکەن و (١٧٠) کلدانیشی تێدابووە، ئاماژە بەوەش دەکات کە زۆرینەی خەڵکی سلێمانی موسڵمانن و پەیڕەوی مەزهەبی شافیعی دەکەن.[٩٦]

ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنج و تێڕامانە، ئەو جیاوازیەیە کە لەنێوان ژمارەی، جولەکەکان و گاورەکاندا هەیە، کە ژمارەی جولەکە شەش هێندەی گاورەکان دەبێت،[٩٧] ئەمەش زیاتر بۆ شوێنی ستراتیژی سلێمانی دەگەڕێتەوە لەڕووی بازرگانیەوە، کە جولەکە بەردەوام بەدوای شوێنی وەهادا دەگەڕێن،[٩٨] وێڕای مامەڵەی باش و دۆستانەی کورد لەگەڵ خەڵکانی ناموسڵماندا، کە لەسلێمانیدا کاك ئەحمەدی شێخ خۆی یەکێك بووە لەوانەی تا دوا ئەندازە رێزی لەو خەڵکانە گرتووە،[٩٩] هەرچەندە سۆن هەوڵیداوە وانیشان بدات کە خەڵکی سلێمانی زۆریان لە جولەکەو دیانەکان کردووە کە بەرگی کوردی بپۆشن، بەلاّم ئەم بۆچوونە لەڕاستیەوە دوورە.[١٠٠]

سلێمانی تاهەلاّیسانی جەنگی جیهانی یەکەم رێژەی دانیشتوانی بەرز بوو، دەگەیشتە (٢٠) هەزار کەسن بەلاّم لەئەنجامی قات و قڕی و برسێتی و مەرگی بەردەوامی خەڵکی، ژمارەی دانیشتوانی یەکجار کەمی کردوو تەنها یەك لەسەر سێ ی خەڵکەکەی مایەوە، کە وەك ئەدمۆندز لەسالّی ١٩١٨-١٩١٩دا باسی لێکردوە، (١٠) هەزار کەس بوون، بێگومان ئەم ژمارەیەش

---

[٩٥] رەسول هاوار:شێخ مەحمودی قارەمان،ب١،ل١٠٦.

٩٦ د. عبد الفتاح علی یحیي : السالنامات موصل العثمانیة مصدرا لتاریخ السلیمانیة، گۆڤاری زانکۆی دهۆك، ژ٢، سالی ٢٠٠٠، ل٥٠-٥١ .

[٩٧] المقدم منذر الموصلي: عرب والاكراد، ط١، بیروت، ١٩٨٦، ل١٨١.

[٩٨] سەرچاوەی پێشوو، ل١٨١.

[٩٩] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان. ب١، ل١٢٦ .

[١٠٠] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

دوای ئاسایی بوونەوەی بارودۆخی ژیان بووە، هەروەها ڕێژەی جولەکەی بە (٧٥٠) کەس و دیانەکانیشی بە (١٢٠) کەس داناوە.[١٠١]

سلێمانی لەو ساڵانەدا بەسەر حەوت گەڕەکدا دابەش دەبوو کە بریتیبوون لە (گۆیژە، مەڵکەندی، کانی ئاسکان، دەرگەزێن، سەرشەقام، چوارباغ و جولەکان )[١٠٢]

وەك ئامارەمان پێکرد جولەکەکانی سلێمانی گەڕەکێکی تایبەت بەخۆیان هەبووەو، لەوێدا خەریکی کارو پیشەی خۆیان بوونن وزیاتر بە بازرگانی و وردە واڵەفرۆش و دەباغی و چەرم ڕەنگ کردنەوە خەریك بوون، هەروەها ئارەقیشیان دروست کردووە.[١٠٣]

ئەدمۆندز ئەم پیشانە بەچاوێکی نزم تەماشا دەکاو بەپیشەی سوك و نزم لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە تێیان دەڕوانی.[١٠٤]

زۆربەی نوسەرانی بێگانە لەسەر ئەوە کۆك بوون، کەخەڵکی سلێمانی لەڕووی دەرونیەوە ئامادەباشیان تێدایە بۆ وەرگرتنی هەموو شتێکی نوێ و تازە بابەت،[١٠٥] لەڕووی گەشەسەندن و پێشکەوتنەوە هەنگاوی خێرا هەڵدەنێت، (منذر الموصلي) ئەم شارە بە پایتەختی زانستی و کەلتوری کورد ناو دەبات.[١٠٦]

(مینۆرسکی)ش دەڵێت : " کوردەکانی ناوچەی سلێمانی بەگشتی شەخسیەتی ئاریایی خۆیان پاراستووە چونکە دوور لەگەلانی تر ژیاون و بەوە دەناسرێنەوە کە ناسك و دڵپاکن"[١٠٧] (ئیبراهیم حیلمی)ش کە خۆی خەڵکی سلێمانیە، لەبارەی خووڕەوشتی خەڵکی سلێمانیەوە دەڵێت: " خوو ڕەوشتی دانیشتوانەکەی بەچاکەو بەناسکی و دۆست و خۆش مەشرەبی

---

[١٠١] کرد وترك وعرب ، ل٧٨.

[١٠٢] ڕەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان. ب١، ل١٠٦.

[١٠٣] ا.م. منتشاشفیلی: کورد، وەرگێڕانی، عیزەدین مستەفا ڕەسول، سلێمانی، ١٩٩٩،ل٥٢.

[١٠٤] کرد وترك وعەرەب ، ل٧٩.

[١٠٥] د. کەمال مەزهەر: کوردەکانی سلێمانی، گۆڤاری پەیڤین، ژ٩، ل٢٠٩.

[١٠٦] عرب والاکراد ، ل١٨١.

[١٠٧] کورد، وەرگێڕانی، حمە سعید حمە کریم، هەولێر، ١٩٨٤، ل٧٦.

بەناوبانگن، مرۆڤ حەز بەدواندن و شەوچەرەیان دەکات، زۆربەشیان لەکوردی جۆربەجۆر تێکەڵاون، عەرەب لەوێدا زۆر کەمن، ئەوانەش بۆ بازرگانی کردن و ئازوقە چوونەتە ئەوێ" [١٠٨]

وێڕای ئەوەی لەنێوی شاری سلێمانیدا، کۆمەڵێك خوو نەریتی کۆمەڵایەتی باوو هەیە، کە بەزاندن و شکاندنی، ناو زڕاندن و بەسوك سەیرکردنی بەدواوە بووە، هەر بۆیە سۆن دەڵێت " ژنی بەدڕەوشت لەسلێمانیدا دەگمەن بووە "[١٠٩] هەر بۆیە عەباو پەچە لەنێو ژنانی شاردا باوی نەبووەو کەس نەیپۆشیوە، بەلام لەسەردەمی (سوڵتان ڕەشاد)ەوە ئەم باوە لەسلێمانی داکەوت، کە یەکەم کەس (توفیق بەگی تابور ئاغاسی) ناسراو بە (توفۆق بەگی دارەکە بێنە) ئەم نەریتەی بەسەر ژناندا سەپاندو ئەوەی نەیپۆشیایە سزا دەدرا[١١٠] کە پێشتر هەرگیز نەبوو بەلام لەسالی ١٩٠٩ بەدواوە داکەوت.

لەسەردەمی دەسەلاتی عوسمانیدا عارەق خواردنەوە، بەئاشکرانەبوو، ماڵە جولەکەو دیانەکان بەدزیەوە فرۆشتویانە، تاسالی ١٩٢٥، یەکەم مەیخانە لەشاری سلێمانیدا لای سەرا کرایەوە[١١١] لەکاتێکدا پێکهاتەو قاوغی کۆمەڵایەتی دانیشتوان بەردەوام سیماو روخساری دەرەکی پێکهاتە ئابووریەکەیان پیشان دەدات هەر بۆیە تێگەیشتنی تەواو لەبارودۆخی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بەچالاکیە ئابووریەکانی دانیشتوان دەبەستێت.[١١٢] سەبارەت بەباری ئابووری شاری سلێمانی، ئەوا کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لەسەردەمانێکی زۆر کۆنەوە سەرچاوەی بژێوی ژیانی خەڵك بوون و بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووری شارەکەش بوون ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی شارەکە هاوشانی کشتوکاڵ سەرقالی بەخێوکردنی مەڕو مالاتیش بوونو

---

[١٠٨] لیوای سلێمانی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ١١٦،ل٦٣.

[١٠٩] رحله المتنكر، ب١، ل٢٥٣.

[١١٠] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل٥٢.

[١١١] ئەکرەمی سالحی رەشە:شاری سلێمانی،ب١، ل٥٠٠

[١١٢] هاشم جواد: مقدمة في كيان العراق الاجتماعي، بغداد،١٩٦٤،ل٢٧.

بەتایبەتی گەڕەكەكانی قەراغی شار گاجوتیان هەبووە.[113] تەنانەت د. كەمال مەزهەر ڕێژەی ئەو خەڵكانە بەچوار لەسەر پێنجی دانیشتوان دادەنێت كە بژێوی ژیانیان لەسەر كشتوكاڵو ئاژەڵدارییە،[114] بەلام وێڕای ئەوەش كشتوكاڵ هێندە گەشەی نەكردووە، كە لە پێداویستی ناوخۆ زیاتر بێتو بچێتە بواری بازرگانییەوە، كە زیاتر ئەمەش بۆ بارودۆخی نائارامو پشێوی ناوچەكە دەگەڕایەوە[115]

وێڕای ئەوەی هۆزەكانی دەوروبەری سلێمانی بەردەوام هەلیان دەكوتایە سەریو تالانیان دەكرد، بەتایبەتی هۆزی (هەمەوەند)،[116] لەراستیشدا خاوەن زەوییەكانی سلێمانی بەوە ناسراون كە هێندە گوێ بەزەوییەكانیان نادەنو زیاتر بەكرێی دەیدەن بەجوتیارەكان.[117]

سۆن، لەساڵی ١٩٠٨-١٩٠٩ دا باس لەوە دەكات كە دەوورو بەری شار، ڕەزوو باخی لێ نەماوە، پێشی وایە هۆی ئەم بارودۆخە نالەبارە بۆ ئەو باجە زۆرە دەگەڕێتەوە كە حكومەتو شێخەكان دەیخەنە سەر بەروبومی كشتوكاڵ كە وەرزێرەكانی ناچار دەكرد هیچ بەروبومێك دانەچێنێن. تەنانەت چەند جارێك جوتیارەكان وەك نارەزایی دەربڕین دەكەوتنە سوتاندنی ڕەزو باخەكانیانو شاریان جێ دەهێشتو بەماڵو مناڵەوە بەرەو ئێران دەچوون لەوێ توتنەوانیان دەكرد[118]

ئەو سەردەمە جگە لەباجو سەرانەی دەوڵەت، سەربازو موچەخۆرو فەرمانبەرانیشن كەموچەكەیان بەچەند مانگ دوا دەكەوت، مەفرەزەی سەربازی بۆ دابینكردنی موچە دەچوون بۆ كۆكردنەوەی بەروبومی

---

[113] ا. هەوری: شاری سلێمانی، بەیان، ژ٢٨، ١٩٧٥، ل٢٦،٢٧،٢٨.

[114] كوردی سلێمانی، ل٢٠٧.

[115] شاكر خصباك: الاكراد، ل٧٠.

[116] عباس العزاوی: عشائر العراق -٢- الكردیه، بغداد، ١٩٤٧، ل٤٨.

[117] شاكر حصباك: لیوای سلێمانی، و/عەتا قەرەداغی، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١١

[118] رحله متنكر، ج٢،ل٤١؛ ڕەمزی قەزاز: بزوتنەوەی سیاسیو ڕۆشنبیری كورد، سلێمانی ١٩٧١، ل٩١.

کشتوکاڵی، جارو بار لەبری پارە مەڕو بزنیان دەدا بەفەرمانبەران[119] وێڕای ئەمانەش کشتوکال کردن لەم نێوچەیەدا هەر لەسەر شێوازە کۆنەکەی خۆی مابوو، هیچ پێشکەوتنێکی بەخۆوە نەبینی بوو، بەروبومی سەرەکیش لەم نێوچەیەدا گەنمو جۆو برنج بوون.[120] جگە لەم سێ بەرهەمەش دواتر توتنیش وەك بەروبومێکی سەرەکی تەشەنەی سەندوو بڕێکی زۆری دەچووە بواری بازرگانیەوە.[121]

لیوای سلێمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم بەدواوە ماوەیەکی باش جۆرێکی لەئارامی بەخۆوە بینی، لەسایەی دەسەڵاتی عوسمانیدا، ئەم ڕەوشە تا سالانی پێش جەنگ لە هەڵکشان و داکشاندا بوو، بەڵام تا ئەندازەیەك هێمنی بۆ ناوچەکە گێڕایەوە، کە کاردانەوەی باشی لێکەوتەوە[122] سەبارەت بە چالاکی بازرگانیش، دەشێت بڵێین لەسەدەی نۆزدەهەمدا چالاکی بازرگانی لەهەرسێ ویلایەتەکەدا، تا ئەندازەیەکی بەرچاو سست بوو، بەتایبەتی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەوەش کە هەبوو لەم سێ ویلایەتەدا، زیاتر (ترانزێت) بوو، واتە تەنها ڕۆڵی وێستگەیەکی بازرگانی بەم ویلایەتانە بڕابوو، خۆیان هیچ بەشداریەکی بەرچاویان نەبوو، تەنانەت لەو ساڵانەدا بازرگانی هێندە کەمو سنوردار بوو، تێکڕای قەوارەی ساڵانەی لە (١٠٠) هەزار دینار تێپەڕی نەدەکرد، کە زۆربەشی سەرچاوەکەی بێگانە بوو نەك خۆماڵی. بەڵام لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا، بازرگانی ئەم سێ ویلایەتە فراوانبونێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی، بەتایبەت لەئەنجامی بەستنەوەی هەرسێ ویلایەتەکەو چەسپاندنی سیستمی ویلایاتی عوسمانی لەساڵی ١٨٧٠دا، وێڕای ریفۆڕمە ئابووری و کارگێڕیەکانی مدحت پاشا[123] هەر بۆیە شاری سلێمانیش، لەسالانی پێش جەنگدا چالاکی بازرگانی تەواو

[119] بیرەوەریەکانی عەبدولعەزیز یامولکی:ئامادەو پەراوێز بۆ کردن، صدیق صالح، گۆڤاری هەزار مێرد، ژ-٩-٢٠٠٠ ، ل٧٢-٧٣.

[120] ئیبراهیم حیلمی: هەمان سەرچاوە، ل٦٥.

[121] د. کەمال مەزهەر: کوردی سلێمانی، ل٢٠٨.

[122] شاکر خصباك: الاکراد، ل٦٨.

[123] د. ومیض جمال عمرواخرون: هەمان سەرچاوە. ل١٤،٨.

پێشکەوتبوو، بەڵام ژمارەیەکی کەمی خەڵکی سلێمانی ئەو کاتە خەریکی بازرگانی بوون محەمەد روسول هاوار لەم بارەیەوە دەڵێت " بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی لەکوردستانی خواروودا چەند خێزان و بنەماڵەیەکی کەم هەبوون کە پارەدارو ناسراو بن، تەنانەت هەر پارەدارو بازرگانی کورد کەم بوون یا پەیوەندیان بە پارەدارو بازرگانی دەرەوە نەبوو"[١٢٤] د. کاوس قەفتانیش لەم بارەیەوە دەڵێت "لەهەموو کورستاندا دەوڵەمەندێك نەبوو شان لەشانی دەوڵەمەندێکی ئەرمەنی بدات، هەموو ئەوانەی دەستیان بەسەر بازاڕدا گرتبوو ئەرمەن یا تورك بوون یەك دانە کوردیان تیا نەبوو"[١٢٥]

جگە لەوەش لەسلێمانیدا بەتایبەتی سالانی پێش جەنگ پارە بۆخۆی کەم بووەو نارەحەت دەست کەوتووە[١٢٦] ،لەنێو بازاڕی شاریشدا تاکۆتایی دەسەلاتی عوسمانی لەکوردستاندا پارەی تورکی بەکار دەهات، قرۆشی مەعدەن، مەجیدی زیو، لیرەی زێڕ هەبووە، دواتر لە کوردستانی ئێرانەوە پارەی ئێرانیش هاتۆتە ئەم دیو[١٢٧]

سەبارەت بەدەوڵەمەندو بازرگانی سلێمانی، سۆن باس لەوە دەکات کە زۆربەیان، کلدانی موسڵ و ئێرانی و جولەکەکانی سلێمانی، تەنانەت گوزەری زەڕنگەرەکان هەموویان جولەکەبوون، کلدانیەکانی موسڵیش بەشێوەیەکی سەرنج راکێش لەبواری بازرگانیدا لە سلێمانیدا هەڵدەسوڕان بەتایبەتی بازرگانی قوماش و کەل و پەلی ئەوروپیان کردووە، ئەم بەرهەمانەیان یا لەسلێمانی ساغ دەکردەوە یا ئەوەتا رەوانەی بازاڕەکانی هەمەدانیان دەکرد، سۆن لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت (پێیان راگەیاندم کە لەساڵی ١٨٨٠دا پەنجا کلدانی موسڵ و بیست بازرگانی هەمەدانی بەردەوام لە سلێمانیدا نیشتەجێ ببوون و خانێکی تایبەتیان هەبوو بە (خانی عەجەم) ناسرابوو ،

---

[١٢٤] شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل٤١،٤٢.

[١٢٥] وتاری مێژوویین سلێمانی، ٢٠٠١، ل٣٢.

[١٢٦] ئەکرەمی سالحی رەشە: هەمان سەرچاوە، پ٢، ل٣٤٦.

[١٢٧] منتشاشفیلی: کورد، ل٢٥.

بەڵام هەرخۆی باس لەوە دەكات كە دواتر ئەم بازرگانیە رووی لەكزی كردووە.[١٢٨]

سلێمانی بەشێوەیەكی گشتی لەناخی گوڕوتینی بازرگانیدا بەردەوام هاموشۆی لەگەڵ (ئێرانو ئەوروپاو توركیاو موسڵو بەغداو چەندین شاری دیكەی كوردستانی ئێران ناردووە وەك سەقز و بانە، هەناردەی سلێمانی ئەوكاتە زیاتر بەروبومی كشتوكاڵیو ئاژەڵداری بووە، وێڕای ناردنی مازوو كە تیرە بەڵام توتن لەهەموو بەروبومەكانی دیكە زیاتر نێردراوەتە دەرەوە، لەبەرامبەریشدا، پێداویستیە سەرەكیەكانی ژیانیان هێناوە بۆ سلێمانی وەك شەكرو چاو قوماشو پیڵاوو گەلێ كاڵای تر، ئەمەش ئەو راستیە دەردەخات كە سلێمانی لە ڕووی پیشەسازیەوە لاواز بووە.[١٢٩]

هەر لەساڵانی ١٨٩٢-١٨٩٣، (٤٠٠) دوكان لەنێو بازاڕی سلێمانیدا هەبووە، وێڕای ٨ خانو نۆ گەرماوو، كە ئەم ژمارەیە لەساڵانی ١٩١١-١٩١٢، گەشە دەكات و ژمارەی دوكانەكان دەگەنە (١١٥٥)و ژمارەی خانەكان دەگاتە ١٣ خان، جگە لە ١٠ شوێنی پێستە خۆشكردنو ٨ گەرماوو ١٧ چایخانە.[١٣٠]

سلێمانی، تا ئەندازەیەكی بەرچاوو لەڕووی بازرگانیەوە پێشكەوتوو بوو، بەڵام لەڕووی ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوخۆدا زیاتر پشتی بە لادێكانی كوردستانی دەبەست.[١٣١]

زۆرجار هەمەوەندەكان رێگای (سلێمانی – كەركوك) یان دەبڕیو كاروانە بازرگانیەكانیان تاڵان دەكرد، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی گرنگیەكی زۆری بە بنەماڵەی شێخان دا تاوەكو بەهاوكاری ئەوان بتوانی بەسەر هەمەوەندەكاندا زاڵ بێت، كە زۆرجار بنەماڵەی شێخ سەعید خۆیان باجێكی زۆریان دەخستە سەر بازرگانیو هێندەی دیكە بازاڕەكەیان لاواز دەكرد.[١٣٢]

---

[١٢٨] رحلە متنكر، ب١، ل٢٤١.

[١٢٩] منتشاشفیلی: كورد، ل٥٠: شاكر خصباك: الاكراد: ل٢٢٣-٢٢٤.

[١٣٠] عبد الفتاح یحی، السالنامات، ل٥٦.

[١٣١] د. كەمال مەزهەر: كوردی سلێمانی، ل٢٠٨.

[١٣٢] لونگریك: تاریخ العراق الحدیث ١٩٠٠-١٩٥٠، ل١٠٣

سەبارەت بەجموجوڵی پیشەسازیش لەشاری سلێمانیدا ئەوا بێگومان، پیشەسازی ناوخۆیی لەسلێمانیدا کزو لاواز بووە، کە ئەم رەوشەش بەهەمان شێوەی بارودۆخی بازرگانی، مەسەلەیەکی تایبەت نەبووە بە سلێمانی، بەڵکو گشتی بووەو هەرسێ ویلایەتەکە هەمان گرفتیان هەبووە، تەنانەت لەساڵی ١٩١٠دا ئابورریناسێکی ئیتاڵی روو دەکاتە ناوچەکەو پیشەسازی ئەم هەرێمە بە پیشەسازیەکی سەرەتایی و داروخاو لەقەڵەم دەدات، لەکاتێکدا پیشەسازی لەسایەی حوکمی مدحت پاشا کەمێك پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینی بوو ئینجا لەو حاڵەشدا بووە،[١٣٣] هەر بۆیە دەتوانین بڵێین لەسایەی ئەو دەسەڵاتە کۆنە خوازو دواکەوتووەدا سلێمانی لەچاو پێشکەوتن و ژمارەی دانیشتوانیەوە هێشتا پیشەسازیە نێو خۆییەکەی دڵخۆشکەر بووە. پیشەوەرانی سلێمانی زیاتر لە بوارەکانی جۆلایی و پێستە خۆشکردن و زەرەنگەری و موتابچێتی و سەراجی و کەوش دورین،[١٣٤] وێرای ئەو بارودۆخەش سلێمانی هەر لەگەڵ بونیادنانیدا ناوبانێگێکی باشی لە پیشەسازی سابون دروست کردندا هەبووەو ئەهلی ئەو پیشەیە گەرەکێکی تایبەت بەخۆیان هەبووە کە تا ئەمرۆش بە (سابونکەران) بەنێوبانگە بەرهەمی سابون لەم شارەدا ماوەیەك بەر لەهەڵایسانی جەنگ گەیشتە (٥٠٠) تەن لە ساڵێکدا،[١٣٥] بەڵام پێدەچێت ئەم ژمارەیە زیادە رۆیی تێدابێت.

جگە لەم پیشەیە، بەشی زۆری سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە سلێمانی لەبواری دروست کردنی تفەنگدا نێوبانگێکی زۆری هەبووە، ئەم پیشەیە بە (چەخماخسازی) نێو براوە، ئەحمەد خواجە لەم بارەیەوە دەڵێت "ئەم پیشەیە بەبێ ئەوەی هیچ پێویستیەك لەهەندەرانەوە بهێنێت تفەنگی حسکەو دەمانچەی شەش ئاگرەیان دروست دەکردو بە

---

[١٣٣] د. وميض جمال عمر نظمي واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨-١٤.

[١٣٤] ئیبراهیم حیلمی: هەمان سەرچاوە، ل٦٤.

[١٣٥] د. کەمال مەزهەر: کوردی سلێمانی، ل٢٠٨-٢٠٩.

(وەرنـدەڵو قپـاقلی) نـاو دەبـران".[١٣٦] هــەر لەسلێمانیشــەوە بـۆ هــەموو نێوچەکانی کوردستان دەنێردرا.[١٣٧]

مارك سایکس ساڵی ١٩٠٥ هاتۆتە سلێمانیو باس لـەوە دەکات کـە (١٥٠) کەسـی لەسـلێمانیدا لـەم پیشـەیەدا زۆر شـارەزانو تفـەنگی جـۆری (مارتینو بیبۆدی) دروسـت دەکـەن، بـەڵام لەگـەڵ هـاتنی ئینگلـیزو روخـانی یەکەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمودا ئەم پیشـەیە لەلایـەن ئینگلیزەکانـەوە قەدەغەکرا.[١٣٨]

جموجۆڵی پیشەسازی لەکۆتایی ساڵانی حومکڕانی عوسمانیدا کەمێك پێشکەوتی بەخۆوە بینـی، ئەمـەش بەشێوەیەکی گشتی بۆ ئـەو چەند فێرگـە پیشەسـازیە دەگەڕێتـەوە کـە لەسـەر دەسـتی مدحـت پاشـا لـەنێوان سـاڵانی ١٨٦٩-١٨٧٢ دا کرانـەوە، بـەڵام پیشەسـازی نێوخۆیـیو پیشـەی دەسـتی لەسلێمانیدا وەك شوێنەکانی دیکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمـەوە لـەئاکامی پـەیدابوونو فرەبوونـی کـاڵای باشـترو هـەرزانتری ئەوروپا توشی قەیرانێکی راستەقینە هات.[١٣٩]

دەشێت بڵێین تا ساتە وەختی بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی تا ئەندازەیەك بارودۆخی ئابووری لەشاری سلێمانیدا بەتایبەتیو لەکوردستاندا بەگشـتی، بـاش بـووە هەرچـەندە وەك پێویسـتیش نـەبووە، بــەڵام لەگــەڵ هەڵایسانی جەنگدا، سەرجەم بوارەکانی چالاکی ئابوری توشـی ئیفلیجـی بـوو، بەتایبەت کاتێك دەوڵەتی عوسمانی لەسەر دەستی، سەرانی ئیتحیادو تەرەقی بڕیـاریدا جـاڕی شـەڕبدا دژ بەبـەرەی هاوپەیمانـەکانو بچێتـە سـەنگەری ئەڵمانیاو وڵاتی بەرەی ناوەند.[١٤٠]

---

[١٣٦] گۆشتی بۆتۆ ئێسقانی بۆمن، دەفتەری کوردەواری، ل٤٧.

[١٣٧] لونگریك: العراق الحدیث ١٩٠٠-١٩٥٠، ل٥٦.

[١٣٨] ادموندز، هەمان سەرچاوە، ل٧٦.

[١٣٩] د. کەمال مەزهەر: کوردی سلێمانی..، ل٢٠٨.

[١٤٠] جلیلی جلیلو واخرون، الحرکة الکردیة في عصر الحدیث، ل٨٧.

کوردستانیش لەم شەڕەوەگلا بێ ئەوەی هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا هەبێت، چونکە خاوەنی قەوارەیەکی سەربەخۆ نەبوو تاوەکو بەرگری لێ بکا، بەڵام سەرباری ئەوەش هێندەی زانی ڕووداوەکانی جەنگ کوردستانیشی پەلکێش کردو ناچاری کرد کە لەچەند بەرەیەکی جیاوازدا شان بەشانی تورك بجەنگن دژ بەوڵاتانی هاوپەیمان[١٤١].

کوردستانی باشور کە دورترین شوێن بوو لەشەڕەوە لەئاکامی ئەو شەڕەدا تووشی نەهامەتی‌و ئاستەنگی زۆرهات،[١٤٢] هەر لەیەکەم ڕۆژەکانی شەڕەوە، دەوڵەتی عوسمانی دەستی کرد بەپیادەکردنی دزێوترین سیاسەت لەنێوچە کوردیەکاندا، تەنانەت ڕەفتارو هەڵس‌و کەوتی جەندرمەو (زەفتی)کانی عوسمانی لەشارەکانی کوردستاندا زیاتر لەکارو کردەوەی دەوڵەتێك دەچوو کە لەخاکی دوژمندا ئەنجامی دەدات[١٤٣]، ئەو ڕۆژگارە دەوڵەتی عوسمانی هەرچی لەدەست هات درێغی نەکرد لەئەنجام دانی، لەیەکەم هەنگاویدا بانگەوازی (جیهاد)ی کردو داوای لەهەموو خەڵکی نێوچوارچێوەی دەوڵەتەکەی کرد کە بەشداری غەزا بکەن دژ بەکافرەکان، بەڵام لەنێو گەلانی ناتورکی نێو دەوڵەتی عوسمانیدا دەنگدانەوەیەکی وەهای نەبوو،[١٤٤] هەربۆیە دەوڵەت دەستی کرد بەپیادەکردنی سەربازگرتن‌و ڕەشبگیری، کە سالآنی بەر لەدەست پێکردنی شەڕ دائیرەی تەجنید، بۆ کارترین‌و پەك کەوتەترین دەزگا بوو لەنێوچە کوردیەکاندا، کە جار هەبووە بەساڵیش نەیتوانیووە تەنها یەك کەسیش ناونوس بکات بۆ سەربازی[١٤٥]، بەڵام لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕدا بەهەموو تواناى خۆی سەرقاڵی ڕاپێچ

---

[١٤١] حامد محمود عيسى: المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، منذ بدايتها حتى سنه ١٩٩١، قاهره، ١٩٩٢،ل٢٧.

[١٤٢] د. كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، بغداد، ١٩٨٤، ل٢٢٦.

[١٤٣] جليلى جليل واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٠.

[١٤٤] مس بيل: فصول من تاريخ العراق القريب، ترجمة جعفر الخياط، بيروت، ١٩٤٩،ل٥٨-٥٩.

[١٤٥] صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية او امارة العمادية،ط٢، اربيل ١٩٩٠،ل٧٥.

کردنی هەموو ئەو کەسانە بوو کە تواناى چەك هەڵگرتنیان هەیەو دەیبردن بۆ بەرەکانی جەنگ[١٤٦] .

تەنانەت لەشارێکی وەك سلێمانیدا تەنها پیرەمێردو پیرەژن مابوونەوە لەشاردا[١٤٧] هەر بۆیە خەڵك دەستیان کرد بەخۆ دزینەوە لەسەربازی و لەسلێمانیدا زۆر کەس خۆی دەدایە پاڵ بنەماڵەی شێخان تاوەکو سەربازی نەکات،[١٤٨] بەمە جگە لەوەی رۆژانە چەندین لاو لەنێو شاردا گوللەباران دەکران بەتۆمەتی خۆ دزینەوە[١٤٩] .

هێندەی نەبرد وشەی (سەفەر بەرلك) کەوتە سەر زاری خەڵکی و د. کەمال مەزهەر وەسفی دەکات و دەڵێت " ئەم وشەیە ئەو رۆژانە گوزارشتی لەچارە رەشی و سەفەری بێ گەڕانەوە دەکرد[١٥٠] ، مەلا حەمدون کە نابینا بووەو هیچیشی نەبینیووە، بەڵام بگرەو بەردەو کارەساتی شەڕ وا کاری لێ کردبوو، وەك بلیمەتێکی چاو ساغ باسی شتی وا وردی شەڕ ئەکات، کە سەر لەئاستیدا سوڕ دەمێنێ[١٥١] .

نەهامەتی شەڕ سەبارەت بەسلێمانی لەوەدا بوو، کە لەئەنجامی رەفتارەکانی دەوڵەتی عوسمانیەوەدا، ئەم شارە دووچاری گەورەترین داڕمانی ئابوری هات، گرانی و قات و قڕی ولاتی گرتەوە، بەجۆرێك ئەو کەل وپەل و خواردەمەنیانەشی گرتەوە کە بەرهەمی نێوەخۆی کوردستان بوون و بەر لەجەنگ لەپێداویستی خەڵك زیاتر بوون، لە کوردستانی باشووردا نرخی گەنم حەوت هێندەی جاران زیادی کردبوو بەبەراورد لەگەڵ ناخۆشترین رۆژانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا[١٥٢] .

---

[١٤٦] ئەحمەد خواجە، چەند بیرەوەریەکی مێژوویی، رۆشنبیری نوێ، ژ١١١، ١٩٨٦،ل٨٤.

[١٤٧] رەفیق حیلمی: هەمان سەچاوە،ب١،ل٣٠.

[١٤٨] حەمەبۆر: حاجی عەلی بەسێی قارەمان، کوردستانی نوێ، ژ١٧١٩،١٤/١٠/١٩٩٨.

[١٤٩] ئەحمەد خواجە: چەند بیرەوەریەکی مێژوویی، رۆشنبیری نوێ، ژ١١١، ل٨٤.

[١٥٠] کردستان فی سنوات الحرب...ل١٥٠.

[١٥١] جمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٢،ل٣١.

[١٥٢] محەمەد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی٢٠٠٠، ل١٨٠-١٨١؛ د. کمال مظهر احمد: کردستان فی سنوات،ل٢٧٧.

تەنانەت لەشاری سلێمانیدا هۆقەی ئارد گەیشتە یەك لیرەی زێڕ جگە لەوەی لەئەنجامی نەمانی دەستی ئیشکەر، کەس نەمابوو کشتوکاڵ بکات و زەوی وزار پشـت گـوێ خرابـوون و لـەنیوەی زیـاتری زەویـەکان نەچێندرابوون،[153] بەشێوەیەك تا ماوەی دووساڵ هیچ کەسێك نەیتوانی بوو نەهیچ تۆویکات و نەهیچ بەروبومێکیش کۆکاتەوە[154]، کەچی حکومەت هەر رۆژەو بەناوێکەوە خواردن و دانەوێڵەی خەڵکی تاڵان دەکرد، جارێ بەناوی (مبایعە) و گاهێك بەناوی (اعانە)، کە بەشی زۆری ئەمانە تاڵان دەکراو ئەدزراو کەمی دەگەیشتە عەمارەکانی میری[155]، لەسەرتاوە کە گەنم و دانەوێڵەی خەڵکیان دەبرد پسولەیەکیان پێدەدان کە هیچ نرخێکی نەبوو،[156] تەنانەت جەندرمەی عوسمانی بەپاچ و خاکەنازەوە ماڵان دەگەڕاو ئەو برە خۆراکەی لەژێر خاکدا حەشاریان دابوو ئەوەشی دەردەهێناو دەیان برد، چونکە تا سوپای عوسمانی هەبوایە، هاوڵاتی ئاسایی بۆی نەبوو هیچ بەروبومێك کۆبکاتەوە دەبوایە یا بیبەخشێ یا بەبڕێك پارەی بێ نرخ بیفرۆشێت[157].

تاڵان و بڕۆی عوسمانی تەنها بەگەنم و جۆو خۆراك نەوەستا بەڵکو کەوتنە کۆکردنەوەو بردنی سەرجەم رەشەوڵاخ و ئەسپ و گوێ درێژێکیش کە لەسلێمانیدا هەبوو، کە ئەمەش هێندەی دیکە باری سەرشانی خەڵکی قورس کرد، چونکە هەموو کارێکیان لەسەر ئەوانەوەستابوو، بەڵام ئەوان گەنم و جۆی دزراوی خەڵکیان پێ دەگواستەوە، لەنێو شاری سلێمانیدا (تۆفیق حمە خێل) ئەم کارەی پێ سپێردرابوو کە ئەو ئاژەڵانە بەسوخرە ببات[158].

کار گەیشتە ئەندازەیەك خەڵك سوتەمەنیشی چنگ نەدەکەوت، زۆر ماڵ هەبوون، کۆڵەکەی بن میچی خانووەکانیان دەردەهێناو بۆ خۆ گەرم کردنەوە

---

[153] د. کمال مظهر احمد: کردستان فی سنوات: ل٢٢٨-٢٢٩.

[154] جلیلی جلیل واخرون: هەمان سەرچاوە،٩٢.

[155] رەفیق حیلمی: هەمان سەرچاوە،ب١،ل٢٩-٣٠.

[156] جلیلی جلیل واخرون: هەمان سەرچاوە،ل٩٠، محمد امین زکی: خولاصە،ل١٨٠.

[157] د. کمال مظهر احمد: کردستان فی سنوات: ل٢٢٨-٢٢٩.

[158] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١،ل٧٠-٧١.

ئەحمەد خواجە: چەند بیرەوەریەکی مێژوویی، رۆشنبیری نوێ، ژ١١١،ل٨٤.

بەکاریان دەهێناو، هەندێك ماڵ خانووەکانیان بەسەردا دەرماو دەبوون بەژێریەوە.[١٥٩]

برسێتی و نەبوونی بەئەندازەیەك کاری لەخەڵك کرد، کە ژمارەیەکیان دابوویانە دەشت و کێوەکان و لەسەر گژوگیا دەژیان، سەرباری نەبوونی و نەداریی خەڵکەکەی نێو سلێمانی، لەکوردستانی ئێرانیشەوە خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ روویان دەکردە سلێمانی و چادریان لەنێو شاردا هەڵدابوو[١٦٠].

دەوڵەتی عوسمانی زێواڵە چەرمێکی دابوو بەسەربازەکانی بۆ پێڵاو لەسلێمانی کەچی ئەوان لەبرساندا ئەوەشیان خوساندووەو خواردوویانە[١٦١]. خەڵکیش کەوتبوونە خواردنی ئاردە بەروو پەمودانە، ئەمەش وای کرد دەیان نەخۆشی بڵاوبێتەوەو ژمارەی قوربانیانی برسێتی رۆژانە روو لەزیادبوون بوو، بەتایبەتی لە ئاکامی خواردنی لاشەی تۆپیوی ئاژەڵ و پەلەوەر، تەنانەت گۆشتی مرۆڤیش[١٦٢].

ئەم حاڵە ناجۆرو نالەبارە، گەیشتە ئاستێك لەشاری سلێمانیدا خەڵکی لەتاو برسێتی بەتەنگ بەهاو نەریتە کۆمەڵایەتیەکانیش نەبن و پەنا بۆ لەش فرۆشی بەرن، بەمەبەستی تێرکردنی سکی برسیان بەتایبەت ئەوانەی لەئێرانەوە هاتبوون و روویان کردبۆوە سلێمانی.

رێژەی مردن تا دەهات زیاتر دەبوو، لاشەکانیان لەسەر شەقام و لاکۆڵانەکان دەکەوت و یا لەنێو کەلاوەو مزگەوتەکاندا بۆگەنی دەکردو کەس نەبوو بیان شارێتەوە، لەتوانای شارەوانیش دا نەمابوو،[١٦٣] دانیشتوانی سلێمانی وەك لەسەرەتادا ئاماژەمان پێکرد لەئەنجامی ئەم قات و قڕیەدا دوو لەسەر سێ‌ی بوون بە قوربانی، ئەم حاڵەتە تەنها لە سلێمانیدا روویندابوو،

---

[١٥٩] ئەحمەد خواجە:چەند بیرەوەریەکی مێژووی، رۆشنبیری نوێ، ل٨٥.

[١٦٠] رەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١،ل٦٩.

[١٦١] ئەحمەد خواجە، چەند بیرەوەریەکی مێژوویی، رۆشنبیری نوێ، ژ١١١.

[١٦٢] رەفیق حیلمی: هەمان سەرچاوە، ب١،ل٣٢-٣٣.
طاهر ئەحمەد حەوێزی: مێژووی کۆیە، بەشی یەکەم، بەرگی دووەم، بغداد،١٩٨٤،ل١٣٤.

[١٦٣] رەفیق حیلمی: ، ب١، ل٣٢.

بگرە دەوروبەریشی گرتبۆوە، بۆ نموونە لەشوێنێكی وەك (چوارتا)دا لە كۆیی سەد خێزان تەنها بیست خێزان مابوونەوە.[١٦٤]

ئەم برسێتی و قات و قریە لە ساڵی (١٩١٦)ەوە ئەم نێوچەیەی گرتەوەو تاكۆتایی ساڵی ١٩١٨ درێژەی كێشا[١٦٥]، سەرەڕای هەموو ناخۆشی و نەهامەتیش، لەشاری سلێمانیدا، كەسایەتیەكی وەك كەریمی عەلەكە بەو پەڕی لەخۆبرووییەوە بەهانای خەڵكەوە چووەو ڕۆژانە نانی سەدان كەسی داوەو ئاشەكەی خۆشی خستۆتە خزمەت خەڵكیەوە، ئەوانەش كە ڕوویان نەهاتووە بچن بەشە نانی خۆیان وەرگرن، بەپیاوەكانی خۆیدا بۆی ڕەوانە كردوون[١٦٦].

ئیدی بەدرێژایی ساڵانی جەنگ، سلێمانی تا دەهات وێرانتر دەبوو، هیچ چالاكیەكی تێدانەمابوو، هەموو بوارەكانی ژیان بەرەو ڕمان و داتەپین چووبوون، كە پێش هەموو لایەنێك ئابوری ئەم شارە لەگرێژەنەوە هەڵتەكاو ڕووخا، بەم شێوەیەش لەهەموو حاڵەتێكدا، دواكەوتنی باری ئابوری دۆخە كۆمەڵایەتیەكەشی لەگەڵ خۆیدا بەرەو پاش دەبات[١٦٧].

هەر بۆیە دەتوانین بڵێین "كۆتایی هاتنی جەنگی یەكەمی جیهانی و نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی لەم بەشەی كوردستاندا بەڕاستی بەگەورەترین خاڵی وەرچەرخان دەژمێردرێت، كە بەهۆیەوە چەندین ئاسۆی نوێ بەڕووی ئەم وڵاتەدا كرایەوەو لەو دابڕان و بێ ئاگاییە ڕزگاری بوو"[١٦٨].

---

[١٦٤] ا.م. منتشا شفيلى، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ترجمة من الروسية، د. هاشم صالح التكريتي، بغداد، ١٩٧٨،ل٣٠٢.

[١٦٥] ئەكرەمی ساڵحی ڕەشە، هەمان سەرچاوە،ب٢، ل٣٤٩.

[١٦٦] جەمال بابان: بنەماڵەی عەلەكە لە سلێمانی، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە،١٤٠.ساڵی ٢٠٠٠،ل٧.

[١٦٧] د. كاوس قەفتان: بابان، سۆران، بۆتان، بەغداد،١٩٨٥،ل١٧.

[١٦٨] فاروق علی عمر: الصحافه الكرديه فى العراق، البدايات ١٩١٤-١٩٣٩، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد – كلية الاداب،١٩٩٩، ل١٤.

## باسی پێنجەم:
## بارودۆخی خوێندنو خوێندەواری

لەدوا ساڵەکانی کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانیدا، بارودۆخی خوێندنو خوێندەواری لەکوردستاندا بەگشتی و لەشاری سلێمانیدا بەتایبەتی لەو پەڕی خراپی و ناهەمواریدا بوو، چونکە حکومەتی عوسمانی بەر لەهەموو شتێك بەهیچ شێوەیەك گرنگی بەبواری خوێندنو فێرکردن نەدەدا، بەڵکو پێی وابوو، خوێندنو فێرکردن ناچێتە خانەی ئەرکو چالاکیەکانی حکومەتەوە، بەڵکو کارێکی تایبەتەو دەکەوێتە ئەستۆی تاکە کەسو کۆمەڵەوە، نەك حکومەت لەسایەی بۆچونێکی ئاوەهاشدا، ناتوانین چاوەڕوانی هیچ پێشکەوتنێك بین لەم بوارەدا، بەتایبەت کە هەرسێ ویلایەتەکانی (بەغدا – موسڵ – بەسرە) لە ناوەڕاستی سەدەی شانزەهەمەوە لەبارودخێکی یەکجار پڕ لەکێشەو گیروگرفتدا بوو، ئەم بارودۆخەش تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم درێژەی کێشا.[١٦٩]

لەو رۆژگارەدا ناوەندی دەسەڵات لەدەوڵەتی عوسمانیدا تا دوا ئەندازە لەخوێندەواری و رۆشنبیری دەترساو ئامادە نەبوو، بەهیچ شێوەیەك لای لێ بکاتەوە، چونکە ئەو کاتە پیاوانی ئاینی خاوەن دەسەڵاتو دەست رۆیشتوو بوونو لەناوەندەکانی بڕیارەوە نزیك بوونو رۆڵی گەورەیان لەدەرکردنی بڕیاری سیاسیدا هەبوو، کە زۆر جار سوڵتانەکانی عوسمانی خۆیان پێشڕەوی ئەو رەوتە کۆنە پەرستانەیەیان دەکرد، د. کەمال مەزهەر لەم بارەیەوە دەڵێت (سیاسەتی کوێرانەی سوڵتانەکانو دواکەوتوویی خەڵك لەمەدا دەوری گەورەیان بینی، سوڵتانەکان چاپ کردنی کتێبیان بەکفر دادەنا) تەنانەت ئەو سەردەمە پیشەی فێرکردنو خوێندەواری خۆی لەخۆیدا وەك پیشەیەکی بەدناوو بێزراو تەماشا دەکرا[١٧٠].

---

[١٦٩] د. ابراهيم خليل احمد: تطور التعليم الوطني في العراق ١٨٦٩-١٩٣٢، ط١، ١٩٨٢، البصرة، ل٢٥-٢٦.

[١٧٠] تێگەیشتنی راستی و شوێنی لەرۆژنامەنووسی کوردیدا، بغداد، ١٩٨٧ ل٤٤-٤٥، ستيفن هسلي لونكريك: العراق الحديث، في سنة ١٩٠٠ – ١٩٥٠، بغداد، ١٩٨٨، ل٧١.

هەر بۆیە لەهیچ كونجێكی دەوڵەتی عوسمانیدا تا ساڵانێكی درەنگ شتێك نەبوو نێوی خوێندنگای میری و رەسمی بێت[171]، ئەم بارودۆخە پشت گوێ خستنەی خوێندن لەهەرسێ ویلایەتەكەدا، تا ساتەوەختی هاتن و دەسەڵات گرتنە دەستی (مدحت پاشا ١٨٦٩-١٨٧٢) وەك والی بەغدا بەردەوام بوو، بەڵام نێوبراو لەگەڵ هاتنیدا دەستی دایە ریفۆرم و چاكسازی، كە چمكێكی چاكسازیەكانی ئاوڕدانەوە بوو لەخوێندن وخوێندەواری[172]، كە ئەمەش بەهۆی چەند گۆڕانێكی گرنگی بارودۆخی نێودەوڵەتی عوسمانیەوە، هاتۆتە كوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و عێراقی عوسمانیەوە، كارتێكردنی ئەمەش لەئەنجامی كارتێكردنی سیاسەت و رۆشنبیری ئەوروپا بوو، بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی[173]، هەرچەندە ئەو برە ئیسلاحاتە سەرزاریانەی دەوڵەتی عوسمانی ئەنجامی دەدا، بەتەمای ئەوەبوو وڵاتەكە لەدواكەوتن و خۆشیان لەڕووخاندن رزگار بكەن، بەڵام ئیسلاحاتەكانی مدحت پاشا بۆی نەكرا، ئەو بناغە سیاسی و ئابوری‌یەی لەماوەی سەدەها ساڵدا دروست بوو بوو ئەو دەوڵەتەی لەسەر وەستابوو بگۆڕێت، دەوڵەتی عوسمانی نیازی لەم ئیسلاحاتە رووكەشانە ئەوەبوو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر میللەتەكانی تردا قایم بكەن و روخسارێكی نوێتر بدەن بەئیمپراتۆریەتەكەیان[174].

ریفۆرمەكانی مدحت پاشا، كاریگەری باشی هەبوو بۆ سەر رەوتی خوێندەواری و فێركردن لەم وڵاتەدا چونكە بەر لەهاتنی ئەو هیچ خوێندنگایەكی مۆدێرن لە سێ ویلایەتەكەدا نەبوو، جگە لەچەند خوێندنگایەكی مسینێرەكان لەهەردوو شاری بەغداو موسڵدا، كە تایبەت بوو

[171] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١،ل١٠٦.

[172] د. عبدالعزيز سليمان نوار: تأريخ العراق الحديث، القاهرة، ١٩٦٨،ل٣٨٢.

[173] كەمال رەئوف محەمەد: یەكەم قوتابخانەی كیژانی سلێمانی،كوردستانی نوێ، ژمارە١٠٣٧،ساڵی١٩٩٦.

[174] م.س لازاريف: كێشەی كورد/ بەرگی یەكەم، وەرگێڕانی، د. كاوس قەفتان، بغداد، ٩٨٩، ل٨٢.

بەمەسیحیەکان هەر بۆیە لونگریك بەمەزندە، ڕێژەی خوێندەوار لە دوا ساڵەکانی دەسەڵاتی عوسمانیدا بە ٠,٥٪ دادەنێت.

ئەو کاتەش حکومەتی عوسمانی بەو پێکهاتەیەوە، هێندە پێویستی بە خەڵکانی پێگەیشتوو خوێندەوار نەبوو، ئەوەش کە پێویستی بوو بێت، لە مزگەوتو حوجرەکاندا پێگەیەندرابوونو ئەو بۆ شاییەیان بۆ حکومەت پڕکردبۆوەو وبڕی پێویستی فەرمانبەرو کارگێڕیان بۆ دەستەبەر کردبوون[١٧٥]

سەبارەت بەڕەوشی خوێندنو خوێندەواریش لەکوردستاندا ئەوا بەشێوەیەکی گشتی. باری ڕۆشنبیری لەخواروی کورستاندا لەپاش رووخانی میرنشینی بابان، تاوەکو جەنگی یەکەمی جیهان، وەکو بەشەکانی تری کوردستان، لەچاو وڵاتانی تردا، زۆر دواکەوتوو بوو، حکومەتی عوسمانی کە دەستی گرتبوو بەسەر کوردستاندا هیچ بایەخێکی نەدەدا بەخوێندەواری هەوڵی دەدا هەر تەقەلایەك لەو رووەوە بدرێ هەمووی پووچەڵ بکاتەوە.[١٧٦] جگە لەوەش خراپی باری ئابووریو بژێوی ژیانی خەڵك هۆکارێکی دیکەبوو بۆ دواکەوتوویی و نەخوێندەواری، زێوەر سەبارەت بەم خاڵە دەڵێت "زەمانەکە ئەوەندە پەرێشانو موشەوەش بوو، کەس بەلای تەحسیلدا نەدەچوو[١٧٧] بەم شێوەیەش، تەنها ژمارەیەکی کەمی منداڵە دەوڵەمەندو خواپێداوەکان توانای خوێندنو تەواوکردنی مەکتەبیان هەبوو"[١٧٨]

بەڵام وێرای ئەو بارە ناهەموارو دژوارە، خەڵکی سلێمانی تا ئەندازەیەکی باش، چاویان لەخۆپێگەیاندنو ڕۆشنبیری بووە. تەنانەت لەسەردەمی بابانەکانەوەو بەر لەوەی لەقەڵاچوالانەوە بگوێزرێنەوە بۆ سلێمانی، پێیتەختەکەیان ژمارەیەکی بەرچاو مزگەوتو حوجرەو خوێندنگای ئاینی تێدابوو ئەو سەردەمەش مزگەوتەکان وێڕای ئەوەی شوێنی

---

[١٧٥] د. ابراهیم خلیل احمد: هەمان سەرچاوە، ل٢٨-٢٢٢.

لونگریك: اربعة قرون من تأریخ العراق الحدیث، بغداد، ط٥، ل٣٨٢.

[١٧٦] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل٨٣-٨٤.

[١٧٧] گەنجینەی مەردانو یاداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، بەغداد، ١٩٨٥، ل١٣٠.

[١٧٨] هاشم جواد: مقدمه فی کتاب العراق الاجتماعی، بغداد، ١٩٤٦، ل١٠٩.

خواپەرستی و نوێژكردن بوون، لەهەمان كاتدا رۆڵێكی گەورەیان لەژیانی خەڵكدا بینیوەو شوێنی خوێندن و كۆبوونەوەی خەڵكی بوون، وەك مزگەوتی گەورە، بن تەبەق، حاجی حان.[179] ئەو رۆژگارەی كۆتایی حوكمی عوسمانی، نەك تەنها لەسلێمانیدا بەڵكو لەهەرسێ ویلایەتەكەی ئەوسادا، تەنها حوجرەو خوێندنگا ئاینیەكان بلاوبوون، تەنانەت هەندێ سەرچاوە ژمارەی حوجرەو خوێندنگا ئاینیەكانی دەوڵەتی عوسمانی بەزیاتر لە (٤٠٠) شوێن و بنكە دەخەمڵێنن،[180] حكومەتیش زۆر گرنگی پێداون، چونكە لەزۆر رووەوە دەچووە خزمەت سیاسەتی دواكەوتوانەی دەوڵەتی عوسمانیەوە،[181] سلێمانیش وەك لیوایەكی زانستی ئایینی تێدابوو، كە ژمارەی قوتابییەكانی (٢١٠) قوتابی بوو[182].

ئەم شێوازی خوێندنەش تا بلێی شێوازێكی دواكەوتوو بێ بەرنامە بووەو كۆنترین رێبازی وانە وتنەوەی تێدا پەیڕەو كراوەو لەڕووی تەندروستیشەوە، هیچ مەرجێكی تەندروستی تێدانەبووەو قوتابیەكان یا لەدوكانێكی تاریكدا یا لەژوورێكی شێداردا كۆكراونەتەوەو دەرسیان پێ وتراوە[183].

لەلایەكی دیكەشەوە، وانە زانستیەكان پشت گوێ خرابوون و ئاوڕدانەوە تەنها بۆ وانەو مێژووییەكان بوو، وەك (مەنتیق، مێژوو، رەوانبێژی، زمان)[184].

لە سلێمانیشدا ئەم رەوتە باوبووەو، هەر مزگەوت و حوجرەیەك بەپێی ئەندازەی زانینی مەلاكەی فەقێی هەبووەو بەیاریدەی خەڵكی ژیاون[185]،

---

[179] ئەكرەمی ساڵحی رەشە: هەمان سەرچاوە، ب٢،ل١١١؛ مكرم طالباني: ابراهیم خان ثائر في كردستان بغداد ١٩٧١، ل٣٤-٣٥.

[180] د. ابراهیم خلیل احمد :، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦

[181] مكرم طالبانی، هەمان سەرچاوە، ل٣٤. ١٩٦-د. ابراهیم خلیل احمد: هەمان سەرچاوە. ل٢٦.

[182] محمد امین زكی، تأریخی سلێمانی، بغداد، ١٩٣٩، ل٢٠٧.

[183] د. ابراهیم خلیل احمد: هەمان سەرچاوە ،ل٢٦.

[184] سەرچاوەی پێشوو،ل٦١.

[185] ا.ب. هەوری: شاری سلێمانی، لە ساڵانی ١٩٢٥ - ١٩٢٦دا، گۆڤاری بەیان، ژ٢٨، ساڵی ١٩٧٥،ل٢٩.

لەزۆربەی گەڕەکەکانی سلێمانیدا حوجرەیەك یا دوو حوجرەی تێدابووە،[١٨٦] بابەتو وانەکانیشیان جگە لەقورئان بریتی بوون، لەپەندی عەتتارو گوڵستانو بوستانی سەعدی شیرازی و جگە لەمانەش زانایانو هەڵکەوتوانی شارەکەش دەستیان هەبووە لەڕەنگ ڕێژکردنی بەرنامەو پرۆگرامی خوێندنی ئەو حوجرانە، وەك ئەو فەرهەنگە، عەرەبی — کوردییەی، شێخ مارفی نۆدیی بۆ کاك ئەحمەدی شێخی کوڕی داناوەو ناوی ناوە (ئەحمەدی)[١٨٧].

خوێندنیش لەم حوجرانەدا بەزمانی فارسی بووە،[١٨٨] پیرەمێرد لەو بارەیەوە دەڵێت (تەحسیلمان بەدەستوری کۆنی حاکمانی (بەبە) فارسی بوو)[١٨٩]، محەمەد ڕەسوڵ هاواریش سەبارەت بەهەمان مەسەلە دەڵێت "نوسینی زۆربەی خەڵكو خوێندەواری هەر بەفارسی بووە"[١٩٠].

ئەو حوجرەو خوێندنگا ئاینیانە، تا ئەندازەیەك باش بوون، بەڵام وەك پێویست نەبوون،[١٩١] ئیدی کە حکومەتی عوسمانی هەستی بەوەکرد کە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی خۆی لەفەرمانبەرو کادیری ئیداری پێویستی بەوەیە ناوەندێك بۆ پێگەیاندنی ئەو خەڵکانە دروست بکات[١٩٢]، ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٦٥ نیزامی تەشکیلاتی ویلایاتی ڕاگەیاندو بەماوەیەکی کەم دوای ڕاگەیاندنی ئەم تەشکیلاتە کەوتە کردنەوەی چەند خوێندنگایەكو سلێمانیش هەر ئەو ڕۆژگارە، بەهەوڵو کۆششی پیاوانی وەك، ئەحمەد پاشای بابانو سلێمان غەواس، هەلی بۆ هەڵکەوتو ساڵی ١٨٦٨ز یەکەم قوتابخانەی ڕوشدیەی موڵکی تێدا کرایەوە[١٩٣]، دواتریش، وەك ئاماژەمان پێکرد لەگەڵ

---

[١٨٦] ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە: هەمان سەرچاوە،ب٢/ل١٣٤-١٣٥.

[١٨٧] جەمال بابان: قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری، گۆڤاری ڕەنگین، ژ١٤١،ل٧.

[١٨٨] ڕەفیق حیلمی: یادداشت،ب١، بەغداد، ١٩٨٨،ل٢٢٨.

[١٨٩] ئومێد ئاشنا: یادداشتەکانی پیرەمێرد، ل١٩-٢٠.

[١٩٠] شێخ مەحمودی قارەمان، ب٢، ل٩٦.

[١٩١] ابراهیم خلیل: احمد، تطور التعلیم، ل٢٧.

[١٩٢] سەرچاوەی پێشوو،ل٣٦.

[١٩٣] کەمال ڕەئووف محەمەد:یەکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانی، کوردستانی نوێ، ژمارە/١٠٣٧، ١٩٩٦.

هاتنی (مدحت پاشا)دا کەمێك خوێندەواری پێشکەوتنی بەخۆوە بینی و مدحت پاشا لەیەکەم هەنگاویدا چەند خوێندنگایەکی روشدیەی سەربازی لەچەند شارێکی سێ ویلایەتەکەدا کردەوە، یەکەمیان ساڵی ١٨٦٩ لەبەغدا کرایەوە[١٩٤]، پاشانیش، بەهەوڵ و ماندووبنی (سەعید پاشا خەندان) کە وەزیری بابی عالی و خەڵکی شاری سلێمانی بوو توانرا لە ساڵی ١٨٩٣، یەکەم روشدیەی عەسکەری لە سلێمانیش بکرێتەوە[١٩٥].

ئاستی خوێندن لەروشدیەی سەربازیدا، بەرامبەر بەخوێندنی ناوەندی بوو[١٩٦]، زمانی خوێندنیش تورکی بوو[١٩٧]، چونکە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە بەرێوە دەبراو زیاتر منداڵانی مەئمورو فەرمانبەرە تورکەکانی سلێمانی و منداڵانی کوردیش روویان تێدەکرد بەتایبەت ئەوانەی لەدام و دەزگای دەوڵەتدا کاریان دەکرد[١٩٨].

ئەم خوێندنگایە زوو پەرەی سەند بەڵام تا ساڵانێکی درەنگ نەیتوانی شوێن بەمزگەوتەکان لەق بکات[١٩٩]، تەنانەت ململانێیەکی زۆر هەبوو لەنێوان فەقێی حوجرەکان و منداڵە مەکتەبلیەکان، زۆرجار توشی دەمەقاڵەش دەبوون، فەقێکان خۆیان و مامۆستاکانیان زۆریان رق لەمنداڵە مەکتەبلیەکان و لاوە خوێندەوارەکان دەبۆوە، بەمامۆستای مەکتەبەکانیان دەووت (فەرمەسۆن) و ناو و ناتۆرەی ناشیرینیان ئەدانەپاڵ[٢٠٠].

---

[١٩٤] د. ابراهیم خلیل احمد: هەمان سەرچاوە، ل٣٦.

[١٩٥] د. جەمال بابان: قوتابخانەی روشدیەی عەسکەری لە سلێمانی، گۆڤاری رەنگین ژمارە/١٤١، ساڵی ٢٠٠٠،ل٦.

[١٩٦] ئەکرەم ساڵحی رەشە: هەمان سەرچاوە،ب٢،ل٢٤-٢٥.

[١٩٧] مکرم طالباني: هەمان سەرچاوە، ل٣٤.

[١٩٨] سۆن: هەمان سەرچاوە،ل١٤.

[١٩٩] ئەکرەمی ساڵحی رەشە: هەمان سەرچاوە،ب٢،ل٤٤٦.

[٢٠٠] ا.ب. هەوری: شاری سلێمانی لە ساڵانی ١٩٢٥-١٩٢٦،دا گۆڤاری بەیان، ژمارە٢٨، ١٩٧٥.

لای خەڵکیش خوێندنی فەقێیەتی ڕەواجی زۆر بوو ، حکومەتی عوسمانی پشتیوانی لێدەکرد هەروەك ( ڕەشید شەوقی )* لە یاداشتەکانیدا باسی لێوە دەکات و دەڵێت " تورکی ئیستعمار لەو دەمەدا ڕەواجی دابوو بە فەقێ و مەلا ، هەرچی کەسێك ببوایە بە فەقێ لە عەسکەری ڕزگاری ئەبوو ، ئەگەر یەکێ بە ناویش فەقێ بوایە ، بەمەرجێك مەلای مزگەوتەکەی بۆی بنوسیایە نە ئەکرا بە عەسکەر جگە لەوەی فەقێیەتی بێئەرك و مەسرەف بوو "[٢٠١]

مەکتەبی روشدیەی سەربازی بەدیهێنەری ئاواتی خەڵکی سلێمانی نەبوو، بەڵام بۆ ئەو رۆژگارە باش بوو، نەك تەنها خەڵکی نێو شاری سلێمانی، بەڵکو قەزاو ناحیەکانیش رویان تێدەکرد[٢٠٢]، هەرچەندە زۆر دەگمەن بوو.

تاکردنەوەی، ئەم مەکتەبە، خوێندن و خوێندەواری لەسلێمانیدا کزو لاواز بوو، تەنانەت بۆ نوسین یا خوێندنەوەی نامەیەك، خەڵکی دۆش دادەماو دەبوایە گەڕەکاو گەڕەك بە شوێن خوێندەوارێکدا بگەڕێت[٢٠٣].

لە ساڵنامەی عوسمانیەکاندا، بەکەمی باس لەخوێندن و خوێندنگای شاری سلێمانی کراوە، یەکەم ساڵنامە کە ئاماژەی بەبوونی خوێندنگا کردبێت، ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی ساڵی (١٨٩٠-١٨٩١)ە، لەوێدا باس لەخوێندنگایەکی روشدیەی مولکی دەکات، کە ژمارەی خوێندکارەکانی (١٠٣) خوێندکارەو سێ مامۆستاشیان هەیە، هەمان زانیاری لەساڵنامەی

---

* ڕەشید شەوقی کوڕی سەعید شەوقی قادر ئەفەندی گەورەیە ، ئەفسەر بووە لە سوپای عوسمانی‌داو دواتریش لە دووەهەمین حکومەتی شێخ مەحمود دا ئەفسەری ( عەسکەری کوردستان ) بووە ، پاشانیش بەڕێوەبەری ئیدارە خانەی گۆڤاری ( دیاری کوردستان ١٩٢٥ - ١٩٢٦ ) بووە ، لە سەردەمی پاشایەتی‌دا ئەفسەر بووە لە سوپای عێراقدا ، ناوبراو یادگارێکی گران بە های دەستخەتی خۆی بۆ بەجێهێشتووین کە بیرەوەریەکانیەتی بە ناوی ( بەسەر هاتووی کاکە ڕەشید شەوقی - سەرگوزشتە ) . ( سدیق سالّح : ڕەشید شەوقی یەکەمین یادداشت نووسی کوردی ، کوردستانی نوێ ، ژمارە ( ٢٥٩٢ ) ، ٢٤/١٠/٢٠٠١ ) .

[٢٠١] ڕەشید شەوقی : بەسەرهاتووی کاکە ڕەشید شەوقی _ سەرگوزشتە ، دەست نووس

[٢٠٢] عبدالرقیب یوسف، صدیق صالح: بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمە ئاغای پشدەری، سلێمانی، ٢٠٠١،ل١١.

[٢٠٣] ڕەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل٩٤.

ساڵی (١٨٩٢-١٨٩٣) دوبارە دەبێتەوە، بەڵام لەساڵنامەی (١٨٩٤-١٨٩٥)دا، لەپاڵ روشدیەی موڵكیدا، باس لە روشدیەی سەربازیش دەكات، كەژمارەی خوێندكارەكانی (١٣٠) خوێندكارەو ستافی خوێندنگاكە لەدە كەس پێك دێتو بەڕێوەبەرو دوو مامۆستایان پلەی سەربازیان هەیە، بەڵام مامۆستاكانی دیكە، خەڵكی مەدەنینو كوردیشیان تێدابووە، وەك عیرفانە فەنی، ئەو وانانەش كە لەو خوێندنگایەدا خوێندراون بریتی بوون لە (زمانی عەرەبی، فارسی، رێزمانو ماتماتیكو وێنەو رێنوس)[٢٠٤].

بەم شێوەیە سلێمانی دەبێتە خاوەنی دوو خوێندنگای موڵكی و سەربازی، وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد خوێندنی ئەم خوێندنگایانە بەرامبەر بەقۆناغی ناوەندی بوو، كە تا ئەم كاتە، خوێندنگای سەرەتایی نەبوو، خەڵكی لەسەرەتادا منداڵیان دەناردە حوجرەو كە زیاتر شوێنی قۆناغی سەرەتایی دەگرتەوە، چونكە حكومەتی عوسمانی تا ساڵانێكی درەنگ خوێندنی سەرەتایی پشت گوێ خستبوو.[٢٠٥]

پاش كردنەوەی روشدیەی سەربازی، وەك محەمەد رەسوڵ هاوار لەزاری (تۆفیق وەهبی) دەگێڕێتەوە، روشدیەی موڵكی باوی نامێنێت و كەم كەس رووی تێدەكات[٢٠٦]، راستی ئەم قسەیەش لەو ئامارانەوە بەدەردەكەوێت كە ساڵنامەكانی دەوڵەتی عوسمانی دەیخەنە روو، بۆ نموونە لەكاتێكدا لە ساڵی (١٨٩١-١٨٩٢)ز ژمارەی خوێندكارانی روشدیەی موڵكی (١٠٣) خوێندكار بووە، دەبینین لە ساڵنامەی (١٨٩٩-١٩٠٠) ژمارەی خوێندكارانی هەمان خوێندنگا دابەزیوە بۆ تەنها (٣٠) خوێندكار، لەكاتێكدا هەر هەمان ساڵنامە ژمارەی خوێندكارانی روشدیەی سەربازی بە(١٠٦) خوێندكار دادەنێت[٢٠٧]، لە ساڵانی پێش جەنگی جیهانی یەكەم دا، ژمارەی خوێندكارانی

---

[٢٠٤] عبدالفتاح علی یحیی: سالنامات، ل٥٣-٥٤ ؛ سلێمانی: بڵاوكراوەی شاری سلێمانی، ١٩٦٩، ژمارە١٢،ل٥٣.

[٢٠٥] د. ابراهیم خلیل: تطور التعلیم، ل٣٩.

[٢٠٦] شێخ مەحمودی قارەمان،ب١،ل١١٠-١١١.

[٢٠٧] د. عبدالفتاح علی یحیی، ساڵنامات ،ل٥٤.

ڕوشدیەی سەربازی دەگاتە (۱۱۰) خوێندکار، بەڵام ڕوشدیەی مولکی ژمارەی خوێندکارەکانی لە(۷۰) خوێندکار تێپەڕ ناکەن[۲۰۸]

فاکتەری کەم بوونەوەی ژمارەی خوێندکارانی ڕوشدیەی مولکیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خوێندنگای ڕوشدیەی سەربازی ئەو کاتە بەشی ناوەخۆیی هەبووەو خوێندن تێیدا بەخۆرایی بووە، وێڕای دەرچووانی ڕوشدیەی سەربازی دەبوون بەئەفسەرو، ئەفسەریش ئەو زەمانە پلەو پایەکی کۆمەلایەتی دیارو بەرچاوی هەبوو لەنێو خەڵکیدا، خوێندکارانی ئەم دوو خوێندنگایە زیاتر منداڵی کورد بوونو خوێندنگایەکی کلدانیو یەکێکی جولەکەکانیش لەنێو سلێمانیدا هەبووە.[۲۰۹]*

بەڵام دەوڵەتی عوسمانی، وەك پێویست بەتەنگ خەرجی و پێداویستی ئەم دوو خوێندنگا ڕەسمیەی سلێمانیەوە نەهاتووە، هەروەك ئەمین زەکی بەگ باسی لێوە دەکات، لە ساڵی ۱۳۰۷ ڕۆمیدا، خەرجی مەعاریفی لیوای سلێمانی تەنها (۱۵۰) لیرە بووەو دراوە بەموچەی مامۆستایانی ڕوشدیەی مولکی، لەکاتێکدا داهاتی لیواکە دە هەزار لیرەی لەو پارەیە زیاتر بووە، بەڵام یا نێردراوە بۆ ئەستەمبول یا چۆتە باخەڵی مەئمورەکانەوە[۲۱۰].

خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی لەم دوو قوتابخانەیەو ئاستی خوێندنیان ڕازی نەبوون، بەڵام لەچاو حوجرەو مزگەوتەکاندا زۆر باش بوون بۆیە خەڵکی ڕووی تێکردوون، ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی شاری سلێمانی زۆر لەحوجرەو خوێندنگا ئاینیەکان بێزاربوون، بۆ نموونە دەبینین، ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) بەم شێوەیە باس لەپرۆسەی خوێندن دەکات لەنێو حوجرەکانداو دەڵێت: " ئەو منداڵە مەزلوومە چوار پێنج ساڵ لەحوجرە دەخوێنێت، بەنیوەچڵ (انا انزلناه...) تەواو دەکات، هەموو هەفتەیەکیش سەرقەڵەمانە

---

[۲۰۸] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد : کوردی سلێمانی ، ل ۲۱۰ .

[۲۰۹] د. عبالفتاح علي یحیی، ساڵنامات ،ل٥٤.

* ڕەشید شەوقی لە یاداشتەکانیدا باس لەوە دەکات کە خوێندکارانی ڕوشدیەی سەربازی هەموویان سەرو وێنەیەکی ئاڵای تورکیان لە بەرۆکیان داوەو ووتویانە خەلیفە بۆ ناردووین و ئێمەی کردووە بە کوڕی خۆی .

[۲۱۰] تاریخ سلێمانی و ولاتی،ل۲۰٦.

کەلەیەك شەکر بۆ مامۆستا ئەبات، بەلام ٧ لەگەڵ ٨ دەکاتە چەندو ناوی باوکی خۆی نازانێت بنوسێت سمایل نامەو گوڵستان وەکو بلبل پێ ی رەوان دەکەن، قوەی مفکرەو دەماغو حیاتی ئەو منداڵە عادەتەن دەرمان خوار ئەکەن[٢١١].

بەلام بەکردنەوەی ئەو دوو خوێندنگایە، وەك رەسوڵ هاوار دەڵێت هیچ نەبێت منداڵانیان لە(ئەرێ بابە)ی نێو مزگەوتەکان رزگار کرد[٢١٢].

رۆژنامەی (پێشکەوتن) توانج دەگرێتە خوێندنی نێو حوجرەو مزگەوتو دەڵێت: "فەقێیەك دوو کتێبو نیو دەخوێنی وپێ ی دەڵێن مامۆستای دوانزە عیلم) کەچی لە (قل هو الله) ساتمە دەکات، خوێندن هەر بەنحو صرف – منطق – کلام کە دەخوێندرێت تەواو نابێت، وەك ئەوانە علیمیان پێ دەڵێن، جغرافیا، تاریخ، اخلاق، حکمت، ریاضة، ماتماتیك، هەموو بحرێکی علیمن، خوێندن تەنها خوێندنی مزگەوت نیە، خوێندن بۆ زانین و تێگەیشتنی هەموو شتێکە کە زانینو تێگەیشتن لەهەموو شتێکدا بوو ئەوا عالم ئەو کەسەیە"[٢١٣].

بەلام وێڕای ئەو گلەییانەی لەحوجرەو ئاستی زانستی مامۆستاکانی کراوە، چەند حوجرەیەك هەبوون کە ئاستی زانستی مامۆستاکانیو بابەت و پرۆگرامەکانی زۆر لەحوجرەکانی دیکەی سلێمانی بەرزتر بوون، بەتایبەت حوجرەکەی خواجە فەنی و حوجرەکەی مەلا سەعیدی زلزلەیی[٢١٤].

پێدەچێت حوجرەکەی خواجە فەنی لەهەموویان زیاتر پەرەی سەندبێت، چونکە بەرنامەکانی خوێندنی زۆر پێشکەوتوو بووە تەنانەت مێژووی دەوڵەتی عوسمانی و راپەڕینی ئەوروپا و زمانی تورکی تێدا گوتراوەتەوە، هەفتانەش دووجار وانەی زمانی فەرەنسی بەقوتابیان گوتراوە،

---

[٢١١] رۆژی کوردستان: ژمارە(١١) ٣/شوباتی/ ١٩٢٣،ل٣، کۆکردنەوەی جەمال خەزنەدار، بغداد، ١٩٧٣.

[٢١٢] شێخ مەحمودی قارەمان،،ب١،ل٨٤.

[٢١٣] رۆژنامەی (پێشکەوتن) : ژمارە(٣)ی ساڵی ١٩٢٠، کۆکردنەوەی، عەلی ناجی کاکە حەمە ئەمین عەتار، سیروان بکر سامی، هەولێر،١٩٩٨.

[٢١٤] جەمال بابان: قوتابخانەی روشدیەی عەسکەری، رەنگین ژ١٤١،ل٦.

دواتر خواجه فەنی جگە لەکوڕ، کچیشی هێناوەتە حوجرەکەیو بۆ ئەوەی چاوی خەڵك بکاتەوە لەپێش هەموو کەسێکدا (حەپسە)ی کچی کردە قوتابی حوجرەکە، لەم حوجرەیەدا دەیان گەورەپیاوی وەك (سەعید پاشای خەندان و شێخ مەحمودی حەفیدو حاجی مستەفا پاشای یامولکی) خوێندویانە[٢١٥].

هەر لەروانگەی بۆچوونی خراپی رۆشنبیران سەبارەت بەخوێندنی ئاینی نێو حوجرەو مزگەوت، خەڵکی روویان کردۆتە هەردوو خوێندنگای روشدیەی مولکی و سەربازی. بەڵام تا ساڵانێکی درەنگ بەهیچ شێوەیەك باس لە کردنەوەی خوێندنگای کچان لە سلێمانیدا نەکراوە، کچانیش ژمارەیەکی کەمیان لەحوجرەدا خوێندویانە، وەك حوجرەکەی (مەلا ئامینە)* کە لەوێدا فێری سورەتی (یاسین) کراون، پیرەمێردی شاعیر لەم بارەیەوە دەڵێت "لەم وڵاتەی ئێمەدا خوێندنی کچ بەزۆری لای (مەلا ئامینە) تا (یاسین) بوو، ئەویش بۆ ئەوە بوو کە لە ماڵەوە نەیەتە دەرەوەو بەقورئان خوێندنەوە رابوێرێ، نەیان دەهێشت کچ فێری نووسین بێت، نەك کاغەزی عەشق بازی بۆ کوڕان بخوێنێتەوەو جواب بنوسێتەوە"[٢١٦].

جگە لەمەلا ئامینە، هەریەك لە (مەلا فاتمو ناجیەخانو مەلا رەعنا)دەرسیان بەکچانی سلێمانی وتۆتەوە،[٢١٧] بەڵام وێڕای ئەم چەند کەسەش، خوێندنی کچان زۆر کزو لاواز بووەو تەنها کچی پیاوە دەوڵەمەندو خۆشگوزەرانەکان ئەو هەلەیان بۆ رەخساوە[٢١٨].

بەڵام لەو بارودۆخە نالەبارەی عوسمانیدا، لە ساڵانی ١٩١٤-١٩١٥ یەکەمین قوتابخانەی کچانیان لە سلێمانی کردەوە، تا بڵێی قوتابخانەیەکی پەرپوت بوو، عیرفان ئەفەدیان کردە بەڕێوەبەری، بۆ ماوەیەك تەنیا مامۆستای

---

[٢١٥] جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب١، بغداد،١٩٩٢،ل١٥٥.

* مەلا ئامینە ژنێکی کوێری دەموچاو ئاوڵاوی بوو حوجرەی لە ژێرخانێکی تەڕو شێداردا کردبۆوەو لەوێدا بە حونجە قورئانی فێری کوڕان و کچانی سلێمانی دەکرد، (پاکیزە رفیق حلمی: کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە.. یادداشت، هەولێر، ٢٠٠٠، ل١٧)

[٢١٦] ئومێد ئاشنا: یادداشتەکانی پیرەمێرد، سلێمانی، ١٩٩٦،ل٣٠.

[٢١٧] جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم،ب١،ل١٥٥.

[٢١٨] یەکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانی، کوردستانی نوێ، ژ١٣٠٧.

کچیش لەوێدا، (مەلیحەخانی قازی) بوو، دەوڵەت هیچ بایەخی پێنەدابوو، چونکە عوسمانیەکان لەکاتی روخانیاندا بوون لە شەڕی جیهانی یەکەمدا[219].

کەمال رەئووف محەمەدیش، سەبارەت بەیەکەمین مەکتەبی کچانی سلێمانی دەڵێت "بەبەڵگەنامەی رەسمیەوە بۆم ساغ بۆتەوە، کە بەڵێ لەسەردەمی عوسمانیدا، تەنانەت لەگەرمەی جەنگدا، یەکەم قوتابخانەی کیژان دامەزراوە یەکەم ئافرەتی کوردی سلێمانی (مەلیحەخانی نەزمەت ئەفەندی . رێبەری بووە، نوسەری ئەم بابەتە دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە دەگێڕێتەوە بۆ هەوڵ و کۆششی، لقی سلێمانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی، چونکە مەلیحەخان خێزانی (عەبدوڵلا نور موهتەدی) بووە، کە نێوبراو بەر لەهاتنی بۆ سلێمانی لەموسڵ سەر بەو رێکخراوە بووە، هەروەها دەڵێت لە بەغداش لقی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی قوتابخانە کیژانی بەغدایان کردۆتەوە "[220].

لە راستیشدا کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی گرنگیەکی زۆری بەمەسەلەی خوێندن داوەو، لەبەرنامەی سیاسی خۆیدا کە لە ساڵی (١٩٠٩ ) دا بڵاوی کردۆتەوە، سەبارەت بەخوێندن و فێرکردن، باس لەوە دەکات کە پێویستە دەوڵەت سیاسەتێکی تایبەت لەبواری فێرکردندا بگرێتەبەر بەمەبەستی پێگەیاندنێکی یەکگرتووی تازە پێگەیشتوانی نێو دەوڵەتی عوسمانی و کردنەوەی خوێندنگا تاوەکو خەڵکانی نەتەوە جیاوازو جۆراوجۆری نێو دەوڵەتەکە بگرێتە خۆی و لەتوانادابێت پەروەردەیەکی یەکگرتوویان بکەن و زمانی تورکی وەك زمانی رەسمی بهێڵدرێتەوە[221].

هەرچەندە حکومەت وەك پێویست ئاوڕی لەخوێندن و فێرکردن نەداوەتەوە، بەڵام خەڵکی شارەکە خۆیان بەتەنگ خوێندن و خوێندەواریەوە بوون و ویستویانە پەرە بەو بوارە بدەن. پیرەمێردی شاعیر باس لەناهەمواری

---

[219] درەخشان جلال حەفید: حەپسەخانی نەقیب، ژیان و تێکۆشانی، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩،ل٧٣.

[220] یەکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانی، کوردستانی نوێ، ژمارە/١٠٣٧.

[221] ابراهیم خلیل احمد: هەمان سەرچاوە،ل٤٧.

بارودۆخی سلێمانی دەکات کاتێك لەئەستەمبۆل گەڕاوەتەوە، کەچی دەڵێت "زێوەر و مەلا سەعید، بێ پارەو پول دە دوانزە منداڵیان کۆکردبۆوەو دەرسیان پێ ئەوتن"[٢٢٢].

پێدەچێت بەهۆی تێوەگلانی دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی یەکەمی جیهاندا، ئەو بارودۆخە زیاتر بەرەو خراپ بوون چوبێت، چونکە قوتابخانەی روشدیەی سەربازی کە زۆرترین ژمارەی خوێندکاری هەبووە، ساڵی ١٩١٤ هەڵوەشاوەتەوە، مامۆستا (سەعید سدقی کابان) لەم بارەیەوە دەڵێت (روشدیەی سەربازی لە ١٩١٤/١١/٢٦ دا هەڵوەشایەوەو خرایە سەر مەعاریفی گشتی) و مامۆستا (عەبدولرەحمان نسیبە)ش ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم قوتابخانەیە هەڵوەشاوەتەوەو تێکەڵ بە قوتابخانەی نموونەیی سەرەتایی کراوەو نێو نراوە (تەشویقیە) ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە حکومەتی عوسمانی لەدوای خۆی سێ خوێندنگای لەشاری سلێمانیدا جێ هێشتووە، کە بریتی بوون لە (ئامادەیی موڵکی و نمونەیی سەرەتایی و تەشویقیە)[٢٢٣] کە بێگومان هەرگیز تەنها سێ خوێندنگا ناتوانێت سەرجەم منداڵانی شارێك لەخۆ بگرێت، کە ژمارەی دانیشتوانی بەر لەجەنگی یەکەم ٢٠ هەزار کەس بووە[٢٢٤].

هەر بۆیە کاتێك جەنگی جیهانی یەکەم کۆتایی هات رێژەی خوێندەوار لە هەر سێ ویلایەتەکەدا تەنها ١٪ ی دانیشتوانی پێك دەهێنا[٢٢٥]

---

[٢٢٢] غەفوری میرزا کەریم: کۆمەڵی زانستی سلێمانی، بغداد ١٩٨٥،ل١٤.

[٢٢٣] کەمال رەئوف محەمەد : یەکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانی ،کوردستانی نوێ، ژمارە١٣٠٧.

[٢٢٤] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١،ل١٠٦.

[٢٢٥] هاشم جواد: هەمان سەرچاوە ،ل١٠٤. د. ابراهیم خلیل احمد: هەمان سەرچاوە ،ل٦٤.

## باسی شەشەم:
## بارودۆخی تەندروستی

لەكۆتایی سالانی حوكمڕانی دەولەتی عوسمانیدا، ئەم ولاتە بەدەست خراپی رەوشی تەندروستیەوە گرفتار ببوو، چونكە ئەم بوارەش رەنگدانەوەی لایەنو بوارەكانی دیكە بوو، كە حكومەتی عوسمانی هیچ بایەخێكی پێنەدەدا، ناشێت لەسایەی داتەپیوی بارودۆخی ئابووریو دواكەتوویی كۆمەلایەتیو نزمی ئاستی خوێندنو خوێندەواریو رۆشنبیریدا چاوەڕوانی بارێكی شیاوو باشی تەندروستی بكەین.

تەنانەت گرنگی نەدانی دەولەتی عوسمانی بەتەندوستی گەیشتبووە ئاستێك كەلەسالی ١٨٩١ دا حكومەتی عوسمانی لەماوەی یەك سالدا تەنها (٦٠٠) قرۆشی بۆ خەرجی تەندروستی تەرخانكردبوو، بەلام هەر لەهەمان سالدا بڕی (٨٨٦٠١٤) قرۆشی بۆ خەرجیو پێداویستی جەندرمەو پۆلیس تەرخان كردبوو.[٢٢٦]

لەكاتێكدا باری تەندروستی كۆمەلایەتی خەلك كێشەیەكی یەكجار گرنگو هەستیارە، چونكە تەندروستیو نەخۆشی هاوشانی مرۆڤن لە سەرجەم قۆناغەكانیدا، باشیو لەباری ئەم دۆخە رۆلی گەورە دەبینێ لەگەشەكردنی كۆمەلدا، لەهەمان كاتیشدا خراپی ئەم بارە گەورەترین كاریگەری هەبووە لەسەر دارمانی كۆمەل.[٢٢٧]

سلێمانیش وەك نێوچەیەكی ژێر دەسەلاتی عوسمانی لەهیچ سیاسەتێكی ئەم حكومەتە بەدەر نەبووە ، هەر بۆیە بارودۆخی تەندروستی لەوپەڕی خراپیدا بووە، تەنانەت هەلكەوتەی جوگرافی شارەكەش بۆخۆی، كاردانەوەیەكی خراپی هەبووە بۆسەر باری تەندروستی .[٢٢٨]

جگە لەمەش كوردستان بەگشتی بەدەست دەیانو سەدان تەرزە نەخۆشیو پەتاوە دەینالاند، وەك مەلاریاو بەلهارزیاو گرانە تاو رشانەوەو

---

[٢٢٦] ئەمین زەكی: تأریخی سلێمانی، ل٢٠٦.

[٢٢٧] هاشم جواد: هەمان سەرچاوە ، ل٨٤.

[٢٢٨] ریچ: هەمان سەرچاوە ، ل٢٧٧.

دیزانتەری[٢٢٩] ، بەڵام هیچ نەخۆشیەك هێندەی مەلاریا لە کوردستاندا بڵاو نەبووە، بەتایبەتی گوندنیشەکان بەدەست مەلاریاوە هەراسان ببوون‌و ساڵانە ١٠٪ دانیشتوانیان بەم نەخۆشیە دەمردن[٢٣٠] لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا لەشاری سلێمانیدا نەخۆشی (گولی) بڵاو بۆوە هەر یەکێك توشی ئەم نەخۆشیە ببوایە یەك پارچە لەشی گەڕو گول دەبوو و دائەڕزا،[٢٣١] کەس نەیدەوێرا هەتا بەلای مردووەکانیشدا بچێت، لەترسا خەڵکی ئەو مردوانەی لەگردێکی تایبەتی دەناشت، پێیان دەوت (گردی گولان) * کە دواتر بوو بە (گردی مامە یارە)[٢٣٢] .

وێڕای ئەمەش ساڵانە هەزاران کەس لەکوردستاندا دەبوون قوربانی نەخۆشی ئاولە،[٢٣٣] چونکە حکومەت هیچ هەنگاوێکی بۆ بەرگرتن لەم نەخۆشیانە هەڵنەدەنا، هەرچەندە بەناو لەشارە گەورەکانی هەرسێ ویلایەتەکەدا خەستەخانەیەکی بیست جێگەیی هەبوو، بەڵام راستیدا ئەمانە تەنها مەرەکەبی سەر کاغەز بوون، گەر هەر شتێکی بچوکیش هەبووبێت ئەوا لەساڵانی جەنگدا نەماو داخرا،[٢٣٤] لەشارەکانی کوردستانیشدا مەگەر دەگمەن نەخۆشخانەو تیمارگە هەبووبێت ، ئەگەر هەشبووبێت لەڕووی کەرەسەو

[٢٢٩] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل٥٩.
[٢٣٠] د. شاکر خصباك: العراق الشمالي، بغداد، ١٩٧٣، ل٢٦٥.
[٢٣١] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل٥٩.
* د . عیزەددین مستەفا ڕەسول باس لەوە دەکات کە لە چاپخانەکەی کاکەی فەلاح دا باسیان لەوە کردووە کە ئایا ئەم گردە ( گردی گوڵان ) ە یان ( گردی گولان ) ، مامۆستای شاعیر عەلی عارف ئاغا لەم بارەیەوە ووتویەتی ( گردی گولان ) ە ، تەنانەت بیرمە ئەوانەی توشی نەخۆشی گولی دەبوون لە بانەو سەقزو ئەو دەورەوە دەرئەکران ، ڕووەو سلێمانی ئەهاتن لێرە نەیان ئەهێشت بێنە شارەوە لەو دەشتە چادریان بۆ هەڵدابوون و خەڵك خۆراکی بە خێر بۆ ئەبردن ، کە ئەمردن لەو گردە ئەنێژران ، لەبەر ئەوە بە گردەکە ئەوترا گردی گولان . ( ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە : شاری سلێمانی ، ب٢ ، ل ١٠٧ ) .
[٢٣٢] غەفوری میرزا کریم: کێومالێ بە بیرەوەریەکانمدا، ل١٨٨.
[٢٣٣] ریچ : هەمان سەرچاوە ، ل٣٧٩.
[٢٣٤] هنری فوستر: نشأة العراق الحدیث، ترجمة، سلیم طه التکریتي، ج٢، بغداد ١٩٨٩، ل٤٣٤.

خزمەتگوزارییەوە کەم‌و کورتی زۆری هەبووە، ئەم دیاردەیەش نەك تەنها دێهاتەکان بگرە شارەکانیشی گرتبۆوە.[٢٣٥]

لەو رۆژانەدا کاروباری پزیشکی لە سەر بنچینەو شێوازی زانستی نەبووە بەڵکو شێوازێکی سەرەتایی‌و فۆلکلۆری تێدا پەیڕەو کراوە، کەسانێك نەبوون نێویان پزیشك بێت‌و پسپۆڕ بن لەوبوارەدا، دەلاکەکان وێڕای سەرو ریش تاشین، مندالانیان خەتەنە کردووەو برین‌و سوتاویان تیمار کردووە، وێڕای ئەمانیش پیاوە ئاینیەکان رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لەو بوارەداو خەڵکی نەخۆشیان بردۆتە لایان، ئەوانیش بەدوعاو نوشتە یاخود بە بەکارهێنانی هەندێك داوو دەرمانی کوردەواری چارەیان بۆ نەخۆشەکان داناوە،[٢٣٦] هنری فۆستر، هۆکاری پەنابردن بۆ پیاوانی ئاینی‌و بە پیرەوە نەچوونی چارەسەری پزیشکی بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە دانیشتوانی ئەم وڵاتە لەبنەڕەتەوە پێیان وابوو کە هەموو نەخۆشیە جەستەییەکانیان کاری خوادیەو بە ئیرادەی ئەو نەبێت چاك نابنەوە ، هەر بۆیە زۆر کەم باوەڕیان بەچارەسەری پزیشکی هەبووە.[٢٣٧]

جگە لە کەمی خزمەتگوزاری پزیشکی، بەدخۆراکی هۆکارێکی دیکەی نەخۆشی‌و خراپی تەندروستی خەڵکی بوو، کە بەهۆیەوە چەندین نەخۆشی کوشندەو درم پەرەی سەندبوو، تەنانەت رێژەی ٨٠ / ٩٠٪ دانیشتوان خۆراکیان زۆر خراپ بوو، هیچ سودێکی پێویستی لێ نەدەبینرا، بۆ وەدەست هێنانی وزەی پێویست بۆ لەش، ئەمەش وای کردبوو جەستەی خەڵکی هیچ توانایەکی سروشتی تێدا نەبێت دژ بەنەخۆشی.[٢٣٨]

لەهەمان کاتدا نزمی ئاستی وشیاری بەلای نەخوێندەواری رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لەوەدا کە خەڵکی ئاوڕ لەتەندروستیان نەدەنەوەو خەڵکانی

---

[٢٣٥] عزیز شەمزینی: جولانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستانی ، سلێمانی، ١٩٩٨، ل١٧١.

[٢٣٦] د. قادر شاڵی: مێژووی تەندروستی‌و کاری پزیشکی لەسلێمانیدا، گـۆڤاری سلێمانی، ژمارە ١٣، ل١٢-١٣.

[٢٣٧] هنری فۆستر: هەمان سەرچاوە ، ل٤٣٣.

[٢٣٨] لونگریك: تأریخ العراق الحدیث: ، ل٤٣: هاشم جواد: هەمان سەرچاوە ، ل١٠١.

کۆنە خوازیش دژی زانستی پزیکشی هاوچەرخ بوونو هانی خەڵکیان دەدا توخنی نەکەون،[٢٣٩] ئەم دیاردەیەش زیاتر بۆ دواکەوتوویی بارودۆخی کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە، سۆن لەم بارەیە باس لەوە دەکات کە چۆن دکتۆرێك روو دەکاتە سلێمانیو پێی وابووە بە حوکمی ئەوەی یەکەم دکتۆرە روو دەکاتە سلێمانی، کە پڕ بووە لەنەخۆشیو دەردوو پەتا، ئیدی بواری پارە کۆکردنەوەی بۆ دەرەخسێت بەڵام دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ بارو بارگەی کۆکردۆتەوەو بەرەو کوردستانی رۆژهەڵات رۆیشتووە.[٢٤٠] هەر ئەمەش وای کردووە سلێمانی لەو بارە ناهەموارەوە دابێت لە رووی تەندروستیەوە هەر لەسەردەمی بابانیەکانەوە دەیان نەخۆشیو پەتای درم رووی تێبکات، کە بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٨٣١ز دا نەخۆشی رشانەوە رووی لەم شارە کردووە خەڵکێکی زۆری کوشتو بە (رشانەوە گەورەکە) ناسرا.[٢٤١]

دوای ئەمجارەش وەك مەلا محەمەدی چروستانی لەیاداشتەکانیدا باسی دەکات، لەساڵی ١٩٠٤-١٩٠٥ دووبارە نەخۆشی رشانەوە تەنگی بەخەڵك هەڵچنیوەو لەنێو شاری سلێمانیدا بۆتە هۆی مردنی زیاتر لە (٧٧٠٠) کەسو خەڵك پێیان وتووە (چاوە قوڵە)، ئەم نەخۆشیە هێندە کوشندە بووە کەس نەیوێراوە (یاسین) لەسەر نەخۆش بخوێنێت لەترسا.[٢٤٢]

ئەم بارودۆخە تا ساڵانێکی درەنگ لەسلێمانیدا گەواهی دواکەووتویی باری تەندروستی بووە، لەو ساڵانەدا (حەکیم)ەکان، پشتاو پشت کاری پزیشکیان بۆ جێماوەو بەگژوگیا خەڵکیان چارەسەرکردووە، کە زۆرجار خەڵکی ناچاربوون شارەو شارو گونداو گوند بۆ دەست گرەوەیەك یا قاچ گرەوەیەك بگەڕێن.[٢٤٣]

---

[٢٣٩] سۆن: هەمان سەرچاوە ، ج٢، ل٤١.

[٢٤٠] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل٢٥٤.

[٢٤١] جەمال بابان، شارە گەشاوەکەم،ب١، ل٤٧.

[٢٤٢] یادداشتەکانی منالی بەشێکی سەردەمی فەقێیەتی مامۆستا مەلا محەمەدی چروستانی: یادداشت، بەغدا، ١٩٨٤، ل٣١-٣٢.

[٢٤٣] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل٥٩.

ئەم حەكیمو پزیشكە میللیانە زیاتر كوردبوون یا جولەكەبوون وەك (عەزەی حەكیم برایم) كە خۆیو ژنەكەی سەرو سەودای پزیشكیان هەبووەو جولەكەبوون، هیچ دكتۆریكی تورك لەسلیمانیدا نەبووە، گەر دكتۆریكی كوردیش هەلكەوتایە ئەوا دەولەتی عوسمانی لینەدەگەران لەشارەكەی خۆیاندا كاربكەن، بۆ نموونە (د. حوسین ئەفەندی باباجان كوری بەدیع ئەفەندی باباجان) كەدكتۆریكی لیهاتوو بووە، دەولەتی عوسمانی كردوویەتی بەدكتۆری سوپاو جاروبار توانیویەتی بگەریتەوە بۆ سلیمانیو چاوی بەنەخۆش بكەویت تا دواجار لەیەكیك لەو سەفەرانەیدا لەسەر ئەسپەكەی دەكەویتە خوارەوەو دەمریت،[244] ئەمەش ئەو راستیەمان بۆ دەردەخات كە حكومەتی عوسمانی نەك هەر خۆی لای لەباری تەندروستی خەلك نەكردۆتەوە، بەلكو بۆتە بارگرانیش بەسەر خەلكەوە. مس بیل لەم بارەیەوە دەلیت " لەرۆژگاری حوكمرانی توركی عوسمانیدا فەرمانگەی شارەوانی لەهەموو گوندو قەزاو ناحیەكاندا دامەزرابوو كە بەرچاوترین مەبەستی ئەم فەرمانگانە چاودیریكردنی كاروباری تەندروستیو پاك راگرتنی شاربوو، جگە لەپاسەوانیو رووناك كردنەوەی كوچەو كۆنەلانەكان، بەلام لەراستیدا ببوون بە ئامرازیك بۆ كۆكردنەوەی پارەو موچەی بەریوەبەرو فەرمانبەرانو هەروەها پاشەكەوت كردنی بریك پارە بۆ مەبەستی خەرج كردنی لەمیوانداریو هاتو چۆی فەرمانبەراندا.[245]

مس بیل هەر لەدریژەی قسەكانیدا باس لەوە دەكات كە چۆن مەلاریا لەنیوچە شاخاویەكاندا پرزەی لەخەلك بریوەو حكومەتی عوسمانیش دەستە پاچە وەستاوە لەئاست ئەو گرفتە ئالۆزەداو هیچ هەنگاویك نانیت بۆ بەرگرتن لەم نەهامەتیە، ئەوە نەبیت هەندیك جار بریك (ئەلیكنین)ی بەخۆرایی بەسەر دانیشتواندا دابەش كردووە وەك هەنگاویك بۆ خۆپاریزیو چارەسەركردن.[246]

---

[244] سەرچاوەی پیشوو، ل٥٩

[245] فصول من تاریخ العراق القریب ، ل١٢٦.

[246] سەرچاوەی پیشوو، ل٨٥.

سالنامەکانی دەولەتی عوسمانی زۆر بەروونی ئەم راستیانە دەسەلمینن، تەنانەت لەهیچ سالنامەیەکی ویلایەتی موسلدا باس لەخزمەتگوزاری تەندروستی نەکراوە کە لەسلیمانیدا ئەنجام درابیت تەنها لەسالنامەکانی، سالانی، (١٩١١-١٩١٢). دانەبیت ئاماژەیەکی سەرپیی کراوە بۆ تەنها خەستەخانەیەك لەشاری سلیمانیدا، ئەگینا بەهیچ شیوەیەك باس لەپەیروکردنی تاکە شیوازیکی تەندروستیش ناکات لەم شارەدا.[٢٤٧]

لەسالانی جەنگی یەکەمی جیهانی، دەولەتی عوسمانی تەواو شپرزە ببوو، شیرازەی کاروباری ئیمپراتۆریەتەکە تیك چوو بوو، کە ئەم حالەتەش رەنگدانەوەیەکی دوو چەندانەی دەبیت بۆ سەر باری تەندروستی خەلك شاری سلیمانی لەرۆژگاری جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەحوکمی ئەو بارە ناهەموارەی ولاتەکەو برسیتیو سەرماو سۆلەدا هیندەی دیکە نەخۆشیو پەتا رووی تیکردبوو، حکومەت دوای ئەوەی مەکتەبی روشدیەی عەسکەری داخست بوو، بینای مەکتەبەکەی لەسالانی جەنگدا کردبوو بەخەستەخانە،[٢٤٨] بەلام هیچ سەرچاوەیەك ئاماژە بەخزمەتگوزاری ئەو خەستەخانەیە ناکات، ئەحمەد خواجە لەم بارەیەوە دەنوسیت " لەسالانی جەنگی جیهانی یەکەمدا هەناسەی خۆشی نەما، هەموو چەشنە پەتایەك ولاتی داگیرکرد، دەرمانو پزیشكو چارەسەر نەبوو"[٢٤٩] ئاشکرایە دوای کۆتایی هەمان جەنگ، تەنها سێیەکی دانشتوانی شارەکە لەمردن رزگاریان ببوو، ئەمە جگە لەوەی، کە پیسیو ویرانی ئەم ولاتە بۆخۆی هۆکاریکی نەخۆشیو دەردو پەتا بوو، تەنانەت تا سالی ١٩٢٦ هیچ شیوو چالو زیرابیکی سلیمانی سەری نەگیرابوو، لەم میژووە بەدواوە شارەوانی دەستی کرد بەداپۆشینی ئاوو ئاوەرۆکانی ناو شار.[٢٥٠] دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، شاری سلیمانی لەخراپترین بارودۆخدابوو، کاتیك ئینگلیزەکان روویان کردە ئەم شارە هیشتا

---

[٢٤٧] عبد الفتاح علي يحي: سالنامات، ل٥٤.

[٢٤٨] قادر شالي: هەمان سەرچاوە ، ل١٢-١٣.

[٢٤٩] چیم دی، ب١، ل٨.

[٢٥٠] ئەکرەمی سالحی رەشە: هەمان سەرچاوە ، ب١، ل٢٩٧.

لاشەی مردوو لەسەر شەقامەکان مابوو،[251] بەڵام ویّڕای ئەوەش ئینگلیزەکان ئاوڕی بەرچاویان لەم لایەنە نەداوە، ئەوە نەبێت هەنگاوی زۆریان نا، کە دەچوونە خانەی خۆپاریزی و چارەسەری تەندروستیەوە، هەر لە دابین کردنی خۆراك و نەهێشتنی برسیەتی و پاك کردنەوەی شارو ڕێکخستنەوەی، تەنانەت کاتێك نۆئیل گەیشتە سلێمانی یەکێك لەهاوەڵەکانی دکتۆر بوو، هەر بۆیە ئینگلیزەکان لەگەڵ هاتنیاندا کەوتنە کۆکردنەوەی ئەو دەلاکانەی بەکاری پزیشکی خەریك بوون و خەڵکیان چارەسەر دەکرد، ئەو کاتە ئینگلیزەکان ڕەوانەی بەغدایان دەکردن و لەژێر چاودێری دکتۆرە ئینگلیزەکاندا تاقی دەکرانەوەو مولەتی ڕەسمیان پێدەدرا،[252] جگە لەوەی لەگەڵ هاتنی خۆشیاندا چەند دکتۆرێکیان هێناو بینای مەکتەبی ڕوشدیەی سەربازیان وەك خەستەخانە هێشتەوەو تا ساڵانێکی درەنگ خەڵکی ئەم شارە لەگەڵ ئەو پزیشکە ئنگلیزانەدا کاریان دەکردوو ژمارەیەکی زۆریان بەشداری خولی پزیشکیان دەکردوو مۆڵەتیان وەر دەگرت.[253]

خەڵکی هێندە هەستیان بەکەم تەرخەرمی کردبوو، تاماوەیەکی زۆریش دوای هاتنی ئینگلیزەکان، هێندە بە پیر نەخۆشخانەوە نەدەچوون چونکە دڵنیا نەبوون لەوەی وەك پێویست سودی هەبێت، چونکە هێشتا بەچاوی ڕۆژگاری دەسەڵاتی عوسمانی لەم داموو دەزگا پزیشکیانەیان دەڕوانی، (سندرسن پاشای) پزیشکی تایبەتی شا فەیسەڵ، باس لەوە دەکات کە نێوچەکانی کوردستان لەهەموو شوێنێك زیاتر پێویستیان بەچاودێری پزیشکی و تەندروستی هەیە، هەر بۆیە دڵ خۆشی خۆی دەردەبڕێت بەوەی یەکەم خوێندکاری کوردی خەڵکی سلێمانی لەکۆلیچی پزیشکی بەغدا وەرگیراوە.[254] هەرچەندە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد سلێمانی لەدوای جەنگی جیهانی تا ئەندازەیەك بەرەو باشتربوونی دۆخی تەندروستی

---

[251] ئەدموندز: کوردو ترك و عرب، ل٧٩.

[252] چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی سەید خدر: گۆڤاری سلێمانی، ژمارە ١٢، ل٣٠.

[253] قادر شالی: هەمان سەرچاوە ، ل١٢-١٣.

[254] مذکرات سندرسن پاشا: ترجمة سلیم طه تکریتي، ط٢، بغداد ١٩٨٢، ل٣٩.

هەنگاوی نا، بەڵام ئەو نەخۆشیە درمو نیشتەجێیانەی خەڵکی ئاشنایان ببوون وازوو بەرۆکیان بەرنەدان، هەر بۆ نموونە تا ساڵانی حوکمی راستەوخۆی ئینگلیزیش، هەر لەبرەو دابوون، کە زۆر بەروونی لەچاپنامەکانی سەر لاپەڕەکانی رۆژنامەی پێشکەوتنیدا بەرچاو دەکەون رۆژنامەی نێوبراو لەژمارە (٩٦)یدا خەڵکی ئاگادار دەکاتەوە کە نەخۆشی ئاوڵە لەدەوروبەری شاری قەڵادزێ و رانیە بڵاوبۆتەوەو بۆتە هۆی مردنی چەند کەسێك، هەر بۆیە داوا لەدانیشتوانی سلێمانی دەکات کە بەپیر بانگەوازی خۆکوتانەوە بچن کە رۆژانە بەخۆرایی ئەنجام دەدرێت، بەڵام لەژمارە (٩٧)ی هەمان هەفتەنامەدا، هەواڵی ئەوە بڵاوکراوەتەوە کە ئەو نەخۆشیە تەنیوەتەوە بۆ نێو شاری سلێمانی و گلەیی لەدانیشتوانی شارەکە دەکات کە وەك پێویست نەچوون بەپیر بانگەوازی خۆکوتانەوەو دووبارە داوایان لێدەکات کە خۆیان بکوتن، بەڵام بەهۆی نزمی ئاستی هۆشیاری تەندروستیەوە، خەڵکێکی کەم بەپیر ئەو بانگەوازەوە دەچن، تەنانەت بۆ جاری سێهەم لەژمارە (٩٩)ی پێشکەوتندا خەڵکی لەوە ئاگادار دەکەنەوە کە ئەم نەخۆشیە لەسلێمانیدا زۆر تەشەنەی سەندووە، بەڵام لەتێکڕای (١٥) هەزار کەسی تەنها (٥٠٠-٦٠٠) کەس خۆیان کوتاوە.[٢٥٥]

هەڵوەستە کردن لەئاست نێوەڕۆکی ئەم بانگەوازو هەواڵانەی هەفتەنامەی (پێشکەوتن) ئەو راستیەمان بۆ روون دەکاتەوە کە هێشتا دانیشتوانی سلێمانی ژیانیان لەمەترسیدایەو وەك پێویستیش لەگرنگی ئەو هەنگاوە خۆپارێزیانە نەگەیشتون و لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە دواکەوتوون.

چارەسەری ئەم بارەش هێندە ئاسان نەبووە و زووش ئەنجام نەدراوە، تا ساڵانێکی درەنگ سلێمانی بەدەست خراپی و ناهەمواری باری تەندروستیەوە گرفتار بووە، هەر ئەم حاڵەتەش وای لەئەمین زەکی بەگ

---

[٢٥٥] رۆژنامەی پێشکەوتن، ژمارە ٩٦، ٢٣/شوبات/١٩٢٢، ل٤.
رۆژنامەی پێشکەوتن، ژمارە ٩٧، ٢/ئازار/١٩٢٢، ل٦.
رۆژنامەی پێشکەوتن، ژمارە ٩٩ /١٦ئازار/١٩٢٢، ل٥.

کردووە بڵێت " نەبوونی تەشکیلاتی صحییە موسیبەتێکی گەورە بوو". [256] لەکاتێکدا ئاشکرایە کە هیچ دەسکەوت و خزمەتگوزاریەك هێندەی خزمەتگوزاری تەندروستی بەلای دانیشتوانەوە مایەی دڵ خۆشی نیە، کە حکومەت بۆیان دەستەبەر بکات، کە بێگومان بەر ئەنجامی سیاسی بەرچاویشی لێدەکەوێتەوە، گەر بێتو وەك پێویست لای لێ بکرێتەوەو پشت گوێ نەخرێت، [257]

لەهەمان کاتدا هەوڵی چاککردنی باری ئابوری و بژێوی دانیشتوانی گەورەترین رەنگدانەوە دەبێت بۆ سەر باری تەندروستی، خەڵکی وێڕای، بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری خەڵك و نەهێشتنی نەریتە کۆمەڵایەتیە دواکەوتووەکان و، دابین کردنی ئاوی پاك بۆ خواردنەوەو گرنگی دان بەچاك کردنەوەی شارو نەهێشتنی فاکتەرەکانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، کە بەدەوام شاری سلێمانی لەم رووەوە بە بەراورد لەگەڵ سەرجەم شارەکانی دیکەداکەمترین گرنگی پێدراوەو رێژەی خزمەتگوزاری تەندروستی و خەستەخانەو پزیشك و دەرمانخانەی لەهەموان کەمتر بووە. [258]

---

[256] موحاسەبەی نیابەت، بغداد، ١٩٢٨، ل٧.

[257] مس بیل: هەمان سەرچاوە ، ل٨٥.

[258] د. شاکر خصباك: العراق الشمالي، ل٢٦٤، ٢٦٥، ٢٦٦.

# بەشی دووەم
# سلێمانی لە ڕۆژگاری حوکمڕانی ئینگلیزدا(١٩١٨-١٩٢٢)

باسی یەکەم: سلێمانی و هاتنی ئینگلیز.

باسی دووەم:سلێمانی لەسەردەمی یەکەمین حوکمداریەتی شێخ مەحموددا.

باسی سێیەم : دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لە سلێمانیدا

## باسی یەکەم:
## هاتنی ئینگلیز بۆ سلێمانی

هاتنی ئینگلیز بەرەو کوردستانی باشوور بەگشتی و شاری سلێمانی بەتایبەتی پێشینەیەکی مێژوویی کۆنی هەیە، ئینگلیزەکان سالانێکی زۆر بەر لەجەنگی یەکەمی جیهانی سەرجەم نێوچەی کەنداویان بەنێوچەکانی نێو بازنەی دەسەلاتی دەریایی خۆیان لەقەڵەم دەدا، بەردەوام چاودێری وردی ئەو هەرێمەیان دەکردو لەهەلێك دەگەڕان زیاتر شوێن پێی خۆیان بە درێژایی کەنارەکانی کەنداو قایم بکەن، تەنانەت لەسەردەمی دەسەلاتی شا ئیسماعیلی سەفەویداو لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمی زاینیدا، بەریتانیا هەولی ئەوەی دەدا شوێن بە پورتوگالیەکان لەق بکات و خۆیان بچنە شوێنیان.[1]

هەر بۆیە لەسەردەمانێکی زووەوە دەسەلاتی بەریتانیا گەیشتبووە کەنداو تا دەهات دەسەلاتیان فراوانتریش دەبوو، بەتایبەت دوای ئەوەی سالی ١٦٠٠ بەریتانیا "کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی" پێك هێنا، هێندەی دی لەم نێوچەیە نزیك بۆوەو بەهاوکاری ئێرانیەکان سالی (١٦٢٢) ز دەستیان بەسەر گەروی (هورمز)و گرت و لەدەست پورتوگالییەکانی دەرهێنا، کە ئەم کارە بەیەکەم هەنگاوی ئاشکرای ئینگلیزەکان دەژمێردرێت بەمەبەستی وەدەست هێنانی بارێکی سیاسی بۆ خۆی لەکەنداوداو دواتریش هەولێکی رێگە خۆشکەر بوو بۆ دەست گرتن بەسەر ئێران وسێ ویلایەتەکەی دەولەتی عوسمانیدا.[2] ( سێرپێرسی کۆکس) زۆر بەئاشکرایی لەو لێکۆلنیەوەیەیدا کە لەبەردەم ئەندامانی کۆمەڵەی، مەلەکی ئاسیایدا خوێندییەوە ئاماژە بەویستی بەریتانیا دەکات و دەڵێت " لەوکاتانەدا کە تادەهات بەرژەوەندییەکانی، لەنێوچەکەدا پەرەی دەسەندو گرنگتر دەبوو، بە ئەندازەیەك هەنگاوێکی هەرە لەپێشی سیاسەتی ئێمە ئەوەبوو کە بوار بەهیچ هێزێکی ئەوروپی نەدەین،

---

[1] منذر الموصلي: الحياة السياسية والحزبية في كوردستان، لندن، ١٩٩١، ل١٣٨.

[2] هنری فوستر: هەمان سە رچاوە، ل٥٥-٥٦.

شوێن پێیەك لە سەر دەروازەی كەنداو بۆخۆی داگیربكات ".[٣] سەبارەت بە وسێ ویلایەتەی ژێر دەسەلاَتی دەوڵەتیعوسمانی ، ئەوا هەر دوابەدوای هەڵكەندنی نۆكەندی سوێس هێندەی دیكە بایەخیان لەدیدی بەریتانیادا زیاتر بوو، بەتایبەت كە بەریتانیا دواتر توانی ئیمتیازێك بۆ كۆمپانیای (ستیڤن لینج) بەمەبەستی دەریاوانی بەدەست بهێنێت.[٤]

لەو سەردەمەدا، دوای فراوانبوونی كۆمپانیای هیندی رۆژهەلاَتو پەرەسەندنی چالاكی بازرگانی بەریتانیا، كۆمپانیای نێوبراو گەورەترین رۆڵی لەهەڵسووراندنی سیاسەتی بەریتانیادا دەگێڕا لەناوچەكەداو ببووە گەورەترینو چالاكترین مەكۆی سیخوری و هەواڵگریو بەشێكی زۆری كردەی بازرگانی ئەم كۆمپانیایە. لەراستیدا روپۆشێك بوو بۆ هەوڵی دەست بەسەراگرتنی نێوچەكە، ئەم هەنگاوانەشی بە رێگای دزەكردن بۆ نێو بازاڕەكانی ئێران دەستی پێكرد ،[٥] هەر لەوكاتانەدا كە هێشتا ئەم سێ ویلایەتەی ژێر دەسەلاَتی دەوڵەتی عوسمانی لەنێوەندە رامیاریەكانی بەریتانیادا بە "میزۆپۆتامیا" ناسرابوو، سیاسەتمەدارانی ئەو ولاَتە چاویان بریبووە نێوچە كوردنشینەكانی نێو قەڵمڕەوی ئێرانو دەوڵەتی عوسمانیو هەر لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەوە گرنیەكی تایبەتیان بەكوردستان دەداو پیاوانی كۆمپانیای هیندی رۆژهەلاَت هەر جارە بەناوێكەوە لەنێوچە كوردیەكاندا دەگەڕان . بۆ نموونە لەساڵی ١٨٥٧ دا دكتۆرێكی سەر بەم كۆمپانیایە، بەرێگای كەركوكدا تا ناوچەی ماردین چوو دوابەدوای ئەوەش چەند فەرمانبەرێكی دیكەی ئەم كۆمپانیایە رووەو چەند ناوچەیەكی دیكەی كوردستان دەستیان بەگەشتو گەڕان كرد، لەوانە د. كامپیل وت. هاول،[٦] دواتریش هەم لەدرێژەی ئەم هەنگاوانەی بەریتانیادا، وەك پیشەی

---

[٣] فؤاد القزانچي: العراق في الوثائق البريطانية، ١٩٠٥-١٩٣٠، بغداد، ١٩٨٩، ل٢١-٢٢
[٤] احمد رفيق البرقاوي: العلاقات السياسية بين العراق وبريطانيا، ١٩٢٢-١٩٢٣، بغداد، ١٩٨٠، ل١٣.
[٥] د. كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات، ل٣٣.
[٦] د. كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات، ل٣٣.

بەردەوامیان كەلەسەرەتادا بەنێوی ئاینەوەو پاشانیش بە گەشت و گەڕانەوە روو لەولاتان دەكەن، تا لەدوا ئەنجامدا دەگەنە مەبەستی راستەقینەی خۆیان، كە داگیركردنی ولاتەكەیە، ئەمجارە نوێنەری كۆمپانیای هیندی رۆژهەلات لەبەغداد، كلۆدیوس جیمس ریچ لە سالی ۱۸۲۰، رووی كردە نێوچەكانی سلێمانی لەسەر بانگهێشتی مەحمود پاشای بابان ماوەی چوار مانگ لەهەرێمەكانی نێو قەلەمڕەوی هەردوو میرنشینی بابان و ئەردەلاندا مایەوەو لەنزیكەوە پەیوەندیی لەگەل هەندێك لەسەرۆكە ناسراوەكانی كوردا بەست، بەتایبەت لە (سلێمانی و سنە) و بۆ یەكەم جار نەخشەی چەند ناوچەیەكی كوردستانی كێشا، دوای ریچ، گەشتیارێكی دیكە لەسالی ۱۸۳۰ بەنێوی (مینیان) سەردانی سلێمانی كردو ماوەیەك لای سلێمان پاشای بابان مایەوە. پاشان لەسالی ۱۸۳٤ دا (جیمس بیلی فرایزر) گەشتە بەنێو بانگەكەی خۆی كرد بۆ كوردستان و بەهەمان شێوە، ماوەیەك لەسلێمانی لایداو بەدرێژیی باسی بارودۆخی ناهەمواری ئەم شارە دەكات، جگە لەمانەش لە لەسالی ۱۸۳۷ دا (ئینزە رۆس) سەردانی سلێمانی كردووەو بە هەمان شێوە باس لەمیوانداریتی و دلفراوانی سلێمان پاشای بابان دەكات و ستایشێكی باشی هێزی سەربازی ئەم میرنشینە دەكات.

لەدوا سالەكانی حوكمڕانی میرنیشنی بابانیشدا (فلیكس جۆنز) رایەكی بێ وێنەی سەبارەت بە ئەحمەد پاشای بابان و هێزی سەربازی ئەم میرە تۆماركردووەو و دەلێت " ئەحمەد پاشای بابان دوای تێپەڕبوونی تەنها سالێك بەسەر دەسەلات گرتنە دەستیدا، توانی هێزێكی سەربازی باش رێكبخات و لەسەر شێوازی ئەورووپایی مەشقی پێ بكات "[۷]

لێرەدا ئەو راستیەمان بۆ ئاشكرا دەبێت كە ئینگلیزەكان بێ جیاوازی كردن، لەسەردەمانێكی زووەوە هەولیان داوە پەیوەندی بەگەلانی ناتوركی نێو چوارچێوەی دەولەتی عوسمانی بكەن،وەك چۆن گرنگییان بەعەرەب و ئەرمەنی دەدا، بەهەمان شێوەش داویانە بە گەلی كوردیش ، هەر بۆیە تا

---

[۷] نەدموۆندز: هەمان سەرچاوە، ل٥٦-٥٧؛ د. كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات، ل٣٣-٣٤.

دەهات زیاتر جموجۆڵیان لە نێوچەکانی کوردستاندا پەیدا دەکردوو، بەنزیك بوونەوەی سەدەی بیستەم زیاتر لەجاران دەکەوتنە خەمی کوردستان و زیاتر مەبەستیان روون دەبۆوە. فاکتەری راستەقینەی ئەم گرنگیپێدانە لە ئەندازە بەدەرەش بۆ دۆزینەوەی نەوت دەگەڕێتەوە لەکوردستاندا، هەروەها گرنگی پێدانی بێ ئەندازەی بەریتانیا بە میزیۆپۆتامیا بۆ ئەوەدەگەڕایەوە کە بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدا بوون ئەم وڵاتە بکەن بە بنکەیەك و لەوێوە دەسەڵاتی خۆیان بگوێزنەوە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دوورو لەهەمان کاتیشدا پارێزگاری لەو بەرژەوەندیانەیان بکەن،[8] هەر بۆیە بەریتانیا بەر لەهەڵایسانی جەنگی جیهانی یەکەم کەوتبووە خۆ ئامادەکردن و پلان دانان بۆ داگیرکردنی میزویۆتامیا.[9] ئەم راستەیش زۆر بەڕوون و ئاشکرایی لەو رایەی، (لۆرد کیرزۆن) دا ئاشکرا دەبێت کە لەساڵی ١٩١١ دا لەبەردەم ئەنجومەنی لۆردانی بەریتانیادا دەری بڕی و وتی "هەڵەیەکی گەورەیە گەر وابزانرێت بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا تەنها لەنێوچەی کەنداودا قەتیسە، یا لەنێوچەکانی نێوان بەغداو بەسرەدا کۆتایی دێت، بەڵکو زۆر لەوە دوورتر تێپەڕ دەبێت" کە بێگومان لێرەدا مەبەستی (ویلایەتی موسڵ)ە کە (کوردستانیعێراقی ) ئەمڕۆیە، ئاشکرایە کوردستان لەنەخشەی سیاسەتی بەریتانیادا شوێنێکی دیارو بەرچاوی هەبووە، هەر چەندە کوردستانی باشوو زیاتر مایەی گرنگی پێدان بوو لای بەریتانیا لە چاو پارچەکانی دیکەی کوردستانەوە.[10]

کرۆکی سیاسەتی بەریتانیا لەئاست میزۆپۆتامیادا بەشێوەیەکی گشتی بریتی بوو لەداگیرکردنی ناوچەکە، بەڵام سەبارەت بەپیادەکردن و گرتنە بەری باشترین شێواز بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە لەنێو سیاسەتمەدارانی

---

[8] حامد محمود عیسی، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، قاهرة، ١٩٩٢، ل٣٠.

[9] احمد رفيق البرقاوي: هەمان سەرچاوە، ل١٤.

[10] د. کمال مظهر احمد: کردستان في سنوات، ل٣٨-٤٠.

بەریتانیادا بۆچوونی جیاواز هەبوو ،[11] ئیدی مەسەلەی پاشەرۆژی ئەو سێ ویلایەتە لەنێوەندە سیاسی و پەرلەمانیەکانی بەریتانیادا پانتاییەکی فراوانی داگیرکردبوو چونکە عێراق هەرێمێکی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی بوو.[12]

لەبەر ئەوە بەریتانیا هەلایسانی جەنگی یەکەمی جیهانیی بە باشترین هەل زانی بۆ داگیرکردنی میزۆپۆتامیا، بەتایبەتی دوای ئەوەی دەولەتی عوسمانی چووە پاڵ ئەلمانیاو ولاتانی بەرەی ناوەند، ئیدی بەریتانیا دوای مشتومڕێکی زۆری نێوان کەناڵە جیاوازیەکانی سیاسەتی ئەو ولاتە، بەتایبەت هەردوو قوتابخانەی هندی- ئینگلیزی و میسری- ئینگلیزی، بڕیاری راگەیاندنی جەنگی‌دا دژ بەدەولەتی عوسمانی و هێزێکی گەورەی بەریتانیا بەسەرکردایەتی جەنڕال (دیلامین) لەهندستانەوە بەرەو کەنارەکانی کەنداو کشاو لەرێکەوتی ١٩١٤/١١/٦ دا شارۆچکەی (فاو)ی گرت.[13]

بەم شێوەیە بەریتانیا پەیتا پەیتا پێشڕەوی دەکردو لەهەولی ئەوەدابوو هێندەی لەتوانایدایە زیاتر بەنێو قولایی میزۆپۆتامیادا بێتە پێشەوە، هەرچەندە تا ئەو کاتەش کە لەگەرمەی هێرش کرندا بوو، سیاسەتێکی روون و ئاشکرای نەبوو لەئاستیدا، بەلام (ئارثە ر هرتزل) لەحکومەتی هیند یەکەم سیاسەتمەداری ئینگلیزبوو کە هەولی دارشتنی سیاسەتێکی بەریتانی داوە لەو ، ولاتەدا، ئەوەش لەو بیرخەرەوەیەدا کە لە ١٤ی‌ئازاری١٩١٥ دا پێشکەشی دەکات و لەوێدا بەدرێژی باسی‌لە دوا رۆژی میزۆپۆتامیا کردووە.[14] بەریتانیا سوور بوو لەسەر کۆنترۆڵکردنی عێراق، بۆیە دوای

[11] جلال الطالباني: كردستان والحركة القومية الكردية، ط٢، بيروت، ١٩٧١، ل٢٠٥.

[12] لونگريك: تاريخ العراق الحديث، ل١٦٨.

[13] احمد رفيق البرقاوى: هەمان سەرچاوە ،ل١٤.

[14] د. حامد محمود عيسى: هەمان سەرچاوە، ل٣١.

ئـــەوەی (٩٨) هـــەزار قوربـــانی دا، توانـــی لـــەمانگی ئـــازاری ١٩١٧ دا بەسەرکردایەتی جەنراڵ (مۆد) شاری بەغدا داگیر بکات.[١٥]

بـەڵام وەك پێشـتر ئاماژەمـان پێکـرد ویسـتەکانی بـەریتانیا تەنـها لـە سنووری بەغدادا کۆتاییان نەدەهات. کاتێك مۆد گەیشتە بەغدا، ڕاگەیاندنێکی بەناوبانگی بڵاوکردەوەو ئـەوەی تێـدا ئاشـکرا کـرد کـە ئـەوان وەك داگیرکـەر ڕوویـان نەکردۆتـە ئـەم وڵاتـە، بـەڵکو وەك ڕزگارکـەرێك بـەهانای گـەلانی ژێـر دەسەڵاتی عوسمانییەوە هاتوون.[١٦]

بێگومـان لەگەڵ گەیشتنی سوپای بەریتانی بە عێراق گەلـەك لـەپیاوانی نـــاوداری عـــەرەب پـــەیوەندییان لەگـــەڵ ســـەرکردە ســـەربازییەکان و سیاسەتمەدارانی بەریتانیادا بەستبوو بەنیازی ڕزگـاربوون لـەژێر دەسـەڵاتی عوسمانی. بۆ ئەم مەبەستەش پێشوازی زۆریان لەو هێزانە کردبوو وە ڕێزێکی زۆریـان لێنابوون و خۆشحاڵی خۆشیان دەربڕیبوو بە هاتنیـان.[١٧] هەرچـەندە حکومەتی عوسمانی بانگەوازی (جهاد)یشی ڕاگەیاندبوو بەلام کاردانەوەیـەکی بـەرچاوی نـەبوو، لـێرەدا وەك ئاشـکرایە ژمارەیـەکی زۆر لەچـەکدارانی کـورد بەڕابەڕایـەتی (شـێخ مـەحمودی بەرزنجی) هاوشانی سوپای عوسمـانی دژ بـە ئینگلیزەکان جەنگابوون لەشەڕی (شوعەیبە)دا، دواتریش لەبەرەی (پێنجوێن) دژ بەســوپای ڕووس جـــەنگابوون، بـــەڵام لەهـــەردووجاردا دەســـەڵاتدارانی عوسمـانی هێنـدە کـاری ناشایستەیان دژ بـە شـێخ مـەحمودو چەکدارەکانی نواندبوو، ئیدی شێخ و هاوەڵـەکانی بڕیـاری خۆیـان دابـوو، محەمـەد ڕەسـول هاوار لەزاری تۆفیق وەهبی دەگێڕێتەوە، کە کاتێك سوپای عوسمانی لەشـەڕی شـوعەیبەدا بـەو شـێوەیە شـکا، سـوپاکەی شـێخ مـەحمود لەگەڕانـەوەیدا لـە (ناسریە) لای دابـوو، عـیزەتی تۆپچـی کـە خـۆی لەگـەڵ شـێخ مـەحمودا لـەو شـەڕەدا بەشـدار ببـوو، ئـەوەی گـێڕابووەوە کـە بـەئامادەبوونی خـودی شـێخ

---

[١٥] کمال مجید: النفط والاكراد، لندن، ١٩٩٧، ل١٣.

[١٦] السيد عبدالرزاق الحسيني: تأريخ العراق السياسي الحديث، ج١،ط٧، بغداد، ١٩٨٩، ل٤٢

[١٧] م. س لازاريف و اخرون : الحركة الكردية في عصر الحديث، ل١١٩.

لەناسریە باسیان لەوە کردووە لیژنەیەك پێك بهێنن بۆ ئەوەی پەیوەندی بە ئینگلیزەوە بکات، بە ئومێدی ئەوە کە گەیشتنە کوردستان گەلی کورد پشت گوێ نەخەن و مافی میللەتی کوردیش لەبەرچاو بگرن. بۆیە لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون نامەیەك بنێرن بۆ ئینگلیزەکان و عیزەت نامەکە بنووسێت و لەرێگەی یەکێك لەو کوردانەی خەڵکی سلێمانی کە ماوەیەك بوو لەناسریە دەژیا، بیگەیەننە دەست ئینگلیزەکان.[18]

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە شێخ مەحموودو هاوەڵانی هەر لەسەرتاوە خۆیان یەکلاکردۆتەوەو بریاری پەیوەندی کردنیان داوە بەهێزەکانی بەریتانیا. کاتێکیش شێخ مەحمود لەناوچەی پێنجوێن بەشداری شەڕی روسیای دەکرد شان بەشانی عوسمانی وەك شێخ مەحمود خۆی لێی دوواوە، لەسەر ئەو بنەمایە بووە کە دوای کۆتایی هاتنی شەڕ تورکەکان مافی گەلی کورد بدەن، بەلام تورك هەر هەمان هەڵس و کەوتی جارانی نواند.[19] بۆیە شێخ مەحمود لەگەرمەی ئەو شەڕەدا گەورە پیاوانی نێو چەکدارەکانی خۆی کۆکردۆتەوەو پێی وتون "چارتان لێیە چ ناپیاویەکیان لەگەل کوردا کرد ئیتر بەسیەتی لەوە زیاتر خۆم پێ ناگیرێ پێویستە کورد لەبرسیەتی و سەر شۆرشکردن بۆ تورکەکان رزگار بکەین، ئەبێ هەموومان هەوڵ بدەین سەربەخۆیی بۆ کورد مسۆگەر بکەین".[20]

ئەمەش باشترین گەواهیە کە شێخ مەحمود، لای خۆیەوە لەمێژبووە بەرنامەی دارشتووە کە بەچ مەبەستێك لەگەل دەوروبەریدا مامەڵە بکات. وەك د. کەمال مەزهەر باسی لێوە دەکات شێخ مەحمود بەر لە هەلایسانی جەنگی جیهانی، بەغداو موسل پەیوەندیی بە ئینگلیزەکانەوە کردووە[21] ئینگلیزیش ئەو رزگارە هێندەی بۆی کرابێت هەولی داوە سوود لە کردەوەو رەفتارەکانی

[18] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ل٢٤٦.

[19] یادداشتەکانی شێخ لەتیف حەفید،ل٣١.

[20] رەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل٢٥٠.

[21] د.کمال مظهر احمد : وثائق وحقائق عن حرکات الشیخ محمود،جریدة التاخي: ژمارە (١٤٥٤)، ١٩٧٢/١٠/٨.

عوسمانیەکان رابگرێت، و بەهۆیەوە گەلانی ناتورک لەدژی ئەو حکومەتە هان بدات. بەتایبەتی باس کردنی سەربەخۆیی و ئازادی لەهەموو دەستەواژەیەك زیاتر دووبارە کراوەتەوەو کاریگەری زۆری لەسەر کورد هەبووە. لوید جۆرجی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا دەڵێت " ئێمە دەمان زانی باسی ئازادی وەك یەکێ لەمەبەستەکانمان یاریدەمان دەدات بۆ تێك دانی شیرازەی یەکێتی وڵاتە ناحەزەکانمان لەوەشدا بەهەڵە نەچووین"[۲۲]، چونکە پڕوپاگندە لەساڵانی جەنگی جیهانی یەکەمدا رۆڵی زۆر لەجاران زیاتر بوو، بۆیە ئینگلیزەکان بایەخێکی زۆریان بەم مەسەلەیەدا. لوید جۆرج لەم بارەیەوە دەڵێت "زانیمان دەتوانین توانای دوژمن لەرێگەی کەڵك وەرگرتن لەناڕەزایی گەلانی ژێر دەستیەوە هەڵتەکێنین، هەر بۆ نموونە سەدان ساڵی چەوساندنەوە ژیانی پێکەوەی عەرەب و تورکی کردبووە مەحاڵ".[۲۳]

ئەم قسەیەی لوید جۆرج، پەرۆشی ئینگلیز دەخاتە روو کە چەندیان مەبەست بووە گەلانی نێو چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی بەلای خۆیاندا بەکێش بکەن، گەلی کوردیش یەکێك بوو لەگەلانی نێو ئەو دەوڵەتە.

سوپای ئینگلیز لەگەڵ داگیرکردنی بەغدادا کەوتە هەوڵ و تەقەلای ئەوەی کە بەهەر شێوەیەك بێت خۆیان لەکورد نزیك بخەنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش، لەیەکەم تەقەللایاندا سەرەتای ساڵی ۱۹۱۸ کەوتنە دەرکردنی رۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) کە ئەم رۆژنامەیە بەسەرپەرشتی و چاودێری مێجەرسۆن دەردەچوو، بەهاوکاری شوکری فەزلی شاعیر کە هەموو هەوڵێکی دروست کردنی پەیوەندی بوو لەنێوان سەرۆکە کوردەکان و بەریتانیادا، و بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم ژمارەکانی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردبوو.[۲٤]

دوا بەدوای براندنەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی لەباشووری کوردستانیشدا، شاری سلێمانی وەك شارێکی دیار و بەرچاوی باشووری

---

[۲۲] تێگەیشتنی راستی، ل۹۹-۱۰۰.

[۲۳] سەرچاوەی پێشوو، ل۹۹-۱۰۰.

[۲٤] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: تێگەیشتنی راستی، ل۱۱۷.

کوردستان یەکجار بایەخی پەیدا کردبوو،[٢٥] بەتایبەتی بەحوکمی توانـاو دەسەلاتی شێخ مەحمود و لەو شارەدا. ئینگلیزەکانیش ئەم راستیەیان باش دەزانی، بۆیە هەوڵی ئەوەیان دەدا خۆیان لەشێخ مەحمودی نزیك بکەنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش تێگەیشتنی راستی لەژمارە یەکیدا، ناودارانی کورد دەژمێرێت و لە شێخانەوە دەست پێدەکات و زۆرتریش بەشان و باهویاندا هەڵدەدات و دەڵێت " شێخان لەهەموو کوردستاندا شۆڕەتی ئازایەتییان هەیەو هیچ وەختێ لەحکومەتی تورك نەترساون" و داوایان لێدەکات سلێمانی و دەوروبەری رزگار بکەن لەدەست تورکان، ئەمە جگە لەوە، هەر هەمان رۆژنامە بەردەوام هەوڵی داوە باوەڕی ئەوە لای کورد دروست بکات کە چارەسەری گرفتەکانیان لای ئینگلیزە، بۆیە هەقە کوردیش وەك عەرەب پشت بە ئینگلیز ببەستن، تەنانەت تێگەیشتنی راستی زۆر بەگەرمی باس لەوە دەکات کە حکومەتی بەریتانیا چەند کوردی خۆشدەوێت و دەڵێت:- "ئینگلیزەکان لەهەموو قەومێك زیاتر دۆستی کوردانن، عاشقی شەجاعەتی ئەوانن، دلێری کوردانیان چاك بیستووە لەبەر ئەمە زۆریان خۆش ئەوێن".[٢٦]

ئینگلیز ئەو کاتە لەکوردستاندا، لەهەموان زیاتر چاوی لە کوردەکانی ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری بوو، بە حوکمی ئەوەی شێخ مەحمود لەو نێوچەیەدا جموجۆڵێکی زۆری هەبوو، یەکێك لەخاسیەتەکانی شێخ مەحمودو بزاڤەکانی ئەوەبوو، بەردەوام هەوڵی ئەوەی دەدا لەچوارچێوەی جوڵانەوەیەکی ناوچەیی خۆی دەرباز بکات و هەر لەسەرەتاوە هەوڵی ئەوەی دەدا کە پەیوەندیی لەگەڵ هێزە سیاسیەکانی دەوروبەریدا ببەستێ. بۆ نموونە لەگەرمەی سالانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا شێخ مەحمود نامەی بۆ (شەریف حوسەین)ی شەریفی مەککەو کوڕانی ڕەوان کردووە، پێشنیازی ئەوەی بۆ کردوون کە بەهاوئاهەنگی دژ بەدەوڵەتی عوسمانی کاربکەن.[٢٧]

---

[٢٥] منتشاشفیلی: کورد، ل٥٠.

[٢٦] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: تێگەیشتنی ڕاستی، ل١١٧، ١١٨، ١٢٢.

[٢٧] د. كمال مظهر احمد: جريدة التآخي، عدد، ١٤٥٤، ١٩٧٣/١٠/٨.

هەر بۆیە ئینگلیز بەمەبەستی پەیوەندی بەستن لەگەڵ کورددا دوای داگیرکردنی بەغدا، سەرقاڵی ئەوەبوو کەسانێك رەوانەی نێوچە کوردیەکان بکات کە پێشتر بەباشی شارەزایی ئەو ناوچەیە بووبن، بۆ ئەم مەبەستەش سۆنی رەوانە کرد، د. کەمال مەزهەر لەم بارەیە دەڵێت " سۆن لە هەموو ئینگلیزی ئەو سەردەمەو بگرە پێش ئەو سەردەمەش زیاتر شارەزای کوردو وڵاتی کوردو زمانی کوردی بوو، بەر لەشەڕی یەکەم بەچەند ساڵێ هاتبووە ناو کوردو لەنزیکەوە لە نیشتمان و نەریتی کۆڵیبۆوەو پەیوەندی لەگەڵ زۆری ناوداریان بەستبوو، بەنێوی میرزا غولام حوسەینی شیرازی‌یەوە".[٢٨]

لەسلێمانیشدا شێخ مەحمود و گەورە پیاوانی شارەکە بڕیاری ئەوەیان دابوو پەیوەندی بە ئینگلیزەوە بکەن چونکە خەڵك تەواو هیوابڕاو بوو بوون لەعوسمانیەکان، پێیان وابوو پشتگیری کردن لەعوسمانی وەك ئەوەیە پەیمان لەگەڵ کەسێکی دۆڕاودا ببەستن.

لەهەمان کاتدا ئەو رۆژگارە خەڵك وای لێهاتبوو بەهەموو شتێك رازی ببێت، بەمەرجێك لەترسی مەرگ رزگاری بێت. بەتایبەتی لەو رۆژانەدا پەیتا پەیتا هەواڵ دەگەیشتە سلێمانی کە ئینگلیزەکان چۆن خەڵکی ناوچەکانی باشووریان لەبرسێتی و نەهامەتی رزگارکرووەو وەك فریشتە بەهانای خەڵکەوە دەچن. بۆیە وەك رەسول هاوار باسی لێوە دەکات هەوڵنەدان بۆ پەیوەندی کردن و هاوکاری نەکردنی ئینگلیزەکان چ بەلای شێخ مەحمودەو چ لای خەڵك، بەشتێکی زۆر نەزانانەو گێلانە دادەنرا،[٢٩] چونکە لەو سەردەمەدا دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، سلێمانی تەواو پەرێشان و کاول بوو بوو هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو، بازرگانی وکڕین و فرۆشتن لەشارەکەدا وەستابوو، دوو لەسەرسێی خەڵکەکە لەبرساناو لەسەرمانا مردبوون، هیچ هیواو ئومێدێك لەژیاندا بەدی نەدەکرا.[٣٠]

---

[٢٨] د. کمال مظهر احمد: کردستان في سنوات، ل١٨٥-١٨٧

[٢٩] شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل٣٥٩-٣٦٠.

[٣٠] ویلسون: بلاد مابين النهرين بين ولاءين، ل١٦.

بێگومان ئەم خەڵکە هەژارو نەدارەش چاوەڕوانی کەسێك بوو بەفریای بگات. خەڵکی هەڵبژاردەو تێگەیشتوان‌و پیاو ماقوڵەکانی شارەکەش، تەواو هاتبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە دەبێت ئینگلیز بگاتە سلێمانی بۆ ئەوەی ئەم شارەش لەو گۆڕانکاریانە بێ بەش نەبێت کە لەدوای جەنگی جیهانی دێتە کایەوە.

کاتێك ئینگلیزەکان گەیشتنە کفری‌و توزخورماتوو لەمانگی نیسانی ١٩١٨ داو لەرێکەوتی ٧ی‌مایسی١٩١٨ هێزەکانی جەنراڵ مارشاڵ کەرکوکیشیان داگیرکرد، ئەو کاتە شێخ مەحمود نامەیەکی نوسی‌و بەدزیەوە ناردی بۆ کەرکوك بۆ (ویلسن)ی حاکمی گشتی عێراق‌و خۆشحاڵی خۆی تیایدا دەربڕیبوو سەبارەت بەسەرکەوتنەکانی سوپای بەریتانیا،و داوای لێکردبوو بەرەو سلێمانی بێن‌و حکومەتێك بۆ کورد پێك بهێنن لەژێر چاودێری خۆیاندا، شێخ مەحمود لەم نامەیەدا خۆی وەك نوێنەری نەك هەر کوردستانی باشوور، بەڵکو هی رۆژهەڵاتیش تا دەگاتە شاری (سنە) خۆی بە ئینگلیز ناساندو داوای ئەوەی لێکردبوون وەك نوێنەری ئەوان حوکمڕانی بکات،[*][31] ئەو نامەیەی کەرکوکی بەدەستی عبدوڵڵا سافی‌دا رەوانە کردبوو، نامەیەکی دیکەش بەدەستی عیزەت مەدفەعی لەرێگای کۆیەوە بەهۆی موحسین ئاغاوە ناردبوو. سەبارەت بەناوەڕۆکی ئەم دوو نامەیە، ئەوا هەریەك لە ( رەفیق حیلمی، ئەحمەد خواجە، رەمزی قەزاز ) بەجیاواز ناواخنی نامەکە دەخەنە روو، بەڵام وێڕای ئەو جیاوازییەش، سەرجەمیان گوزارشت لەخۆشحاڵی کورد دەکەن بەگەیشتن‌و سەرکەوتنی ئینگلیز. (ویلسن) خۆی زۆر بەڕوونی باس لەو پێشوازیە گەرمە دەکات کە دانیشتوانی ئەم وڵاتە لێیان کردووە، بەڵام کاتێك ئینگلیزەکان پاش چەند رۆژێك (کەرکوك) چۆڵ دەکەن،

---

[*] هۆکاری خۆناساندنی شێخ مەحمود وەك نوێنەری کوردستانی ئێران تا شاری سنە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە سەردەمی حوکمڕانی بابانەکاندا ئەم ناوچانەش دەکەوتنە قەڵەمڕەوی میرنشینی بابانەوە هەر بۆیە ئەو لێك نزیکی و پەیوەستی‌یە لە ئارادا بوو لە نێوانیاندا.

[31] رەفیق حیلمی: یادداشت،ب١، ل٥٧-٥٨.

ئەوا دانیشتوانی نێوچە کوردیەکان دووچاری ناخۆشی و نەهامەتیەکی زۆر دێن. بەتایبەتی کاتێك دووبارە لەگەڵ توندوتیژی تورکەکاندا رووبەروو دەبنەوە، تەنانەت نامەکەی شێخ مەحمود کە بەدەستی عەبدوڵڵا سافیدا رەوانەی کردبوو ناگاتە دەست ئینگلیزو ناوبراو یەکسەر نامەکە دەداتە دەست خەلیل پاشای فەرماندەی هێزی عوسمانیەکان لە عێراق، هەر بۆیە لەسەر بڕیاری خەلیل پاشا بە فرتو فێڵ شێخ مەحمود لەسلێمانی دەستگیر دەکەن و رەوانەی (کەرکوك)ی دەکەن، لەوێش شێخ دەدەنە دادگاو حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا دەدەن.[٣٢] پاشەکشەی هێزەکانی بەریتانیا لەشاری کەرکوك کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو بۆ سەر ناوو بانگی هێزەکەیان و لەپێش چاوی خەڵك شان و شکۆی جارانیان نەما ، تەنانەت هەمەوندەکان، کە پێشتر نامەی پشتگیریان بۆ هێزەکانی ئینگلیز رەوانە کردبوو و ئامادەیی هاوکارییان دەربڕیبوو، دوای ئەم پاشەکشەیە، لێیان هەڵگەڕانەوەو کەوتنە دژایەتی کردنیان.[٣٣]

لەلایەکی دیکەوە دوای ئەوەی شێخ مەحمود حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا دراو رەوانەی (موسڵ) کرا، بەهۆی هاتنی (عەلی ئیحسان پاشا)وە ئەم حوکمەی لەسەر لابراو جێبەجێ نەکرا، کە عەلی ئیحسان پاشا خۆی لەم بارەیەوە باسی لەوە کردووە ،کەوا زانیویەتی ئەوان هەر شەڕەکەیان دۆڕاندوە و لەو بارودۆخەشدا خنکاندنی شێخ مەحمود هیچ سودێکی پێ نەگەیاندوون، بۆیە وای بە چاك زانیوە بیکات بە فەرماندەی دەستەیەکی چەکدار و بەهۆیەوە دژایەتی هێزەکانی بەریتانیا بکات و هیچ نەبێت ماوەیەکیتر پێشڕەوی هێزەکانیان دوابخات، هەر بۆیە بانگی کردوتە لای خۆی و رێزێکی زۆری لێناو

[٣٢] وەلید حمدی: کوردو کوردستان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیا، سلێمانی -١٩٩٩، ل٣٥ ؛ پێ رەش: العراق دولة بالعنف، مطبوعات کوردولوجیا ، ١٩٨٦، ل١٤،١٥.

[٣٣] ویلسون: بلاد مابین النهرین، ل١٤-١٥.

بەناوی حکومەتی عوسمانیەوە دووبارە رەوانەی کردەوە بۆ سلێمانی و کردی بەفەرمان رەوای شارەکەو بڕی پێنج هەزار لیرەشی پێدا .[*٢٤]

هێزەکانی بەریتانیا دووبارە لە ١٩١٨/١٠/٢٥ شاری کەرکوکیان کۆنترۆڵ کردوەو لە ٣١ی هەمان مانگدا ئاگر بەستی مۆدرۆس مۆرکراو جەنگ راوەستا، لەو کاتەدا عەلی ئیحسان پاشا بەتەلگراف فەرمانی دا بە (عەلی رەزا بەگ)ی موتەسەریفی لیوای سلێمانی کە ئیدارەی شارەکە بداتە دەست شێخ مەحمود، جگە لەوەش نازناوی (نەقیب)یش بەشیخ مەحمود بەخشراو، لە سلێمانیدا تەنها ئەو فەوجە سەربازە تورکیە مایەوە کە (ساڵح بەگی تابوور ئاغاسی) فەرماندەی بوو.[٣٥]

بەم شێوەیە شێخ مەحمود بوو بەموتەسەریفی سلێمانیو بەناوی حکومەتی عوسمانیەوە ئیدارەی گرتە دەست، بەڵام پیاوانی تورکو عەلی رەزا بەگی موتەسەریفی عوسمانی شاری سلێمانیان جێهێشتو روویان کردە موسڵ .شێخ مەحمود دووبارە ئەم بارودۆخە تازەیەی سلێمانی بەهەل زانیو لەرێگای (عیزەت تۆپچیو فایەقی تاپۆ)وە، نامەیەکی دیکەی بۆ ئینگلیزەکان رەوانە کردوو دووبارە داوای لێکردن کەبەرەو سلێمانی بێن بەرامبەر بەهەندێك پەیمانو بەڵێن کە وەك مەرج بۆ ئینگلیزەکانی دانابوو.

تا گەیشتنی ئەم نامەیە هێزەکانی ئینگلیز لەخۆیان رانەدەبینی هێندە بەئاسانی بچنە نێو سلێمانیەوە، بۆیە ئەو نامەیە زۆر دڵخۆشیکردنو

---

[*] شێخ رەئوفی کوڕی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا باس لەوە دەکات کە حکومەتی عوسمانی هیچ پارەو پولێکییان بە شێخ مەحمود نەداوە ، بەڵکو ئەو کاتەی لە موسڵ بووە باری دارایی زۆر خراپ بووە کاتی گەڕانەوەشی بۆ سلێمانی بە قەرز پارەی لەو ئەفسەرە کوردانەی موسڵ وەرگرتووە بۆ خەرجی رێگا (رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ل٣٥٥.)

[٢٤] ئەحمەد خواجە: چیم دی،ب١، ل١٩.

[٣٥] رەفیق حیلمی: یادداشت، ب١، ل٥٧ ؛ وەلید حمدی: کوردو کوردستان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، سلێمانی ، ١٩٩٩-،ل٣٥

بەڵێنیان بەشێخ مەحمود دا کە بەرەو سلێمانی بچن.[٣٦] لەسەر راسپاردەی (ولسن)ی حاکمی گشتی، مێجەر (نۆئیل) کرا بەحاکمی سیاسی لیوای کەرکوك و لەرێکەوتی ١ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨، میجر نۆئیل خۆی و گروپێکی بچوك کە لەدکتۆرێك و ئەندازیارێك و مێجەر (دانلێس) و چێشت لێنەرێك و چەند خزمەتکارێکی لەگەڵدا بوو، ئەمانە بەرێگای چیاکانی نێوان کفری و چەمچەماڵدا هاتنە داریکەلی، شێخ مەحمودیش لای خۆیەوە دەستەیەك لەپیاو ماقوڵانی نارد بۆ پێشوازیان و بەپیریانەوە چوون، کاتێك دەستەکەی مێجەر نۆئیل ئەم پێشوازییەیان بینی بێ ترس و سڵەمینەوە بەرەو سلێمانی چوون.[٣٧]

نوئێل خۆی باس لەوە دەکات کە چۆن پێشوازیەکی شاهانەی لێکراوەو ئەم بەرو ئەوبەری رێگا خەڵکی لادێکان بۆ پێشوازی وەستاون و بەو هاتنەی خۆشحاڵ بوو،[٣٨] لەنێو شاریشدا شێخ مەحمود خۆی بەدوای پیاو ماقوڵانی سلێمانی و سەرانی تیرەو خێڵەکانی دانارد کەهەموویان لەسلێمانیدا کۆببنەوەو لەپێشوزای (نۆئیل) دابن،[٣٩] بەم شێوەیە نۆئیل لەرێکەوتی ١٩١٨/١١/١٦ گەیشتە سلێمانی.[٤٠]

کاتێك نۆئێل گەیشتە سلێمانی هێشتا بارودۆخی شار یەکجار پەرێشان بوو، لاشەی مردوو لەسەر شەقامەکانی کەوتبوو، تەنها سێ‌یەکی دانیشتوانی شارەکە مابوونەوەو ئەوانیش لەوپەڕی برسێتی و نەهامەتیدا بوون، چاوەڕوانی ئەوەبوون بەهەر شێوەیەك بێت کەمێك مەینەتیەکانی سەرشانیان

---

[٣٦] عبد المنعم الغلامی: ثورتنا في شمال العراق، ج١، بغداد، ١٩٦٦، ل٩٣ ؛ رەفیق حیلمی: یادداشت، ب١، ل٥٦، ٥٧، ٥٨.

[٣٧] رەفیق حلیمی: یادداشت، ب١، ل٥٨-٥٩.

[٣٨] عبد المنعم الغلامي: هەمان سەرچاوە، ل٩٣؛ احمد عثمان ابو بكر: كردستان في عهد اسلام، مجلة الثقافة، ق١٢، ع (١١-١٢) ١٩٨٠، ل٧٣.

[٣٩] چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا جەمیل رۆژبەیانی ٢٠٠١/٢/١٧، بەغداد.

[٤٠] د. احمد عثمان ابو بكر: مقترحات لادارة المناطق كردية بعد الحرب العالمية الاولى، مجلة كاروان، عدد، ٤٨، ١٩٨٦، ل١٣٩.

سووك بێت. خەڵكی هێندە پەرێشان بوون تەنانەت بنەتۆویشیان نەمابوو کە کەمێك دەغڵ و دان تۆو بکەن،[٤١] بۆیە نۆئیل لەیەکەم هەنگاودا دەبوایە هەوڵی چاککردنی ئەو بارە بدات، لەم پێناوەشدا بەپەلە کەوتە هێنانی خۆراك و ئازوخەو دابەشکردنی بەسەر خەڵکیداو دووبارە وەگەڕخستنەوەی بازاڕەکانی سلێمانی. تەنانەت بڕێکی زۆر پارەشیان خستە بازاڕەوە، چونکە وەك ئەدمۆندز باسی لێوە دەکات لەدوو ساڵی کۆتایی جەنگدا بازاڕو بازرگانی سلێمانی تەواو نابوت ببوون،[٤٢] بەم شێوەیە نۆئیل، بڕێکی باش خۆراك و ئازوخەی بەسەر دانیشتواندا دابەش کرد، هەرچەندە (ئەحمەد خواجە) باس لەوە دەکات کە ئەو ئازوخەیە بەخۆڕایی نەبووە بە پارە فرۆشراوە بەخەڵك و خەڵکە هەژارەکە هەر لەپەرێشانیدا بوون، بەڵام بەهەر حاڵ ئینگلیزەکان بەهۆی ئەم بڕە خۆراکەوە توانیان تا ئەندازەیەکی باش دانیشتوانی شارەکە بناسن و سودێکی باش لەبرسیەتی خەڵکەکە وەربگرن.[٤٣]

وێڕای ناهەمواری بارودۆخی سلێمانی لەو رۆژگارەدا، بەڵام هێشتا دەستەیەکی هەڵبژاردەو رۆشنبیر لەشارەکەدا هەبوون بە بەرچاو رونیەوە کاریان دەکرد، لەمەشدا بەپلەی یەکەم کاریگەری ئەو شەپۆلی بەئاگاهاتنەوەیەیان لەسەر بوو کەسەرجەم گەلە ناتورکەکانی دەوڵەتی عوسمانی گرتبۆوە.[٤٤]

بەتایبەتی ئەو ئەفسەرە کوردانەی خەڵکی سلێمانی بوون لە ئەستەمبوڵ گەڕابوونەوەو بەشداریی جەنگی یەکەمی جیهانییان کردبوو، دەستیان کردبوو بەجموجۆڵ و لەنێو خۆیاندا دەستە دەستەو گروپ گروپ کۆبوونەوەو زیاتر نیمچە رێکخراوی سیاسی سادەو ساکاریان پێك هێنابوو کە لەگەڵ ئەو

---

[٤١] ولسن: بلاد مابين النهرين، ج٣، ل١٦ ؛ رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل٣٥٩-٣٦٠ ؛ ادموندز: هەمان سەرچاوە، ل٧٩.

[٤٢] کرد و ترك و عرب ، ل٧٩.

[٤٣] ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب١، ل٤٢ ؛ مس بيل: فصول من تاريخ العراق القريب، ل٣٩.

[٤٤] صلاح الخرسان: التيارات السياسة في كردستان العراق،قراءة في ملفات الحركات والاحزاب الكوردية في العراق ١٩٤٦-٢٠٠٠. ط، بيروت،٢٠٠١، ل١٥-١٦.

سەردەمە مێژووییەدا دەگونجا.[٤٥] ئەمانە کەسانی دڵسۆزو نیشتمان پەروەر بوون و لەو رۆژگارە ناسکەدا هەر ئەمانە بەدەوری شێخ مەحمودەوە بوون کە شتێکیان لە باسی نیشتمانپەروەری و مافی میللەتی کوردو سیاسەتیان زانیووە، بەڵام بەرامبەر بەم توێژە نیشتمانپەروەرو رۆشنبیرە، هێشتا دەستەو تاقمێکی زۆر لەپیاوی ئاینی و مەلاکان لەسلێمانیدا دەست رۆیشتوو بوون ، بەهیچ شێوەیەك ئامادەنەبوون جگە لە تێڕاونینی تەسکی خۆیان هیچ بیروبۆچونێکی دیکە قەبوڵ بکەن، هەتا لەنێو خۆیاندا لیستێکیان ئامادە کردبوو بەناوی کۆمەڵێك لەو رۆشنبیرو منەوەرانەی کە بە (فەرمەسۆن)و (بۆینباغ لەمل) ناویان دەبردن بەمەبەستی کوشتنیان، بەپاساوی ئەوەی کە بیروباوەڕی کوفرو خوانە ناسی بڵاو دەکەنەوە .[*٤٦]

تەنانەت ئەو ساتەش کە شێخ مەحمود و پیاو ماقوڵانی سلێمانی بڕیاری بانگهێشت کردنی ئینگلیزیان دابوو ئەم دەستەو تاقمانە تا دوا ئەندازە نیگەران بوون، بەبیانووی ئەوەی کە ئینگلیز کافرەو چۆن دەبێت شوێنی خەلیفەو دەوڵەتی عوسمانی موسڵمان بگرێتەوەو بەپیرەوەچوونی ئینگلیزیان پێ خۆش نەبوو.[٤٧] بەڵام روناکبیرانی کورد بەشێوەیەکی گشتی پێیان وابوو رزگاری کوردستان پەیوەندی بەنیازپاکی بەریتانیاوە هەیە.[٤٨] هەرچەندە ژمارەیەکیشیان هێشتا رارابوون لەوەی کە ئاخۆ ئینگلیز خاوەنی بەڵێنەکانی

---

[٤٥] نوری شاوەیس: من مذکراتي، ط١، ١٩٨٥، ل٨.

[*] تۆفیق وەهبی باس لەوە دەکات کە لە نێو شاری سلێمانی‌دا مەلا ڕەسولی دێلێژە پەلاماری داوەو بۆینباغەکەی لە ملی توند کردووەو بە کافر لە قەڵەمی داوەو خەریك بووە بیخنکێنێ ، بەڵام شێخ مستەفای کوردی کە مامۆستای تۆفیق وەهبی بووە بە فریای گەیشتووەو ڕزگاری کردووە .( رەسول هاوار: شێخ مەحمەوی قارەمان، ل٢٣٩-٢٤٠).

[٤٦] رەسول هاوار: شێخ مەحموی قارەمان، ل٢٣٩-٢٤٠.

[٤٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨١.

[٤٨] جلال الطالباني: هەمان سەرچاوە، ل٩٨ ؛ دکتۆر سادقی شەرەفکەندی: هەمان سەرچاوە، ل٦٤.

خۆی دەبێت و یا ئەوانیش بەهەمان شێوەی عوسمانیەکان مامەڵە لەگەڵ کورد دا دەکەن.

بەهەر حاڵ ئەو رۆژگارە شاری سلێمانی پایتەختی روحی و نیشتماپەروەری کوردستان بوو،[49] هەر بۆیە ئەو سەردەمە رەوتێکی کوردایەتی تەواو لەم شارەدا باڵا دەست بوو، ئەدمۆندز لەم بارەیەوە دەڵێت "ماوەی نێوان داگیرکردنی سلێمانی لەلایەن بەریتانیاوەو نەمانی میرنشینی بابان، کە لەحەفتا ساڵ زیاتر نییە، بێ گومان بەشێکی زۆری پیاوانی ئەم شارە یەکەم مەسەلەو باس و خواسێك لە باوکیانەوە بەرگوێیان کەوتبێ مەسەلەی خۆش و سەرنج راکێشی سەردەمی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان بووە لەسەردەمی بابانەکاندا ،[50]** هەر بۆیە ئەو کاتە سلێمانی بەمەڵبەندی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد دەژمێردرا،[51] تەنانەت دانیشتوانی ئەم شارە بەشێوەیەك بەسەرجەم چین و توێژەکانیانەوە، بڕوایەکی پتەو لەمێژوویاندا رەگی داکوتاوەو پێیان وایە سلێمانی مەکۆی بوژاندنەوەی بیری نەتەوەییەو یەکەم کۆرپەلەی دەوڵەتێکی کوردی بەرفراوانە کە دەبێت ئەم شارە پایتەختی بێت، تەنانەت پیاوانی ئینگلیز هەستیان بەوەکردبوو کە

---

[49] دانا ادمز شمدت: رحلة الى رجال الشجعان في كوردستان، ترجمة: جرجيس فتح الله، ط٢، اربيل –١٩٩٩، ل١٤٧.

** ( عارف صائب ) ی سکرتێری تایبەتی شێخ مەحمود کە خۆی شاعیرێکی بە توانا بووە چەندین شیعری جوانی هەیە بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە لە سوپای عوسمانی دا بووەو لە شاری سلێمانی دوور بووە لە کۆپلە شعرێکیدا دەڵێت :–

" دڵم نایە دوعای مەحوی بکەم چونکە سلێمانی
بەنیسبەت یادگاری خاڵصی ئەولادی بابانە "

( جەمیل صائب : لە خەوما ، پێشکەش کردن و لێکۆڵینەوەی جەمال بابان ، بەغداد ، ١٩٧٥ ، ل ٨ ).

[50] ادموندز: هەمان سەرچاوە: ل٥٨.

[51] منتشاشفيلى: العراق في سنوات الانتداب، ل٣٠٩.

کەش و هەوای سلێمانی لێوان لێوە بەوەی کە شارەکەیان بەردی بناغەی سەربەخۆیی کوردستان.[٥٢]

هەر بۆیە لێرەدا ئەو راستیە ئاشکرا دەبێت کە کاتێك هێزەکانی بەریتانیا بێ تەقەو بەرهەڵستی گەیشتنە ناو شاری سلێمانی خەڵکی ئەم شارە چاوەڕوانی سەربەخۆیی و ئازادی بوون و لەگەڵ ئینگلیزدا هەر دوولا یەك ئامانجیان هەبوو لەدەرکردن و دور خستنەوەی تورك لەم وڵاتەدا خۆی دەبینیەوە، ئەو سەردەمە خەڵك تەواو گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو چونکە جەنگی یەکەمی جیهانی بەزۆر مەسەلە ئاشنای کردبوون و رووبەڕووی سەردەمێکی یەکجار دەگمەن و کەم وێنەی کردبوونەوە، تەنانەت رەوشی رۆژگاری دوای جەنگ وای لەهەندێك مێژوونووس و لێکۆڵەر کردووە کە پێیان وابێت مێژووی سیاسی و نیشتمانپەروەری کوردی راستەقینە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دەست پێدەکات،[٥٣] بەتایبەتی لەشاری سلێمانیدا، تادەهات زیاتر بیروباوەری سیاسیش پێ دەگەیشت. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ ژمارەیەك لەئەفسەرەکانی سلێمانی گەڕابوونەوە، لەنێو خەڵکیدا بە (بۆڵشەویك) ناسرابوون، خەریکی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بوون، بێ ئەوەی هیچ لەمارکسیزم – لینینیزم و بیری کۆمۆنیستی گەیشتبن، بەڵکو دەستەیەك بوون کە زۆربەیان لەو دیلانە بوون کە بۆڵشەویکەکان ئازادیان کردبوون.[٥٤] راستی ئەم مەسەلەیەش لەو گرنگی پێدانەی رۆژنامەی (پێشکەوتن) بەدەردەکەوێت کە لەچەندین ژمارەدا تانەو تەشەر دەگرێتە سۆڤیەت و بەلشەویك و هەوڵی ناوزڕاندنیان دەدات لەپێش چاوی خەڵکی.[٥٥]

بەلام وێڕای لاوازی فیکری و سیاسی جوڵانەوەی رزگاری کورد لەسەردەمی جەنگی جیهانی و دوای ئەو جەنگەش، رۆشنبیرانی سلێمانی

---

[٥٢] ادموندز: هەمان سەرچاوە، ل٦٠؛ منتشاشفيلي: العراق في سنوات:ل٣٠٩.

[٥٣] د. احمد عثمان ابو بكر: كردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، عدد، ١١-١٢، ١٩٧٩، ل٣٥.

[٥٤] جلال الطالباني: هەمان سەرچاوە، ل١٠٥.

[٥٥] پێشکەوتن: رۆژنامە، ژمارە ١، ٢، نیسانی –١٩٢٠.

تەواو لەبارودۆخی ساڵانی پێشوو گەیشتبوون، بڕوای تەواویان لادروست ببوو کە کورد لەئەنجامی سیاسەتی عوسمانیدا چەند نەهامەتی و ناخۆشیان توش هاتووەو ساڵانی جەنگی جیهانی کوردی توشی چ ڕۆژگارێك کردووە. دواتر ئەم ڕاستیانەیان بەئاشکرا دەربڕیوەو لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکانی ئەوسەردەمە لێی دواون. بۆ نمونە عەزیز قەزاز، لەژمارە چواردەی (ڕۆژی کوردستان)دا، وتارێکی بڵاوکردۆتەوەو تیایدا باس لەنەهامەتیەکانی کورد دەکات کە لە سەرەتای جەنگی جیهانیەوە توشی چەندین نەهامەتی و گیرو گرفت هاتووە ،کە بەشێکی زۆری کێشەی دوژمنان بووە و بەرۆکی کوردی گرتووە و هیچ سودێکی خۆی تێدا نەبووە جگە لە ژێر دەستەیی. هەر لەژمارە پانزەی هەمان ڕۆژنامەدا (خواجە ئەفەندی زادە ) کەهەر دەبێ (ئەحمەد خواجە)بێ،وتارێکی بەناونیشانی (عیبرت) بڵاوکرۆدتەوەو تیایدا دەڵێت:-

"لەمازیدا چ نەوعە حەیاتێکمان ڕابواردووە، ئەلبەتە هەموو ئەیزانین، ئیفنای حەیات، تەرکی سەعادەت و مەنافیعی خۆمانمان کرد بۆ موحافەزەو مەنعی تەعەروزی ئەجانیب لەحدودو خاکی خەڵق بەناوی دیانەتەوە چەند کەسانمان لەحەربی عومیدا شەهیدو فەوت بوون، حاڵی حازریش هێشتا زۆرمان لەبەر تەعزیە تەبدیلی قیافەتمان نەکردووە".[٥٦]

وردبونەوەو تێڕامان لەناوەرۆکی ئەم بابەت و وتارانە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی ڕۆشنبیرانی سلێمانی و خەڵکە ڕەشۆکیەکەش هێندەیان مەبەست بووە، ڕۆژێك زووتر ئینگلیز بگاتە سلێمانی و لەژێر دەستی تورك ڕزگاریان بێت، بە ئەندازەیەك کە شێخ مەحمود داوای لە ئنگلیزەکان کردووە نەهێڵن جارێکی دیکە تورك بگەڕێتەوە بۆ ئەم ناوچانە.[٥٧]

کاتێکیش ئنگلیزەکان هاتنە سلێمانی زۆر بەوردی ئەم هەل و مەرجەی ئەوسای سلێمانیان لێکدابوەوە، بۆیە لەسەرەتادا هەولی دەدا بەهەر شێوەیەك بێت، دڵی شێخ مەحمودو دانیشتوانی ئەم شارە ڕابگرێت، ولسن، میجەر

---

[٥٦] ڕۆژی کوردستان، ژمارە (١٤، ١٥) ٢٤/شوبات/١٩٢٣، ٣/مارت، ١٩٢٣.

[٥٧] پێ ڕەش: هەمان سەرچاوە، ل١٤.

نۆئیلی راسپاردبوو کەچی بەپێویست زانی لەسلێمانیدا ئەنجامی بداتو چەندیش پارەی پێویست بوو خەرجی بکات بۆ پێداویستیەکانی جێبەجێکردنی سیاسەتی بەریتانیا، ئەوە بوو لەرێکەوتی ١٩١٨/١١/١٧ دا واتە دوای تێپەڕبوونی تەنها یەك ڕۆژ بەسەر گەیشتنیدا نۆئیل لەسەر راسپاردەی (ولسن) جاڕی دامەزراندنی یەکەمین حکومداریەتی شێخ مەحمودی دا.[٥٨]

## باسی دووەم:

## سلێمانی لەسەردەمی یەکەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمودا

پاش ئەوەی نۆئێل لەرێکەوتی ١٦ی‌تشرینی دووەمی١٩١٨ دا گەیشتە سلێمانی وەك نێردراوێکی حکومەتی بەریتانیا، بەخۆیی و کۆمەڵێك بڕیارو راسپاردەی حکومەتەکەیەوە هاتبوو، ئەوەبوو بۆ ڕۆژی دوایی لەبەردەرکی سەرا، بەرامبەر بە ئاپۆرەیەك خەڵکی سلێمانی و کوردستانی‌ئێران وتارێکی بەزمانی فارسی پێشکەش کردو، تێیدا شێخ مەحمودی وەك حوکمدار بەخەڵك ناساند کە لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە کراوە بەحکومداری ئەم ناوچەیەو[٥٩] خودی (مێجەر نۆئێل)ش کرا بەراوێژکاری سیاسی شێخ مەحمودو (مێجەر دانلێس)یش وەك راوێژکاری سەربازی دانرا[٦٠] ئینگلیزەکان هەوڵیان دا، لایەنگیری خەڵکی سلێمانی و دەوروبەری بۆ شێخ مەحمود و حکومەتەکەی بەدەست بهێنن. بۆ ئەم مەبەستەش بڕیاریاندا (بەیعەت) بۆ شێخ مەحمود بکەن، رەفیق حیلمی کە خۆی لەو رێو رەسمەدا بەشداربووە، لەو بارەیەوە دەڵێت (هەر ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارێ) لەماڵی شێخ مەحمود ئەهالی و پیاوە گەورەو ناودارەکانی سلێمانی کۆکرانەوەو (بەیعەت) بەحوکمدار درا، خۆم لەگەڵ ئەحمەد ئاغای کەرکوکی زادە لەم بەیعەتەدا حازربوم، جگە لەمەش بڕیاردرا نۆئێل لەشارەکانی تری کوردستانا دەست بکات بەتەشکیلات بۆ رێکخستن و

---

[٥٨] ولسن: بلاد مابین النهرین. ل١٥.

[٥٩] رەفیق حیلمی: یاداشت، ب١، ل٦٢.

[٦٠] عەلائەدینی سجادی: شۆڕشەکانی کوردو کوردو کۆماری عێراق، بەغداد، ١٩٥٩ ل ٨١-٨٢.

یەكخستنی ئەو شارانە چی پێویست بوو بیكات، مانگی (١٥) هەزار روپیە مەواجب بۆ حوكمدار بڕایەوە"[٦١].

ئەو رۆژانە سلێمانی وەك مەڵبەندێكی چالاكی كوردستان بەدەركەوتبوو بەحوكمی ئەو جموجۆڵ و هەڵوێستانەی لەكۆتایی سالانی دەسەلاتی عوسمانیەكانەوە ئەم شارە بەخۆیەوە بینی بوون، بۆیە وەك لە سەرەتادا ئاماژەمان بۆ كرد، كۆمەڵێك سەرەك هۆزو پیاوانی ناوداری كوردستانی ئێران روویان كردبووە سلێمانی و بەنیازی ئەوەبوون كە نێوچەكانی ئەوانیش بچێتە ژێر قەڵەمڕەوی حكومەتەكەی شێخ مەحمودەوە.[٦٢] بەلام لەسالانی جەنگی یەكەمی جیهانیەوە هەردوو حكومەتی ئێرانی و بەریتانی زۆر لێك نزیك بوو بوونەوەو پەیوەندییەكی بەتینیان هەبوو، بەئەندازەیەك لەكۆتاییدا پەیمانێكی دۆستایەتیان بەست، بەمەبەستی هاوكاری كردنی یەكتر لەسالی ١٩١٩ دا .[٦٣]

كاتێك ئیگلیزەكان (نۆئێل) یان رەوانەكرد بۆ سلێمانی، خاوەنی سیاسەتێكی دیارو ئاشكرا نەبوون لەئاست كوردستاندا، هەروەك بەروونی لەنوسینەكانی ویلسن و مس بێل دەردەكەوێت كە چۆن ئەوان بە (نۆئێل) یان راگەیاندووە كە ئەو راستیە لەخەڵكی سلێمانی بگەیەنێت كەوا هەرچی بڕیارو هەنگاوێك دەنرێت لەم رۆژگارەدا بڕیاری كۆتایی نیەو بەڵكو مەسەلەیەكی كاتیەو لەهەموو كاتێكدا دەشێت چاوی پێدا بگێردرێتەوە، هەروەها ویلسن لەهەمان كاتدا ئەوەی بە نۆئێل راگەیاندووە تاكو بەسەرەك هۆزە كوردەكان رابگەیەنێت حكومەتی بەریتانیا بەنیاز نیە هیچ دەسەلاتێكی نامۆیان بەسەردا بسەپێنێت.[٦٤]

---

[٦١] یاداشت، ب١، ل٦٢.

[٦٢] رەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل

[٦٣] د. احمد عثمان ابوبكر: كردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، عدد٧، ل٤٧.

[٦٤] بلاد مابين النهرين، ل١٥-١٦.

بەم شێوەیە نۆئێل لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕاسپاردانەدا کاری دەکردو، هەر لەسەرەتاوە ئیگلیزەکان نیازیان باش نەبوو، تەنانەت وەك عەلائەدین سجادی باسی دەکات ، هەر لەڕۆژی جاڕدانی حکومداریەتی شێخ مەحموددا دانلێس لەژێر لێوەوە ئامارەی بەوە کردووە، کە مەبەست لەم کارە دامەزراندنی حکومەتی کوردی نیە، بەڵکو تەنها مەبەست حوکمداریە[٦٥] لەکاتێکدا لەو ڕۆژانەدا بەشێکی هەرە زۆری خەڵکی سلێمانی بڕوای تەواویان بە ئینگلیز هەبووەو پێیان وابووە ئەم داموو دەزگایەی شێخ مەحمود دەبێتە بنکەو بناغەی حکومەتێکی کوردی[٦٦] ئەو کاتە بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەسلێمانیدا زۆر بەهێز بوو، خەڵکی لایان وابوو کە حکومەتی بەریتانیا لێپرسراوییەتی ئەوەی گرتۆتە ئەستۆ کە ئاوڕێك لەکوردیش بداتەوە، تەنانەت خودی شێخ مەحمودیش لەسەرەتادا هەمان بیرو باوەڕی لا دروست ببوو کە ئینگلیز لەهەوڵی ئەوەدایە سەرجەم هۆزەکانی کوردستانی باشور لەژێر سەرکردایەتی ئەودا یەکبخات.[٦٧] ئینگلیزەکانیش کە لەسەرەتادا هاتنە سلێمانی، لەوە دڵنیابوون کە شێخ مەحمود بەهێزترین و بەرچاوترین کەسایەتی ئەم ناوچەیەیە بۆیە ناشێت بێ هاوکاری و هاریکاری ئەو ئاسایش و ئارامی لەم ناوچەیەدا بەرقەرار بێت، تەنانەت نۆئێل لەو ڕاپۆرتەیدا کە لە ڕێکەوتی ٨کانونی یەکەمی ١٩١٨ دا پێشکەشی سەروی خۆی کردووە بەئاشکرا دان بەو ڕاستیەدا دەنێت.

لێرەدا وێڕای ئەوەی کە (نۆئێل) ئەفسەرێکی سیاسی حکومەتی بەریتانیا بووەو سیاسەتی حکومەتەکەی خۆشی لەم ناوچانەدا سەپاندووە، بەڵام لەهەمان کاتدا خاوەنی بیرو باوەڕوو بۆچوونی تایبەتی خۆی بووەو تێڕوانینەکانی تا ئەندازەیەکی بەرچاوو جیاواز بووە لەتێڕوانینەکانی ویلسن و مس بێل، بۆیە هەر لەسەرەتاوە بەراپۆرتێك چەند جارێك بۆچوون و

---

[٦٥] عەلائەدین سجادی: هەمان سەرچاوە، ل٨٢-٨٣.

[٦٦] ڕەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١، ل٤٠٨.

[٦٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٢.

تێڕوانینە ئیجابیەکانی خۆی لەمەڕ ئیدارەی حکومەتەکەی شێخ مەحمودەوە بۆ سەروو خۆی ڕەوانەکردووە.[٦٨]

لەبەر ئەوە (نۆئێل) لای خەڵکی سلێمانی وەك فریشتە تەماشا کراوە ئەم هەستە تەنها لای خەڵکە ڕەشۆکیەکە نەبوو کە لەئەنجامی ئەو یارمەتیدان و باربووکردن و ئازوخە بەخشینەدا لایان دروست بووبوو، بەڵکو ڕۆشنبیران و مونەوەرانی سلێمانیش بەچاوێکی زۆر بەرێزەوە تەماشای (نۆئێل)یان دەکرد، لەم ڕووەوە (ڕەفیق حیلمی) لەهەموان زیاتر کەوتۆتە ژێر کاریگەری نۆئێلەوەو پێی وابووە، گەر بهاتایەو نۆئێل سلێمانی جێنەهێشتایە چارەنوسی کورد بەلایەکی دیکەدا دەشکایەوە.[٦٩] بەم شێوەیە نۆئێل تاخۆی لەسلێمانیدا بوو هەوڵیدا هیچ بەرکەوتنێك و بەگژاچوونەوەیەك لەنێوان خۆی و شێخ مەحمودا روونەدات، شێخ مەحمود وەك حوکمدار کەوتە کارو جۆرێك لە دام و دەزگای سیاسی لەسەر شێوازی دام و دەزگای کۆنی عوسمانیەکان لەسلێمانیدا دامەزراند.[٧٠]

بەڵام شێخ مەحمود وەك پێویست لەئاست ئەم بارودۆخەدا مامەڵەی نەکرد، ئەوەبوو سەرجەم پۆست و کارگێڕیەکانی ئەو حوکمداریەی بەخزم و کەس و کاری خۆی پڕکردەوە بێ گوێدانە لێوەشاوەیی و پسپۆڕیەك، ئەوەبوو لەسلێمانیدا تەشکیلاتێکی وەك تەشکیلاتی پێشووی لیوا دامەزرا، (سەید عومەر)ی مامی شێخ مەحمود کرا بە موتەسەریف و (حاجی سەید حەسەن)ی مامی دووەمی بوو بە حاکم، (شێخ قادر)ی براشی بوو بەسوپا سالار (فەرماندەی هێزی لیڤی)[*]. بەم جۆرە زۆربەی خزم و کەس و کاری شێخ

---

[٦٨] د. احمد عثمان ابوبکر: مقترحات لأدراة المناطق الكردية بعد الحرب العالمية الاولى، گۆڤاری کاروان، ژ ٤٨، ئەیلول، ١٩٨٦، ل١٣٩.

[٦٩] یادداشت،ب١، ل٧٠.

[٧٠] ڕەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ل٤٠٨.

[*] ئینگلیزەکان دوای ئەوەی عیراقیان داگیرکرد، لەخەڵکی نێوچەکان هێزێکی خۆجێیی یان پێکهێنا، کە لەسلێمانیدا ئەم هێزە لەلایەن ئەفسەرانی خۆیانەوە سەرپەرشتی دەکرا ، بەڵام وەك ڕواڵەت جەمال عیرفان فەرماندەی دەستەی سوارەی ئەم هێزە بوو، ڕمزا بەگیش فەرماندەی هێزی پیادە بوو، بەڵام لە ناوچەکانی دیکەی عیراقدا ئەو ئاسوریانەی لە نێوچەکانی کوردستانی باکور ڕایان کردبوو هاتبوونە ئەم دیو بەریتانیا گرنگی پێدەدان و کۆڵەکەی ئەم هێزەیان پێکدەهێنا.

مەحمودو دەستەو دایەرەیەکەی هەریەکەو* بەجۆرێك دامەزرابوون.[٧١]

بێگومان ئەم مەسەلەیە هەر لەسەرەتاوە بووە مایەی نیگەرانی خەڵك‌و کەسانێکی زۆر لەم روانگەیەوە گلەییان لەشێخ مەحمود دەکرد، تەنانەت وەك باس دەکرێت (موشیری حەمەی سلێمان) لەم هەڵوێستەوە کەوتۆتە دژایەتی کردنی شێخ مەحمود، خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت (هەموو کەس‌و کاری شێخ مەحمود پلەو پایەی، ئەفسەری‌و وەزیریان وەرگرت لەوانە شێخ قادری برای، خزمی وای هەبوو، لولەی تفەنگ و ماوزەری باروت لەشی پیس نەکردبوو تەقەی نەکردبوو، بەلاّم بوو بە ئەفسەرو مێجەرو وەزیر منیش هیچ! توڕە نەبووم، وتم قوربان شێخ مەحمود ئەمە ناحەقیە، ئەگەر وابێت لەم رۆژەوە لەگەڵت نیم‌و لەپشتی تفەنگەوە نەبێت نامبینێت)[٧٢] ئەم مەسەلەیە لەنێو خەڵکی دیکەشدا رەنگی دابۆوە، تەنانەت رەفیق حیلمی کە دڵسۆزی شێخ مەحمود بووەو زۆر لێوەی نزیك بووە گلەیی‌و گازاندەیەکی زۆر لەم حاڵە دەکات، بەتایبەت باسی لە (تایەر فەرخەی) مودیری پۆلیس دەکات کە هیچ خوێندەواری‌یەکی نەبووەو لەو شوێنە دانراوە.[٧٣]

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد لەو رۆژانەدا دوای کۆتایی هاتنی جەنگ شاری سلێمانی بایەخێکی یەکجار زۆری پەیداکردبوو، وەك مەڵبەندێکی رامیاری تەماشا دەکرا. تەنانەت دوای جاڕدان‌و راگەیاندنی ئەو حوکمداریەتەی شێخ مەحمود ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی دێهاتی دەوروبەری سلێمانی دێیەکانی شێخ مەحمود، بەسواری‌و پیادە خۆیان دەکرد بەنێو شارداو سلێمانی وروژابوو. ئەم مەسەلەیەش خۆی لەخۆیدا باشترین گەواهیە بۆ هێوربوونەوەی خەڵکی‌و باوەڕ دروستبوونەوە لایان بەوەی کە بارودۆخی شاری سلێمانی‌و کوردستان بەرەو باشی دەچێت.

---

[٧١] عبد المنعم الغلامي: ثورتنا في شمال العراق، ل٩٣: رەفیق حیلمی: یاداشت، ل٦٢.

[٧٢] ئازاد هەمەوەندی: بۆ جاری سێیەم موشیری حەمەی سلێمان، گۆڤاری رەنگین، ژ، ١٠٩.سالی١٩٩٧.

[٧٣] رەفیق حیلمی: یاداشت،ب١، ل٨٦.

لەسەرەتای دامەزراندنی ئەو دەسەڵاتە سیاسیەدا شێخ مەحمود پەیتا پەیتا پێشوازی لەسەرەك هۆزو میوانەكانی دەكردو سلێمانی جموجۆڵێكی بەرچاوی پێوە دیار بوو،ماڵی شێخ مەحمودو ماڵە دەوڵەمەندەكانی سلێمانی پڕ بوو لەم میوانانەو مەسرەفێكی زۆریان لێدەكرد.

ئینگلیزەكان لەهەنگاوی یەكەمدا لای خۆیانەوە بۆ زیاتر هێوركردنەوەی بارودۆخ، لەرێگای سەرۆكی شارەوانیەوە بڕێكی زۆر ئازوخەو كەل و پەلی خۆراكیان دابەش كردوو، پارە و پولیان خستە بازاڕەوە خەڵكانێكی زۆریش ئەو بارو دۆخەیان قۆستەوە بۆ خۆو دەوڵەمەند كردن و سوود وەرگرتن لەو حاڵەتە بەتایبەتی دەست و پێوەندو پیاوانی بنەماڵەی شێخان.[٧٤]

شێخ مەحمود لەم حكومەتەیدا هیچ رۆژنامەو ئۆرگانێكی نەبوو، بەڵام وێڕای ئەوەش هەندێك كارو كردەوەی جێ بایەخی ئەنجامدا كە گوزارشتیان لە ویست و داخوازیە راستەقینەكانی شێخ مەحمود دەكرد، بەتایبەت هەر لەسەرەتاوە ئەو راستیە ئاشكرابوو كە شێخ مەحمود كار بۆ فراوانكردنی قەڵەمرەوی خۆی دەكات و دەیەوێت هەردوو شاری (كەركوك و كفری)ش بخاتە سەر دەسەڵاتەكەی خۆی[٧٥] جگە لەوەش شێخ مەحمود لەیەكەم كاریدا زمانی كوردی كردە زمانی رەسمی دام و دەزگاكانی حكومەتەكەیی، و رۆژی ١٩١٨/١١/٩ دوایین رۆژی بەكارهێنانی زمانی توركی عوسمان بووە لەسلێمانیدا بەپێی تۆمارێكی توركی دادگا، بەڵام تا رۆژی ١٩١٨/١١/٢٨ كە دوانزەهەمین رۆژی حوكمدارێتی شێخ مەحمود بووە پێدەچێت زمانی فارسی بەكار هاتبێت، بەڵام لەرێكەوتی ١٩١٨/١١/٢٨ەوە زمانی كوردی بەرەسمی بۆتە زمانی بەكارهاتوو لە كاروباری حكومداریەتەكەی شێخ مەحمود داو بڕیاری رەسمی حكومدار بۆ ئەم مەبەستە گەیشتۆتە دادگا، تەنانەت خودی شێخ مەحمود خۆی زۆر بەتەنگ ئەو مەسەلەیەوە بووەو پابەندی بەكارهێنانی

---

[٧٤] سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٤.

[٧٥] سدیق سالح: یەكەم حكومەتی كوردستانی جنووبی كوردستانی نوێ، ژمارە، ٢٣٥٦،سالی ٢٠٠٠.

زمـانی کـوردی بـووه لەنوسـراوە تایبەتیـەکانی خۆشـیدا *[٧٦] . سـەبارەت بـەکاروباری ئیـداری ناوچەکـەش ئـەوا شـێخ مـەحمود بەتەنـها خـۆی لـەم ناوچەیەدا فەرمانی دەرنەدەکرد، چونکە ئینگلیزەکان سەرپەرشتی کارەکانیان دەکـرد، تەنانـەت کـاتێك نۆئێـل هاتـە سـلێمانی ولسـن ئـەو ڕێنماییـەی پـێ ڕاگەیاندبوو، وا پێویستی دەکرد کـە نۆئێـل لەخـەڵکی بگەیـەنێت، پێویسـتە بـەردەوام بن لەسەر بەخشینی ئەو باجە یاساییانەی لـەڕۆژگاری دەسـەڵاتی عوسمانیەکاندا دەیاندا، بەڵام بەمـەرجێك هـەوڵی گونجاندنییان بدرێت لەگەڵ بارودۆخـە نوێکـەدا.[٧٨] دواتـر ویلسـن لەرێکـەوتی ١٩١٨/١٢/١ دا بەفرۆکـە گەیشـتە سـلێمانی و لەنزیکـەوە چـاوی بەشـێخ مـەحمود و سـەرەك هـۆزە کوردەکان کەوت و گفتوگۆیان کرد، وەك خۆی باسـی لێوە دەکات لەگەڵ شێخ مەحموددا بەدوورو درێژی گفتوگۆیان کردووەو خەڵکی دەوروبـەری سلێمانی (ویلسن) یـان تـەواو دڵنیـا کـردووە کـە بـەزەبری هـێز دژی هاتنـەوەی تـورك دەوەستن، لەهەمان کاتیشدا ئاماژەیان بەوە کـردووە کە پێویسـتیان بـەجۆرێك لەپارێزگاریی و چاودێریی بەریتانیا هەیە، هەرچەندە ڕێکەوتنێك لـەنێوانیاندا نەبوو سەبارەت بەو شێوازەی بەمەبەستی پارێزگای دەگیرێتە بەر، ویلسن لـەم بارەیـەوە لـەدرێژەی قسـەکانیدا دەڵێـت (هـەندێك لەسـەرکردەکان حـەزیان بـە ئیدارەیەکی بەریتانی تەواو دەکرد لەکوردستان، بەڵام هەندێکی دیکە دژی ئەم مەسـەلەیە بوون، لـەکاتێکدا کەسـانێك هـەبوون حـەزیان بـەوە بـوو کوردسـتان

---

[٧٦] عبدالرقیب یوسف:شێخ مەحمود لە دوانزەهەمین ڕۆژی حوکمداری خۆیدا . زمانی کوردی لە دادگاکان دا کردە ڕەسمی ، کوردستانی نوێ ، ژمارە ( ٢٥٠٨ ) ، ساڵی ٢٠٠٠.

* بۆ نموونە جارێك شێخ مەحمود داوا لە (عەلی کەمالی باپیر ئاغا)ی شاعیرو کاتبی تایبەتی خۆی دەکات نامەیەکی بۆ بنوسێت، ئەویش بەفارسی نامەکەی بۆ دەنوسێت، کاتێك شێخ مەحمود پرسیاری ئەوەی لێدەکات ئاخۆ بۆ بەفارسی نوسیویەتی، عەلی کەمالی باپیر ئاغا لەوەڵامدا پێی دەڵێت (جا قوربان فەرقی چیە) شێخ لەم وەڵامە زۆر نیگەران دەبێت و فەرمان دەدات دارکاری بکەن . (عەبدول ڕەقیب یوسف : کوردستانی نـوێ ، ژمـارە ( ٢٥٠٨ ) ، ساڵی ٢٠٠٠)

[٧٨] ویلسن: هەمان سەرچاوە، ل١٥.

لەژێر دەسەڵاتی (لندن) دابێت نەك (بەغداد)، وەك باسی لێوە دەكات ژمارەیەكیش لەسەرەك هۆزە كوردەكان لەپەناوە ئەوەیان بۆ دركاندووە كە حەز بەسەركردایەتی شێخ مەحمود ناكەن. شێخ مەحمود دوای گفتوگۆ و لێكدانەوەیەكی ورد نوسراوێكی دابووە دەست ویلسن كە لەلایەن چل گەورە پیاوی كوردەوە مۆركرابوو، تێیدا خۆشحاڵی خۆیان دەربڕیبوو بەرامبەر بەوەی كە بەریتانیا لەژێر جەورو ستەمی تورك رزگاری كردوون و داوای ئەوەیان كردبوو كە لەژێر چاودێری بەریتانیادا بن و پشتگیری سەربەخۆیی و پێشكەوتنیان بكات. بەپێی قسەكانی (ویلسن)، بەریتانیاش بەڵێنی ئەوەی پێدابوون كە رێگر نەبێت لەپێش هیچ هۆزو خێڵێك كە لەنێوان زێی گەورەو سیروانلدا نیشتەجێ بێت و بیەوێت بچێتە ژێر سایەی حكومەتەكەی شێخ مەحمودەوە، تەنانەت وەك ویلسن ئاماژەی بۆ دەكات گوایە شێخ مەحمود داوای لێكردووە كە ئەفسەری ئینگلیزیی بۆ سەرجەم دائیرەكان رەوان بكەن و ئەفسەر بۆ سوپای (لیڤی) كوردیش بنێرن وەك چاودێر.[٧٩]

بەم شێوەیە ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە لەسەرەتاوە لێك گەیشتنێكی باش هەبووە لەنێوان شێخ مەحمودو دەسەڵاتی بەریتانیادا ، ئەو كاتەش ئینگلیزەكان لە دەسەڵاتی خۆیان دڵنیانەبوون لەكوردستان بۆیە زۆریان لامەبەست بوو سوود لەتواناو دەسەڵاتی شێخ مەحمود وەربگرن لەناوچەكەدا، نۆئێل لەو راپۆرتەیدا كە لە ١٩١٨/١٢/٨دا رەوانەی كردووە بەئاشكرا باس لەوە دەكات كە پێویستە بە چاوێكی سوكەوە نەڕواننە دەسەڵاتی شێخ مەحمود لەناوچەكەدا چونكە گەر بەچاكی ئەو سیاسەتە لێك بدەینەوە كە عوسمانیەكان لەم وڵاتەدا پەیڕەویان كردووە ئەوكاتە پاساوی ئەوەمان دەبێت كە تێڕوانینێكی شیاومان هەبێت بۆ هەڵس و كەوتەكانی شێخ مەحمود بەوپێیەی كە كارەكانی ئەو گوزارشتێكی سروشتیە لە نارەزایی و راپەڕین دژ بە جەورو ستەم لەلایەن زۆر لێكراوانەوە.[٨٠]

---

[٧٩] - سەرچاوەی پێشوو، ل١٦-١٧

[٨٠] - د. احمد عوسمان ابوبكر: مقترحات لأدارة المناطق الكردية بعد حرب العالمية الاولى، گۆڤاری كاروان، ژ. ٤٨

ئەم تێڕوانینانەی نۆئیل بۆ خۆی فاکتەرێکی باش بوو کە لەسەردەمی خۆیدا جۆرێك لەتەبایی و لێك گەیشتن لەنێوان ئینگلیزەکان و شێخ مەحموددا هەبێت، تەنانەت کاتێك دەنگ و چالاکی و هەوڵە دبلۆماتیەکانی (شەریف پاشای خەندان) * لەئارادا بوو وەك نوێنەری کورد لە کۆنفرانسی ئاشتیدا بەشداری کردبوو شێخ مەحمود وەك رەفیق حیلمی باسی لێوەدەکات و لەماڵەکەی خۆیدا بە ئامادەبوونی نۆئیل و کاربەدەستێکی دیکەی ئینگلیز کەوتبووە هەوڵی پشتگیری کردنی شەریف پاشاو بۆ ئەم مەبەستەش مەزبەتەیەك رێکخراوە بە ئیمزای ژمارەیەك لەسەرۆکەکانی کورد کە رەفیق حیلمی خۆی دەقەکەی نووسیووەو هەریەك لەسەید ئەحمەدی بەرزنجی (مەرخەس)و (رەشید کابان) ئەرکی ئەوەیان گرتۆتە ئەستۆ کە ئەم نووسراوی پشتگیریە بگەیننە شەریف پاشا لەپاریس و ویستوییانە لەرێگای (بەیروت) ەوە ئەم کارە بکەن بەمەستی شەرعیەت پێدانی کارەکانی شەریف پاشا بەڵام ئینگلیزەکان بە هاوکاری فەرەنسیەکان ئەم هەوڵەیان پوچەڵ کردۆتەوەو هەردوو نێردراوەکەیان دەستگیرکردووەو رەوانەیان کردوونەتەوە.[81]

ئەو سەردەمە خەڵکی زۆر دڵخۆش بوون بە چەسپاندنی ئاشتی و ئارامی و سەرەك هۆزەکان پێشوازیان لەم بارودۆخە کرد، هێندەی پێنەچوو

---

* محەمەد شەریف پاشا : کورە گەورەی ( سەعید پاشای خەندان ) ە و لە ساڵی ۱۸٦٥ لە ئەستەنبوڵ لە دایك بووە ، ساڵی ۱۸۹۸پۆستی وەزیری رێپێدراوی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم وەرگرتووە ، ساڵی ۱۹۱۲ بە غیابی حوکمی لە سێدارە دانی بۆ دەردەچێت لە تورکیا بە تۆمەتی بەشداری کردن لە کوشتنی ( شەوکەت پاشا ) ی سەدری ئەعزەمی عوسمانی ، ساڵی ۱۹۱۹ کاتێك کۆنگرەی ئاشتی بەسترا لە پاریس چەند یاداشتێکی پێشکەش کرد سەبارەت بە مافەکانی کورد و نەگەڕایەوە بۆ تورکیا تا ساڵی ١٩٤٤ لە تارلوگە کۆچی دوایی کرد . ( میر بصری : أعلام الکرد / ط ۱ ، لندن ، ۱۹۹۱ ، ل ۳۳ ) .

[81] -محەمەد عەبدڵڵا کاکە سوور: رۆڵی سیاسی و کەلتوریی ئەفسەرانی کورد لەبزاڤی کوردایەتی کوردستانی باشووردا، ۱۹۲۱- ۱۹٤٥. چاپی یەکەم، هەولێر، ل٣٦ ؛ ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب١، ل٢٢ ؛ رەفیق حیلمی: یاداشت، ل٦٥؛ سدیق ساڵح: رەشید کابان نوێنەرێکی کوردستانی باشوور (ساڵی ۱۹۱۹)، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە(٤)، ساڵی ۱۹۹۸.

بیرۆکەی (کوردستان بۆ کورد) لەژێر چاودێری بەریتانیادا بەنێو خەڵکیدا بڵاوبۆوەو هیچ گومانی تێدانەبوو کە بزاڤی جودا خوازی لەسلێمانیدا زۆر بەهێزبوو، هەر بۆیە ویلسن دەڵێت "ئەرکی سەر شانمان بوو سنوورێکی بۆ دابنێین"[٨٢]. بەڵام هەر ئەو کاتەش ئینگلیزەکان بەڵێنی ئەوەیان بەکورد دەدا کە هێندەی لەتوانادابێت هەوڵدەدەن فەرمانبەرانی نێوچەی حوکمداریەتی شێخ مەحمود کورد بن و[٨٣] بودجەی تایبەت بۆ نێوچەکە تەرخان بکرێت بەمەبەستی بەڕێوەبردن و پێشخستنی ناوچەکە.[٨٤]

بەڵام بەڕێوەبردن و حوکمداری کردنی سلێمانی لەو ڕۆژانەدا هێندە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە گەلەك بیرو باوەڕی جیاواز پەیدابووبوو.[٨٥] تەنانەت هەندێك لەئاغاو خاوەن موڵکەکان لەبەرژەوەندیی خۆیان دەترسان و کەوتبوونە دڵە ڕاوکێ، هۆکاری ئەم ترسەشیان دەسەڵاتی بەریتانیا بوو، ئەوان لەوە دەترسان بەشێکی زۆری زەویەکانیان لێ بسەندرێتەوە، چونکە تاپۆیان نەبوو بەزۆر دەستیان بەسەردا گرتبوون. بەڵام وەك (مس بیل) دەڵێت ئەو ڕۆژگارە هیچ کارێکیان دژ بەو توێژەی خەڵکی سلێمانی ئەنجام نەداوە هەرچەندە کەمینە بوون لە شاری سلێمانی و دەورو بەریدا بەرامبەر خەلکی ڕەشۆکی، بەڵام دەسەڵاتدارانی بەریتانیا تەنانەت تۆماری (تاپۆ)شیان ڕەوانەی بەغدا نەکردووە نەبادا پێیدا بچنەوە، بۆیە هەر لەسلێمانی هێشتوویانەتەوە.[٨٦]

ئەم حاڵەتەش باشترین گەواهیە بۆ نەبوونی سیاسەتێکی ڕوون و بەرجەستەی ئینگلز لە کوردستاندا، بەڵکو وەك (واسیلی نیکتین) باسی لێوەدەکات سیاسەتی ئەو کاتەی بەریتانیا لەکوردستان سیاسەتی دەست

---

[٨٢] بلاد مابين النهرين، ل٢٣،١٦

[٨٣] مس بیل: هەمان سەرچاوە، ل٩٨-٩٩، ویلسون: هەمان سەرچاوە ل٢٣.

[٨٤] د. احمد عوسمان ابوبکر: مقترحات لأدارة المناطق الكردية، کاروان ٤٨-١٩٨٦.

[٨٥] علائەدین سجادی: هەمان سەرچاوە، ل٩٧.

[٨٦] فصول من تاريخ العراق، ل٩٧.

بەگۆجان و کوتڕ کوتڕ بووە.[٨٧] جگە لەمەش خودی حوکمدار خۆی کەسێکی کەم ئەزموون و نوێ بووە لەبواری سیاسەت و حوکمڕانیدا بۆیە کەوتبووە بارێکی زۆر ناسکەوەوکەسانێکی شایستەو لێوە شاوەشی لەچوار دەور نەبوو، زیاتر ئەوانە خۆیان لێ نزیک کردەوە کە بەدوای دەسکەوت و موچەو پلەو پایەدا دەگەڕان، هەر ئەمانەش ببوونە هۆی ئەوەی کە کەسانی نیشتمانپەروەرو خوێندەوار دوورە پەرێز بوەستن.[٨٨] لەلایەکی دیکەشەوە، کەسێکی وەك نۆئیل زۆر لەهەوڵدا بوو بۆ کەم کردنەوەو نەهێشتنی ناکۆکیەکانی نێوان حکومەتەکەی خۆی و شێخ مەحمود، لەسەرەتاوە ڕێنوێنی دەسەڵاتدارانی سەروو خۆی دەکرد کە دڵی شێخ مەحمود رابگرن و کەسانێك بەڕاوێژکارو دەسەڵاتدار و نوێنەر دابنێن کەشێخ مەحمود ڕەزامەندی لەسەریان بێت و بەو نوێنەرانەش رازی بن کە شێخ مەحمود دەست نیشانیان دەکات و تا دوا ئەندازە هەوڵبدرێت سوود لە تواناو دەسەڵاتی شێخ مەحمود وەربگیرێت و سیاسەتی پاراستن و پارێزگاری کردن لەڕووی دەرەوەی حوکمداریەتیەکەی بگرێتە بەر[٨٩] ئیدی وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد نۆئیل توانی لەو ماوەیەدا کە لەسلێمانی بوە هێندەی لەتوانایدا بێت پارێزگاری ڕەوشەکە بکات و ئارامی بپارێزێت، بەڵام دواتر لە کۆتایی مانگی کانوونی یەکەمدا نۆئیل سلێمانی جێ هێشت بەمەبەستی ڕێکخستنەوەی باری ناوچەکانی ڕۆژئاواو باکوور تا ڕەواندز چوو. دوای چەند هەفتەیەك گەڕایەوە،[٩٠] سلێمانی و شێخ مەحمودی لەبارێکی دیکەدا بینی و بەدڵی نەبوو.[٩١] بەڵام ئەو کاتە ئینگلیزەکان لەمێژبوو بڕیاریان دابوو سنورێك بۆ دەسەڵات و فراوانخوازی شێخ مەحمود دابنێن، هەر بۆیە ئەفسەرەکانیان

---

[٨٧] کوردو کوردستان، وەرگێڕ، هێدی، هەولێر، ١٩٩٨، ل٥٨١.
[٨٨] ڕەفیق حلمی: یادداشت،ب١، ل٦٧-٦٨
[٨٩] د. احمد عوسمان ابوبکر: مقترحات لأدارة المناطق الكردية، كاروان ٤٨-١٩٨٦.
[٩٠] ویلسون، هەمان سەرچاوە، ل٢١.
[٩١] ڕەفیق حیلمی: یاداشت،ب١، ل٦٩.

بەهەموو شێوەیەك دەستیان لەكاروباری حكومەتەكەی شێخ مەحمود وەردەدا، ئەویش هێندە بە ئاسانی ئەم هەڵس و كەوتانەی بۆ قووت نەدەچوو، بۆیە لای خۆیەوە بڕیاری دابوو ئاستێك بۆ ئەم دەست درێژیانەیان دابنێت، هەروەك مس بیل دەڵێت "شێخ مەحمود هەرگیز ئەوەی لەئێمەی قەبووڵ نەدەكرد كە دەست بخەینە ڕێگای و دەسەڵاتەكەی سنوردار بكەین".[92]

بەم شێوەیە ئینگلیزەكان بەهەموو شێوەیەك لەهەوڵی ئەوەدا بوون چارەسەرێكی بۆ بدۆزنەوە چونكە شێخ مەحمود گەورەترین كێشەبوو لە پێشیان.[93]

بێگومان گەورەترین كێشەی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەكاندا بریتی بوو لە دیاریكردنی سنوری جوگرافی كوردستان و نا ڕۆشنی چەمكی وشەی حوكمدار،[94] ڕەسوڵ هاوار لەزاری شێخ ڕەئوفی كوڕی شێخ مەحمود دەگێڕێتەوەو دەڵێت " ئەو ڕۆژانەی باوكم كرا بە حوكمدار وشەی حوكمدار لای ئێمە نەبیسترابوو، هەندێ جار بەمانای (مەلیك) لێك ئەدرایەوەو خەڵك هەموو لایان وابوو ئەو دەزگایەی لە سلێمانیدا پێك هێنرابوو بریتیە لەوەزارەتێكی كورد لەناو دەوڵەتێكی كوردی گەورەدا كە لەدوایدا دەزگاكانی تەواو ئەكرێن"، هەروەها شێخ باس لەوە دەكات كە سەید حەسەنی مامی شێخ مەحمود هەر لەسەرەتاوە ڕەخنەی لە شێخ مەحمود گرتبوو كە وشەی (حوكمدار) وشەیەكی ئاڵۆزەو بەگەلەك شێوە لێك ئەدرێتەوەو شتێكی روون نیە، بۆیە پێویستە قەبوڵی نەكات و داوا بكات بۆی روون بكەنەوە.[95]

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە كە ئەم بەدحاڵی بوون و لێك نەگەیشتنەی نێوان شێخ مەحمودودەسەڵاتدارانی ئینگلیز لە ڕۆژگاری یەكەم حوكمداریەتی شێخ مەحمودد‌ا بۆ دوو هۆكار دەگەڕێتەوە یەكەمیان: سڵ

---

[92] مس بیل: هەمان سەرچاوە، ل٩٩-١٠٠

[93] ویلسون: هەمان سەرچاوە ل٢٣.

[94] نەوشیروان مستەفا ئەمین: چاوپێكەوتن كوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٢٠، سالی٢٠٠٠ .

[95] شێخ مەحمودی قارەمان، ب١ ل ٤٠٨-٤٠٩

کردنەوەی گەورە پیاوانی سلێمانی بووە لەوەی کە نەیان وێراوە وەك پێویست بچنە بنج و هەموو قسەو گوفتارەکانی کار بەدەستەکانی ئینگلیز لەوە ترساون نەبادا، بەدواداچوونی زۆری ئەو مەسەلانە ببێتە هۆی دڵ زویر بوونی هەندێك لەسەرەك هۆزەکانی کورد کەئەو رۆژانە لە سلێمانیدابوون.[٩٦] دووەمیش بۆ ئەو نیهاد پاکیەی خەڵکی سلێمانی دەگەڕێتەوە بەرامبەر بە ئینگلیزکە چەند هیوایان پێی هەبووە، بەڵام ئەوان دوای ئەوەی شوێنی خۆیان قایم کرد بڕیاری ئەوەیان دابوو کە دەسەڵاتی شێخ مەحمود سنووردارکەن، هەربۆیە کەوتنە بنکوڵ کردنی دەسەڵاتەکەی و هەوڵیان دەدا کارێکی وابکەن شێخ مەحمود پاشگەز بکەنەوە. بۆ ئەم مەبەستەش بەڕێوەبەری گومرگی سلێمانی کە ئینگلیزێکی فارسی زان بوو بەئاشکرا بەشێخ مەحمودی وتبوو کە بەناوی بەریتانیاوە داوای لێدەکات واز لە حوکمدارێتی بهێنێت، بەرامبەر بەوەی کە هەرچی زەوی و زاری میرییە بخرێتە ژێر دەستی‌یەوەو تا ئینگلیزەکانیش لەعێراقدا دەسەڵاتداربن وەك جاران موچەکەی خۆی پێبدەن.[٩٧] جگە لەوە کەوتنە بڕوبیانوو دۆزینەوەو تانەو تەشەر دان لە شێخ مەحمود، بەوەی کە کەسێکی کەللە رەق و هەرزەکارەو لەئەرك و فەرمانی حوکمداری سڵ دەکاتەوەو پێی بەڕێوە ناچێت، ویلسن و مس بیل لەم بۆچوونەدا هاوبیربوون.[٩٨] لەکاتێکدا تەنانەت لەنێو ناوەندە سیاسیەکانی بەریتانیاشدا بەچاوی گومانەوە لە نوئیل یان دەڕوانی و بەلایەنگیری کوردیان دەزانی. (هۆهلەر)ی سکرتێری نێردراوی بەریتانیا لە (ئەستەمبوڵ) لەبروسکەیەکیدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی لە (لندن) راشکاوانە باس لەوە دەکات کە نوئیل لایەنگیری کوردەو پەیامبەریانەو پێی وایە کورد لەوێنەی نیەو خەڵکێکی باش و خانەدانن، هەر بۆیە نوئیل بە (لۆرانسی کورد) ناودەبات[٩٩] هەر بۆیە نوئیل لەلایەن (ویلسن)ەوە بانگ کراوەو بە کارێك رەوانەی کوردستانی باکور کراو

---

[٩٦] سەرچاوە ی پێشوو، ل٤٠٩

[٩٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٦

[٩٨] ویلسون: هەمان سەرچاوە، ل٢١-٢٣.

[٩٩] د. احمد عوسمان: ابوبکر: کوردستان في عهد السلام، مجلة الثقافة، عدد ١، کانون الثاني ١٩٨٠.

(مێجەر سۆن) خرایە شوێنەکەی، ڕەفیق حیلمی پێی وایە کە نوئیل بەویستو ڕەزامەندی خۆی سلێمانی جێهێشتووە .[١٠٠] بەڵام ڕەسوڵ هاوار بەپشت بەستن بەدەقی ڕاپۆرتێك کە (نۆئێل) ڕەوانەی کردووە ئەم مەسەلەیە ڕەت دەکاتەوەو دەڵێت: "بەپێویستم زانی کە شتێکی زۆر گرنگ هەیە دەربارەی ئەو ڕۆژانە روونی بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە مێجر نۆئێل لابرا، دوای ئەوەی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر بەکوردستان گۆڕاو مێجەر سۆن نێردرا بۆ سلێمانی و کرا بە حاکمی سیاسی بۆ ئەوەی ئەو سیاسەتە نوێیەی کە کاربەدەستانی بەریتانیا بڕیاریان لەسەر دابوو لەخوارووی کوردستاندا جێبەجێ بکرێت".[١٠١]

کاتێك نۆئێل خۆشی لەراپۆرتێکدا وەڵامی ڕەخنەو سەرزەنشتەکانی سۆن دەداتەوەو دان بەو ڕاستیەدا دەنێت کە لابراوەو لەناواخنی راپۆرتەکەیدا راشکاوانە ئەوە دەردەخات کە تا خۆی لەسلێمانی بوو هیچ پشێویەك لەئارادانەبوو بەڵام تەنها دوو مانگ دوای هاتنی سۆن شۆڕش هەڵایساو هێز بەکارهێنرا، هۆیەکەشی دەگێڕێتەوە بۆ کارو کردەوە پێچەوانەکانی سۆن، نۆئێل لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت: " هەتا کاتی لابردنم، شێخ مەحمود بەپێی ئەو نەخشەو دەستورە دەجوڵایەوە کە بۆی دانرابوو، دەمان زانی حوکمڕانی شێخ مەحمود لەکاروباردا هەندێ هەڵەو ئارەزوکاری تێدابوو، بەڵام بەلای منەوە مافی خود موختاری ئەوە ئەگەیەنێت کە پیاو بتوانێت بەڕاستی یا بەچەوتی کاروباری خۆی ببات بەرێوە، من هیوای ئەوەم هەبوو کە ئامۆژگاری دۆستانەو کار ڕێکخەری کاربەدەستی سیاسی جێنشینم بکەم، تا لە چەوتو چەوێڵی حوکمەکەی کەم بکاتەوە، بەڵام بڕیاری گۆڕانی سیاسەت بەرامبەر بەکوردستان دەرچوو بەبێ ئەوەی ئەو پرسیارانەی کە لە ناوچەکەدا هەبوون بخرێتە بەرچاوو لێك بدرێتەوە".[١٠٢]

---

[١٠٠] ڕەفیق حیلمی: یاداشت،ب١، ل٧١.

[١٠١] شێخ مەحمودی قارەمان،ب١،ل٤٥٨.

[١٠٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦١.

بەم شێوەیە (ویلسن) لای خۆیەوە بریاریدا سۆن بخرێتە شوێنەکەی نۆئێل، ناوبراو لەگەڵ هاتنیدا لەرێگای کفرییەوە کەوتە تاقیکردنەوەی دەمو دووی سەرەك هۆزەکانو دنە دانیان دژ بە شێخ مەحمودو سیاسەتێکی بۆ خۆی دارشت کە پێرەوی بکات.[١٠٣] کاتێك هەواڵی گەیشتنی سۆن چەند رۆژێك پێشتر گەیشتە سلێمانی، گرینهاوس بەمەبەستی رێکخستنی رێوە رەسمی پێشوازی کردنی حاکمی سیاسی نوێ، شێخ مەحمودی ئاگادارکردەوە، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر سوارو پیادە بەرێز لەپێشوازیدا وەستانو چادرێکی زۆر لەدەشتی (موشیر ئاوا) هەڵدرا. بەلام کاتێك (سۆن) گەیشتە جێ هیچ بایەخێکی وەهای بەشێخ مەحمود نەداو پشت گوێی خست ئەم حاڵەش خۆی لەخۆیدا دەسپێکی تێکچونی پەیوەندیەکانی نێوانیان بوو هەر بۆیە شێخ مەحمود خۆی و سوارەکانی گەرانەوە بۆ سلێمانی.[١٠٤]

ویلسن خۆی ئاماژەی پێدەکات کە(سۆن) کەسێکی زۆر شارەزا بوو لە ناوچەکەدا، ئیدی لەگەڵ گەیشتنیدا، ئینگلیزەکان شاری سلێمانیان پر کرد لەدارو دەستەو کاربەدەستی خۆیان لەعەرەبو عەجەمو هندیو ئەفغانیو ئەرمەنیو سیكو هندۆس ، ئەمانە لەگەڵ دەستەو دایەرەی ئەو رۆژگارەی شێخ مەحمود، بەهەر دوولا خەڵکی سلێمانیان سەغڵەت کردبوو، تەنانەت هەندێ کەس لەمانە ببوون بە (پۆلیس)و نۆکەری ئینگلیزو سیخور.[١٠٥]

جگە لەمەش، لەئەنجامی کارو کردەوەی دەست و پێوەندەکانی شێخ مەحموددا، ئەو ئەفسەرە کوردانەی کە گەرابوونەوە بۆ سلێمانی، بەشی زۆریان دڵیان لەشێخ مەحمود زیز بوو لێی رەنجابوون. ئەمانە لەو کاتەدا بەشی هەرە زۆریان چوونە نێو ریزی سوپای (لیفی) کە بەرواڵەت لەژێر فەرماندەیی (شێخ قادر)دا بوو، بەلام لەراستیدا (دانلێس) سەرپەرشتیو چاودێری دەکردن، ئەمە جگە لەوەی کە (گرینهاوس)ی یاریدەرەی سۆن

---

[١٠٣] مس بیل : هەمان سەرچاوە، ل٢٠٠.

[١٠٤] ئەحمەد تەقی: بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆرشەکانی شێخ مەحمود و سمکۆ، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٨، ل١٤ ؛ ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب١، ل٣٠.

[١٠٥] لازاریف: المسألة الكردية، ١٩١٧-١٩٢٣، ل٤٤، رەفیق حیلمی: یاداشت، ل٧٧-٧٨.

هێندەی لەتوانیدا بوو دەستی لەكاری خراپ و نەشیاو نەدەپاراست[106] دەسەڵاتدارانی بەریتانیا تەواو كەوتنە خۆ بۆ هەڵوەشاندنەوەی داموو دەزگاكەی شێخ مەحمود، وەك (سندرسن پاشا) باسی لێوە دەكات، شێخ مەحمود ئەو سەردەمە وەك دڕكێك وابوو لە لا كەلەكەی ئیدارەی عێراقدا.[107] هەرچەندە شێخ مەحمود زۆری لامەبەست بوو كە تا دوائەندازە لە گەڵ ئینگلیزدا هەڵ بكات و نێوانیان تێك نەچێت، تەنانەت(ئەحمەد تەقی)باس لەوە دەكات كە كاتێك گەڕاوەتەوە سلێمانی لە(ئەستەنبوڵ)ەوە نامەیەكی(شێخ عەبدولقادری شەمزینی) پێبووە بۆ شێخ كە تێیدا داوای لێدەكات لە گەڵ ئینگلیزدا ئیدارە بكات، دەڵێت "كە گەڕامەوە بۆ سلێمانی تەماشام كرد وەزعی سلێمانی باش نیە، چووم بۆ مزگەوتی گەورە بۆ خزمەت(مەلا محەمەدئەمین)و ئەحواڵی شێخ مەحمودم لێ پرسی،فەرمووی ئێستا كە گرینهاوس موستەشاری سیاسی، فیكرو حەرەكەتی باش نیە لە گەڵ شێخ مەحمود، بۆ بەیانی چوومە خزمەتی شێخ مەحمود نامەكەی شێخ قادرم دایە و ڕاسپاردەكانم پێووت" جەنابی شێخ مەحمود فەرمووی "من تەرەفداری ئیدارەكردنم لە گەڵ ئینگلیزەكان، وەلا كین ئەوان بەهانەم پێئەگرن و بە هەموو نەوعێك هەوڵ ئەدەن بۆ دەست كورت كردنەوەم"[108] مەبەستەكانی ئینگلیزیش لە هەڵس و كەوتی كاربە دەستەكانیانەوە بەدەردەكەوێت بە تایبەت لەو گەشتەدا كە كابتن (بێل) ی یاریدەدەری حاكمی سیاسی بە یاوەری ڕەفیق حیلمی بە نێو عەشایرەكانی سلێمانیو هەولێرو كەركوكدا كردوویەتی و تێیدا زۆر بەوردی نەخشەی هەرێمەكانی كێشاوەو كەوتۆتە ژماردنی سوارەو پیادەیان و پەیوەندییو ناكۆكیان لەگەڵ شێخ مەحمودو چەكەكانیانی تاقی كردۆتەوەو پیشكنیویەتی، لەهێزو دەسەڵاتی ئەو هۆزە كوردانە وردبۆتەوە، ڕەفیق حیلمی كە لەو گەشتەدا تەرجەمەی بۆ كردووەو

---

[106] ئەحمەد خواجە: چیم دی،ب١، ل٢٤: ڕەفیق حیلمی، یاداشت،ب١، ل٨٥.

[107] سندرسن پاشا: مذكرات سندرسن پاشا، ل١٣٩

[108] بیرەوەرییەكانی ئەحمەد تەقی،ل١٤

دەڵێت "لەراپرسیەکی منداڵانەدا ئەوانەی کە بۆنی ناحەزی شێخ مەحمودیان لێ دەهات دەبوون بە ئاغاو کوێخاو رەئیس "[١٠٩]

بەم شێوەیە لەگەڵ هاتنی (سۆن) دا شێخ مەحمود زیاتر رەشبین بوو لە بارودۆخەکەو هەر ئەو کاتە لەفکری ئەوەدابوو کە نوێنەری خۆی بنێرێت بۆ تاران تاوەکو لای باڵوێزخانەی دەوڵەتان سکاڵا لەهەڵس و کەوتی حکومەتی بەریتانیا بکەن.[١١٠]

چونکە شێخ مەحمود کەسێك نەبوو هێندە بەئاسانی جڵەو بکرێت بە ئنگلیز بەڵکو شێخ مەحمود تەمای ئەوەی هەبوو سنوری دەسەڵاتەکەی فراوان بکات و لەژێر سایەی بەریتانیادا دەسەڵاتێکی سەربەخۆ پێکەوە بنێت.[١١١]

لەبەرامبەریشدا ئینگلیزەکان هەوڵیان دەدا دەسەڵاتی شێخ مەحمود تەنها لەنێو شاری سلێمانی و دەوروبەریدا قەتیس بکەن،[١١٢] بۆ ئەم مەبەستەش یەکەم هەنگاویان شکاندنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود و کەم کردنەوەی مانگانەکەی بوو، کە کردیان بە (١٠) هەزار روپیە. دواتریش، لەرانیە، کەوتنە هەوڵدان بۆ دەرپەڕاندنی ( شێخ ئەمینی سندۆڵان )، لەم بارەیەو زۆر خۆیان لەگەڵ گەورە پیاوو ئاغاکانی ناوچەکەدا ماندوو کرد کە بیان کەن بە گژ (شێخ ئەمین) دا. کاتێکیش لەم کارەیاندا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، لەسلێمانی شێخ مەحمودیان ناچارکرد بە بروسکە لەسەر کار لایبات.[١١٣] دواتریش ئەفسەرێکی سیاسیان رەوانەی هەڵەبجە کرد کە ناوی (لین) بوو، لەو ناوچەیەدا عادیلە خانمی خێزانی وەسمان پاشای جافیان لەشێخ مەحمود

---

[١٠٩] یاداشت،ب١، ل٨٢-٨٣.

[١١٠] ئەحمەد تەقی: یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی، ل١٤-١٥.

[١١١] لوسیان وامبد: الکرد والحق، ترجمة، عزیز عبدالاحد نباتی، اربیل، ١٩٨٨، ل٧٤-٧٥. لازاریڤ: المسالة الکردیة، ١٩١٧- ١٩٢٣، ل٤٣.

[١١٢] دانا ادم شمدت:رحلة الی الرجال الشجعان، ل٨٣:حسن ئەرفەع:کوردەکان،و/سەردارمحمد،سلێمانی،٢٠٠١ل١٦٤.

[١١٣] رەفیق حیلمی: یاداشت، ب١، ل١٠٠.

راست كردەوە كە ناوبراو خۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا هێندە تەبا نەبوو، بەم شێوەیە دەسەڵاتی شێخ مەحمودیان لەهەڵەبجەو دەوروبەریدا كز كرد.[114]

لەناو سلێمانیدا تا دەهات ناكۆكیەكانی نێوان شێخ مەحمودو سۆن زیاتر پەرەی دەسەند، سۆنیش وەك ئەدمۆندز باسی دەكات كەسێكی توندو تیژ بووە لەبیروراكانیداو لە هەڵس و كەوتیشدا توند رەو بووە.[115]

هەر بۆیە شێخ مەحمود لای خۆیەوە گەیشتە ئەو باوەڕەی كەوا پێویست دەكات دەستی ئینگلیز لەنێو دامو دەزگای حكومەتەكەیدا ببڕێت، وەك شێخ لەتیف لەیاداشتەكانیدا باسی لێوە دەكات ئنگلیز خۆیان لەهەموو مەسەلەیەك هەڵقورتاندوەو لەهەموو شوێنێك ژەهریان رشتووە.[116] خەڵكی سلێمانیش بەشێوەیەكی گشتی ئەو رۆژانە لەبارودۆخێكی باشدا نەبوون .(مس بیل) ئاماژە بەراپۆرتێكی ئیداری سۆن دەكات كە لەساڵی ١٩١٩ دا رەوانەی كردووەو، تێیدا باسی لەوە كردووە كە خەڵكی سلێمانی هێشتا لە باری قاتو قڕیدان و ئامادەی مۆركردنی هەموو شتێكن تەنها لەپێناوی وەدەست هێنانی خۆراك و بەرقەرابوونی ئاسایشدا[117] كە پێدەچێت سۆن لەم راپۆرتەدا زۆر راستگۆ نەبوبێت، چونكە هەروەك (ویلسن و نۆئێل)یش باسی لێوە دەكەن هێشتا ئەو رۆژگارە خەڵكی بەو شێوەیە خۆیان نەدۆڕاندووەو پشتیان لەشێخ مەحمود نەكردووە، بەڵكو لەنێو هەر پێنج كەسدا چواریان لایەنگری شێخ مەحمود بوون.[118]

كاتێك مەرامەكانی ئینگلیز بەتەواوی ئاشكرا بوون خەڵكی لەنێو سلێمانیدا كەوتنە نارەزایی دەربرین، بەتایبەت دوای ئەوەی سۆن كەوتە

[114] یاداشتەكانی شێخ لەتیف حەفید، ل٥١.

[115] ئەدموندز: هەمان سەرچاوە، ل٣٧.

[116] عەلائەدین سجادی: هەمان سەرچاوە، ل٨٥.

[117] فصول من تاريخ العراق، ل٩٥.

[118] ویلسون: هەمان سەرچاوە، ل٢٣.

ئازاردانی خەڵکی و گرتن و زیندانی کردنیان و قەدەغە کردنی هات و چۆی شەوانەیان لەنێو شاردا .[١١٩]

ڕەفیق حیلمی، لەبارەی ئەو سیاسەتەی (سۆن)ەوە دەڵێت "خەڵق گومانی تیا نیە، لەڕوودا دەنگیان نەدەکردو ( لێو )یان بەر لێو نەئەنا، بەڵام لەتاقمی دوو ڕوو موونافیقەکان بەو لاوە کەس نەمابوو لەم حاڵەتە وەڕس نەبووبێ، شاری سلێمانی وەك (مەنجەڵ)ی سەرئاگر قوڵپی ئەدا"[١٢٠] بەتایبەتی پاش ئەوەی کردەوەکانی سۆن لەنێو سلێمانیدا گەیشتە ئەندازەیەك لەتوانادا نەمابوو بێ دەنگی لێبکرێت، کار گەیشتبووە ئەندازەیەك، دەبوایە کاتێك سۆن بە بازاڕدا تێپەر دەبێت خەڵکی لەبەری هەڵسن، یا گەر جاسوسێك نەخۆش بکەوتایە دەبوو گەورەو بچوك بچن بۆ سەردانی *.[١٢١]

هەر ئەم هەڵس و کەوتانەش ئەو باوەڕەی لای شێخ مەحمود دروست کرد کە پێویستە دەست پێشکەری خۆی بکات، ئەوەبوو لەژێرەوە کەوتە ناردنی نوێنەر بۆ شارەکانی خواروی عیراق، بۆ ئەوەی دەمیان تاقی بکاتەوەو بزانێت ئنگلیز لە شوێنەکانی دیکە لەچ بارێکدایە. دواتر بەنهێنی نامەیەکی ناردبۆ (مەحمود خانی دزڵی)** و داوای لێکرد کە بەخۆیی و هێزەکەیەوە بگاتە سلێمانی، کاتێك مەحمود خان گەیشتە ناوچەی شارباژێر، (سۆن) بەم

---

[١١٩] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل٥٢-٥٣.

[١٢٠] یادداشت،ب١، ل١٠٩.

* ڕەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا باس لەوە دەکات کاتێك ( حەییوم ئەفەندی ) ناوێکی جولەکە کە پیاوی مێجەرسۆن بووە ئەو ڕۆژگارە کەمێك ناساغ بووە ، بە چاوی خۆی بینیوویەتی چۆن دەستە دەستە پیاو ماقوڵ بەرەو گەڕەکی جولەکان شۆر بوونەتەوە و چوونەتە سەردانی ( حەییوم ئەفەندی ) نەبادا دڵی سۆنیان لێ بڕەنجێت. ( یادداشت ، ب١ ، ل١٠٨-١٠٩ ) .

[١٢١] سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨.

** مەحمود خانی دزڵی کوڕی ( عەزیز خان) ە کوڕی ( بارام بەگ ) ە ساڵی ١٨٧٠ ز لە ئاوایی ( دزڵی ) ناوچەی هەورامانی تەخت لە دایك بووە . ( عومەر مەعروف بەرزنجی : مەحمود خانی دزڵی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەلاتی کوردستان / چاپی دووەم ، سلێمانی ٢٠٠٠ ، ل ٣١ ).

هەواڵە زۆر نیگەران بوو بۆیە نامەیەکی بۆ شێخ رەوانە کردو داوای لێکرد ریگا نەدات مەحمود خان بە چەکدارەکانیەوە بێتە ناو شارەوە، گەر هەر بەنیازیشە بێت ئەوا دەبێت تەنها خۆی و دەکەس بەبێ چەك بێن ، گەر چەکداریش بن ئەوا دەبێت لەرێگاوە چەکەکانیان لەپۆلیسخانە دابنێن، بەڵام شێخ لەوەڵامدا بە (سۆن)ی راگەیاند، کە هەرگیز رووی نەداوە رێگە لەکەس بگیرێت کە بیەوێت سەردانی گلکۆی (کاك ئەحمەدی شێخ ) بکات، هەروەها هەوڵیدا سۆن لەو بریارەی پاشگەز بێتەوە، بەڵام سۆن سوور بوولەسەر رایەکەی خۆی، بەڵام مەحمود خانی دزلی رۆژی ٢٠ی مایسی ١٩١٩ گەیشتە سەر کەلی گوێژە.

لەم بارودۆخەی سلێمانیدا سۆن بەبیانوی پێشوازیکردنی خێزانەکەی سلێمانی جێهێشت و فەرمانی بەرەنگاربوونەوەی دا بە مێجەر دانلێس، ناوبراویش، رۆژی ٢١ی مایسی ١٩١٩ فەرمانی دا بەسوپای لیڤی کە بچن بۆ بەرەنگاری مەحمود خانی دزلی، هەر بۆیە هێزی لیڤی بەرەو بناری گوێژە بەرێکەوتن، سوارەی لیڤی لەژێر فەرمانی (جەمال عیرفان) دا بوون، بەڵام هێزی پیادە (رەزابەگ) پێشەوایەتی دەکردن، ئەو رۆژە تا دەمەو ئێوارە بەرگریان کرد بەڵام دواتر هەموویان کشانەوەو خۆیان گەیاندەوە شارو تێکەڵ بە لایەنگرانی شێخ مەحمود بوون، بەتایبەتی سوارەکان بە فەرماندەیی (جەمال عیرفان) هەر زوو کشانەوە، بەڵام (رەزا بەگ) لەگەڵ هێزەکەیدا تا درەنگ بەرەنگاری کرد.[١٢٢]

بەم شێوەیە مەحمود خان و هێزەکەی گەیشتنە ناو شارو لەیەکەم کرداریاندا پەلاماری بارەگای (گرینهاوس)ی یاریدەدەری حاکمی سیاسیان داو سەرجەم فەرمانبەرو دەستەو دایەرەکەیان دەستگیر کردن، بەڵام دواتر هەموویان ئازادکردن، ئەفسەرە ئینگلیزەکان نەبێت کە ژمارەیان شەش کەس بوو، بریتی بوون لە (مێجر گرینهاوس، کاپتن دۆگلاس، کاپتن هۆلت، کاپتن رایت، مێجر دانلێس، شکۆفێل).

---

[١٢٢] ئەحمەد خواجە: چیم دی،ب١ ، ل٣٧،٣٨،٣٩.

ئەم ئەفسەرە ئنگلیزانەش بەبیانووی پاراستنیان لەدەست درێژی چەکدارانی کورد لەبینای (دەبۆکە) زیندانی کران، بەڵام شێخ مەحمود رێزێکی زۆری لێنان و هیچ کردەوەیەکی خراپی بەرامبەر نەنواندن.

کاتێك ئەم رووداوە قەوماوە، رێگای کەرکوك — سلێمانی بڕاو، هێڵی تەلەگرافیش لەلایەن کوردەکانەوە بڕا، بەم شێوەیە شاری سلێمانی لەلایەن شێخ مەحمودەوە کۆنترۆڵ کراو،[١٢٣] عیزەت نەجیب بە فەرمانی شێخ مەحمود چووە سەربانی دائیرەی سیاسی بەریتانیا و ئاڵاکەی داگرتن و ئاڵای کوردستانی لەشوێنەکەی هەڵکرد،[١٢٤] کە قوماشێکی سەوزبوو مانگێکی سوری تێدابوو، پاشانیش لەماوەیەکی کورتدا دەستگیرا بەسەر خەزێنەی بارەگای هێزی سەربازیدا، بەڵام بەهۆی پچڕانی هێڵی تەلگرافەوە ئینگلیزەکان دوای سێ ڕۆژ هەواڵی ئەم ڕاپەڕینەی سلێمانیان پێگەیشت.[١٢٥]

ویلسن لەم بارەیەوە دەڵێت :" کاتێك ئەم هەواڵانەم پێگەیشت، یەکسەر بەفرۆکە بەرەو سلێمانی چووم، هەر شەش، ئەفسەرە ئینگلیزەکەم لەسەربانی زیندانەکەیان بینی لە سلێمانی"[١٢٦]

شێخ مەحمودیش لە سلێمانیدا بەپێی فرمانێکی حوکمداری لە ٢٢ی مایسی ١٩١٩ دەستەی بەڕێوەبەری کاروباری حکومەتی کوردستانی دیاری کرد کە لەم کەسایەتیانە پێك هاتبوو؛-

١-سەید عومەر - سەرۆك

٢-ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ - ئەندام

٣-سەید کەریم سەید ئەحمەد - ئەندام

٤-شێخ عەلی سەرکار - ئەندام

---

[١٢٣] ڕەفیق حیلمی: یادداشت،ب١، ل١١٥ ؛ عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج١، ل٢٧٠-٢٧١.

[١٢٤] ئەحمەد خواجە: چیم دی،ب١، ل٥٤-٥٥ ؛ جلال الطالباني: هەمان سەرچاوە، ل١٢١،١٢٢.

[١٢٥] وەلید حەمدی: هەمان سەرچاوە، ل٥٨،٥٩.

[١٢٦] بلاد مابين النهرين، ل٢٦

٥-حمە ئاغای ئەورحمان ئاغا - ئەندام

٦-صالح پاشا - ئەندام

٧-حەمەبەگی قادر پاشا - ئەندام

ئەحمەد ئەفەندی خواجە ئەفەندی - نووسەر[١٢٧]

شێخ مەحمود دوای ئەم هەنگاوە، وا پێویستی دەکرد کە خۆی بۆ بەرەنگاری بوونەوەی ئینگلیزەکانو بەرگری کردن ئامادە بکات، هەر بۆیە لە سەرەتادا هێزەکەی پێشڕەویان کرد بەرەو تاسلۆجەو لەوێ خۆیان قایم کرد، هێزەکانی بەریتانیاش، لەسەرەتادا توانای سەبازی شێخ مەحمودیان بەهەند نەگرتبوو، لە ئەنجامی ئەم لێکدانەوە هەڵەیەیاندا فەرمانیان بە هێزێکی سوکەڵەی خۆیاندا لە کەرکوکەوە پێشڕەوی بکات بەرەو چەمچەماڵ، بەڵام وەك ویلسن باسی لێوە دەکات فەرماندەی ئەو هێزە لە خۆیەوە لە ئاستی پێویست زیاتر چووبووە پێشەوە و ملی نابوو تا گەیشتبووە تاسلۆجەو لەوێ کەوتبووە ناو بۆسەی هێزەکانی شێخ مەحمودو زیانێکی زۆری لێکەوتبوو بە پرتاو بەرەو چەمچەماڵ گەڕابوونەوەو ژمارەیەك کوژراوو برینداری لە پاش خۆی جێهێشتبوو، وێڕای دەست بەسەراگرتنی چوار زرەیلی و چەند ئۆتۆمبیلێك.[١٢٨]

بەم شێوەیە لە سەرەتادا ئەرکی بەرگرتن بەهێزەکانی شێخ مەحمود هێندە ئاسان نەبووە، دواجار بەپەلە، فرمان درا بە جنەراڵ فرایزەر کە فەرماندەی فیرقەی (١٨)بووە لە موسڵ کەبەرەو کەرکوك بجوڵێتو ئەو هێزە ناونراوە (هێزی کوردستانی جنووبی) و سەرجەم هێزەکەش لە ناوەراستی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ لە چەمچەماڵ کۆبۆتەوەو لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بووە، لەو کاتەشدا هێزەکانی شێخ مەحمود کە ژمارەیان (٣٠٠) چەکدار بووە لە دەربەندی بازیان خۆیان قایم کردبوو، بەو پێیەی دەربەندی بازیان شوێنێکی زۆر سەخت و قایمە.

---

[١٢٧] ئەحمەد خواجە: چیم دی،ب١،ل٤٤

[١٢٨] عبدالزاق الحسنی: تأریخ الوزارات العراقیە،ج١،ل٢٧١ ؛ ویلسۆن: هەمان سەرچاوە، ل٢٧ .

فرایزەر خۆیی و هێزەکەی لە ڕێکەوتی ١٧ی حوزەیرانی ١٩١٩ بەرەو دەربەندی بازیان دەستی کرد بە پێشڕەوی کردن و بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر، هێرشیان کردو پەلاماری هێزەکەی شێخ مەحمودیان دا، هێندەی پێنەچوو سوپای ئینگلیز کەلە سیك و گورگەوهیندی پێك هاتبوون بەسەر بەرزاییەکاندا هەڵگەڕان و هێزەکەی شێخ موحمود لەگەڵ ئەم شێوازە هێرش و بەرەنگاربوونەوەیدا ڕانەهاتبوون، بۆیە نەیان توانی بەرگری بکەن و زیانێکی زۆرییان لێکەوت کەبە (٤٨) * کوژراو زیاتر لە (١٠٠) دیل و بریندار مەزەندە دەکرێت. کە خودی شێخ مەحمود بە برینداری لەگەڵ (شێخ حمە غەریب) دا لە نێو دیلەکاندا بوون و ڕەوانەی بەغدا کران. فرایزەر لەو کاتەدا زۆر پەرۆشی چارەنووسی دیلەکان بوو لە سلێمانی، بۆیە زۆر بەپەلە یەکەیەکی سەربازی بچووکی ڕەوانەی سلێمانی کرد ، کەتا ئەو کاتە هیچ هەواڵێکی ئەو شەڕەیان پێنەگەیشتبوو، هێزە بچووکەکەی ئینگلیز توانی خۆی بگەیەنێتە نێو شار و پاسەوانەکان دەرپەڕێنێت و دیلەکان ئازاد بکات کە لە ٢١ی مایسی ١٩١٩ەوە بە دیل گیرابوون.[١٢٩] بەم شێوەیە کۆتایی بەیەکەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود هات لە سلێمانی، کە حەوت مانگ و یەك ڕۆژی خایاند.

---

* شێخ لەتیف لە یاداشتەکانیدا ژمارەی قوربانییەکانی سوپاکەی شێخ مەحمودبە ( ٥٠٠ ) کوژراو مەزەندە دەکات لەگەڵ (٣٠٠ ) دیلدا ، بەڵام ئەم ژمارانە تەنها شێخ لەتیف باسیان دەکات و هیچ سەرچاوەیەکی دیکە پشتگیری ئەم بۆچوونەی ئەو ناکات، بۆیەبەهەند نەگرتووە . ( یادداشتەکانی شێخ لەتیف ، ل ٥٨ ).

[١٢٩] زنار سلوپی: فی سبیل کردستان، ترجمە. ر ، ع ، بیروت، ١٩٨٧، ل٧٥؛ عبدالرزاق الحسنی: تأریخ الوزارات العراقیە، ج١، ل٢٧١ ؛ ویلسۆن: هەمان سەرچاوە، ل٢٧ ؛ عبدالمنعم الغلامی: هەمان سەرچاوە. ل٩٩-١٠٠.

# باسی سێیەم
# سەردەمی حوکمی راستەوخۆی ئینگلیز لەسلیمانیدا

أ- سیاسەتی ئینگلیزەکان .

دوای ئەوەی هێزەکانی ئینگلیز لەدەربەندی بازیان هێزەکەی شێخ مەحمودیان شکاندو خۆشیان بەدیل گرت و رەوانەی بەغدایان کرد، بەرەبەیانی ١٩ی حوزەیرانی١٩١٩ هێزەکانی بەریتانیا بەتەواوی لە سلیمانی نزیك کەوتنەوەو هیچ جۆرە بەرگریەکیان توش نەهات، هەروەك ئەدمونز ئاماژەی پێدەکات هەمان رۆژ سوپاکەیان لەقلیاسان جێدەهێلن و خۆی و پۆلێك سوارەی ئینگلیز بەرەو سلیمانی دەچن و پێش نیوەرۆ دەگەنە ناو شار، دوای تێپەربوونی چوار رۆژ سەرجەم هێزەکانی بەریتانیا دەگەنە سلیمانی .[١٣٠]

لەگەڵ گەیشتنیاندا سوارەی ئینگلیزو هندی بەرامبەر بەمالی شێخ مەحمودو چیای گۆیژە بەریز تۆپیان دامەزراندو سەرگردی قشلەیان کرد بەبارەگاو بارودۆخی شار شلەقا،[١٣١] مالە گەورەکەی شێخ مەحمود و شێخ قادری برای کران بە شوێنی حەوانەوەی سەربازەکان [١٣٢] کەوتنە ترساندنی خەلکەکەو لەیەکەم کاریاندا رۆژی ٢٣ی حوزەیران مانۆریکی سەربازیان ریکخست و ئەشرافەکانی سلیمانیان بەدرێژایی شەقامەکانی ریزکردبوو[١٣٣].

فرایزەر بە ئاشکرا بە دەست و پیوەندەکانی خۆیانی رادەگەیاند ، گەر بێت و بیانەوێت زیاتر لە ئینگلیز نزیك ببنەوە ئەوا دەبێت لە پێناوی ئەواندا خۆیان بخەنە ژێر ئۆتۆمبیلەوە .[١٣٤]

---

[١٣٠] کرد و ترك و عرب ، ل ٥١- ٥٢.

[١٣١] ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب١، ل٤٩-٥٠.

[١٣٢] رەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ٢ ، ل ١٢٤ .

[١٣٣] سەرچاوە ی پێشوو، ب ١ ، ل ٥١٨ .

[١٣٤] أ . م منتشاشفلی : العراق ‌في سنوات ، ل ٣١٣

لەگەڵ گەیشتنەوەیاندا کەوتنە تۆڵە سەندنەوە لە خەلکی و هیندەی بۆیان کرا سەرقالی راونان و گرتنی ئەوانە بوون کە هاوکاری شیخ مەحمودیان کردبوو .[١٣٥]

گرینهاوس بەسەر ئەو ماڵانەدا دەگەرا کە لە شۆرشەکەدا بەشدار بوون و یەکە بەیەکە دەیناسین و دەستگیری دەکردن و دەستە سەربازی هیندی لە شاردا جیگیر دەکرد.[١٣٦]

خانوادەی شیخ مەحمود بە یارمەتی چەند پیاویکی خۆیان توانییان شار جیبهیلن و لەگەڵ خۆشیاندا ژمارەیەکی زۆر لەو خیزانانەی بەشداریان کردبوو لەو شۆرشەدا هاوشانی ئەوان لە شار دەرچوون .[١٣٧]

ئینگلیزەکانیش زۆریان لامەبەست بوو بەهەموو شیوەیەك کۆنترۆلی بارودۆخی سلیمانی بکەنەوە، چونکە سلیمانی شاریك نەبوو هەروا بەئاسانی بتوانن رامی بکەن. سلیمانی میراتی بابانەکان بوو، لەو راستیە گەیشتبوون بەوەلانانی دامو دەزگای حوکمرانیەکەی شیخ مەحمود بۆشاییەکی تەواو هەست پیدەکرا، دەیان زانی کارەکەیان هەروا بۆ ناروا کەوتنە خۆ چۆن ئەو بۆشاییە پربکەنەوە.[١٣٨]

لەسەرەتادا کەوتنە تالان کردنی مالان و زیاتر لە (١٠٠) ماڵ لە سلیمانیدا بەر ئەو شالاوە کەوت و ژمارەیەکی زۆر لەو مالانە کەل‌وپەلەکانیان لەلایەن سوارەی ئینگلیزەوە لەماڵ دەرهینراو لەبەردەم مزگەوتی گەورەدا سوتیندرا.[١٣٩]

بەلام تالان و دەست بەسەراگرتن تەنها مالی بەشدارانی شۆرشەکەی شیخ مەحمودی نەگرتەوە، بەلکو شالاوەکە هیندە گەورە بوو ئەو کتیبخانە

---

[١٣٥] رەفیق حیلمی : یاداشت ، بەرگی دووەم ، ب ١ ، ل ١٧١

[١٣٦] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب ١ ، ل ٥٠-٥١

[١٣٧] شیخ لەتیف: هەمان سەرچاوە،ل٥٩.

[١٣٨] حوسینی مەدەنی: هەمان سەرچاوە، ب١، ل٣٣٢.

[١٣٩] شیخ لەتیف: یاداشت،ل٥٩؛ مارف ناسراو: میژووی کتیبخانەکانی سلیمانی، ١٩٠٠-١٩٧٠، سلیمانی،ل٨.

گەورەیەشی گرتەوە کە لەمزگەوتی گەورەدا بوو و زیاتر لە(٦) هەزار کتێب و دەستنووسی تێدابوو، سەرجەمیان لەحەوشەی مزگەوتی گەورەدا کۆکردەوەو سوتاندیان هەندێکیان یادگاری میرەکانی بابان بوو مۆری ئەوانی پێوەبوو، بەشێکی زۆری ئەو کتێبانە لەماڵی شێخەکاندا بوو بەڵام دەستیان پێگەیشت و سوتاندیان تەنها نزیکەی (٤٠٠) کتێب نەبێت رزگاری بوو لەم شاڵاوە.[140]*

ولسن خۆی باس لەوە دەکات کە شەش هەفتەی یەکەم دووای گەڕانەوەیان، سەرقاڵی سزادانی شۆڕشگێڕان بوون و تەنها بە ناوسلێمانییەوە نەوەستاون، بەڵکو کەوتوونەتە کێوماڵی پانتاییەکی فراوانی هەرێمی سلێمانی.[141] ژمارەیەك لەهێزەکانیان بەرەو هەڵەبجە چوون، هەندێکیش بەدرێژایی مانگی تەمموزی ئەو ساڵە سەرقاڵی کێوماڵی ناوچەی سورداش و شارباژێڕو بەرزنجەو پێنجوێن بوون.[142]

لەنێو شاریشدا مێجەرسۆن لەڕێکەوتی ١٩١٩/٧/١ دا گەیشتەوە سلێمانی و دوای گەڕانەوەی لەناوەڕاستی ئەو مانگەدا بەنێو خەڵکیدا جاڕیدا، هەر کەسێك چەکی هەیە لەماڵدا وەك تفەنگ و دەمانچەو خەنجەرو..هتد. لەماوەی (٢٤) سەعاتدا دەبێت بیداتە دەست پۆلیسخانە، بەپێچەوانەشەوە ئەوەی سەرپێچی بکات و بگیرێت (٥٠٠) روپیە سزا دەدرێت یا شەش مانگ زیندانی ئەکرێت. ئەم ترسە وای لەخەڵکی کرد ، لەماوەیەکی کەمدا ژمارەیەکی زۆر چەك تەسلیم بە ئینگلیز بکەنەوە، وەك ئەحمەد خواجە

---

[140] مارف ناسراو: هەمان سەرچاوە،ل٩؛ رەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب١، ل٥١٨.

* عەبدولرەقیب یوسف ئەنجام دانی ئەم کارە دەداتە پاڵ ئەفسەرێکی کوردی نێو سوپای لیڤی ناوی (رەشەی بەکر ئەفەندی) بووەو بەفەرمانی ئینگلیزەکان لەحەوشەی مزگەوتی گەورەدا ئاگری بەرداوەتە ئەو خەرمانە کتێبە. (عەبدولرەقیب یوسف : بانگەوازێك بۆ ڕوناکبیرانی کورد لە پێناوی کۆکردنەوەو زیندوو کردنەوەی کەلەپوری کوردیدا ، سلێمانی ، ١٩٨٥، ل ١٤ ).

[141] بلاد مابين النهرين، ج٣،ل٢٩.

[142] أ.م منتشا شيفلي: العراق في سنوات،ل٣١٣.

لێی دوواوە "لەپاش جارەکەو دوای چەند ڕۆژێك لەناو شارو دەوروبەری سلێمانیەوە ئەوەندە چەکی کۆن هێنرایە پۆلیسخانە گردێکی گەورەی دروست کرد، لەجیاتی سوتاندن و لەناوبردنی، سۆن بڕیاری دا فەرمانگەیەکی شارەوانی دروست بکات و ئەم چەکە زۆرە بخاتە بناغەکەیەوە"[١٤٣].

قەدەغە کردنی چەك هەڵگرتن بووە هۆی ئەوەی پیشەسازی چەخماخسازیش لەشاردا بەرەو کزبوون بچێت و لەکۆی زیاتر لە (١٥٠) دوکان تەنها چەند دوکانێك مایەوە.[١٤٤]

ئینگلیزەکان دوای گەڕانەوەیان ، دوو هەفتەی یەکەم بەردەوام خەریکی لێکۆڵینەوە بوون لەگەڵ خەڵکیدا سەبارەت بەهۆکارەکانی هەڵایسانی ئەو شۆڕشە.[١٤٥]تەنانەت لە نێو شاری سلێمانیدا ( ٨ ) مەخفەری پۆلیس هەبوو ، هەریەکێکیان چاوشێك و چوار نەفەری لەگەڵ دانرا بوو .[١٤٦]

ئەم ڕەوشە نائاساییە ماوەیەکی زۆر لەسلێمانیدا بەرقەرار بوو تاوەکو ئینگلیزەکان خۆیان بەڕەسمی لە ١٣ی‌ئابی١٩١٩ ڕایانگەیاند کە بارودۆخی کوردستان ئارام بۆتەوە، بێگومان بەشێکی زۆری ئەم بێدەنگیو خەفەکردنە خەڵکی بۆ ئەو توندوتیژیەی سۆن دەگەڕێتەوە، کە وای کرد ماوەیەکی زۆری بوێت تاوەکو خەڵکی دێنەوە سەرخۆیان.[١٤٧]بەتایبەتی دوای ئەوەی خەڵکی بۆیان ئاشکرا بوو کە شێخ مەحمود دوای بەدیل گیرانی، دراوەتە دادگای سەربازی، لەسەرەتادا حوکمی لەسێدارە دانیان بۆ دەرکردووە، بەڵام دواتر حوکمەکەیان بۆ گۆڕیوە بەدە ساڵ زیندانی و دورخستنەوە بۆ دورگەی (ئەندامان) لە هندستان لەگەڵ (شێخ حەمە غەریب)ی زاوایدا،[١٤٨]خانوادەکەشی ماوەیەکی زۆر بە ئاوارەیی لەئێران بوون، هەر ئەو کاتە پەنایان برد بۆ لای

---

[١٤٣] چیم دی،ب١،ل٥٨.

[١٤٤] ادمونز: هەمان سەرچاوە،ل٧٨.

[١٤٥] سەرچاوەی پێشوو،ل٨٠.

[١٤٦] ڕەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ٢ ، ل ١٣٥ .

[١٤٧] ا . م . منتشا شیفلی: العراق فی سنوات، ل٣١٤،٣١٥.

[١٤٨] ویلسون: هەمان سەرچاوە،ل٣٠.

(سمکۆی شکاك) و ماوەیەکی زۆر لای مانەوەو ئەویش ڕێزێکی زۆری لێگرتن، ماوەیەکیش پەڕاگەندەی کوردستانی باکوور بوون، شێخ قادری براشی هەر لەناو ئێراندا دەستگیر کراو درایەوە دەست ئینگلیزەکان و ڕەوانەی بەغدایان کرد.[149] ئەمە لەکاتێکدا سۆن لەمێژ بوو لەنێو شاردا فەرمانی دەست بەسەراگرتنی موڵك و ماڵی شێخ مەحمودی دەرکردبوو* لەژێر چاودێری خۆیاندا بەڕێوەیان دەبرد ، خێزانی ئەو پیاوانەش کە لەگەڵ خانوادەی شێخ مەحموددا ڕۆیشتبوون خرابوونە ژێر چاودێری پۆلیسەوە.[150]

دوای ئەم هەنگاوانە ئینگلیزەکان یەکەم کاریان پێکەوەنانی ئیدارە بوو لەسلێمانیداو یەکەم هەنگاویشیان لەم بوارەدا وەك ئەدمۆنز دەڵێت دووبارە دروست کردنەوەی هێزەکانی لیڤی و ڕێکخستنەوەی پۆلیس بوو. ئەو کاتە بارەگای هێزی سەربازی لەنێو دائیرەی ئەفسەری سیاسیدا بووە لەنێو مەکتەبی ئامادەیی زەمانی عوسمانی، بەڵام لەسەر داوای خەڵکی ئەو بینایەیان چۆڵ کردووەو چوونەتە نێو بینای دەبۆکە، ئەدمۆنز لەدرێژەی قسەکانیدا باس لەوە دەکات کە سوێندی دڵسۆزی تایبەت بۆ ئەو دوو هێزە ڕێکخرا بوو، کە دەبوایە ئەو سوێندەیان بخواردایە، هەرچەندە باوەڕیشیان پێیان هەبووە چونکە وەك خۆیان وەسفیان دەکەن هێندە بەگەرم و گوڕی بەشداری شۆڕشەکەی شێخ مەحمودیان نەکردووە.[151] جگە لەوەش فرایزەر

---

[149] شێخ لەتیف: هەمان سەرچاوە،ل٦٦.

* کە شێخ مەحمود دەسەڵاتی لە سلێمانیدا نەما عەبدوڵڵا ئاغای حاجی حەمە سەعید سەرپەرشتیکەری موڵکەکانی شێخ مەحمود بوو ، ئینگلیزەکان هەوڵیان دەدا هەندێك زەوی و زاری شێخ بەسەر ئەو هەمەوەندانەدا دابەش بکەن کە سەر بەخۆیان بوون ، عەبدوڵڵا ئاغا ناڕەزایی دەردەبڕێت و بە ئینگلیزەکان دەڵێت ، کە ئەمە بۆ چوونی ئێوەیە ئەی بۆ لە بۆڵشەوییەکان دەترسن کە دەڵێن با زەوی لە خاوەن موڵك بسەنرێتەوەو بەسەر خەڵکدا دابەش بکرێت، هەر بۆیە لەسەر ئەم قسەیە دەری دەکەن . ( ڕەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ٢ ، ل ١٣٦ – ١٣٧ ).

[150] ئەحمەد خواجە: چیم دی،ب١، ل٥٩.

[151] کرد وترك وعرب،ل٨٠-٨١.

بڕیاری دابوو کە هێزی سەربازی لە سلێمانیدا نەمێنێت و تەنها هێزی لیڤی ئەرکی پاراستنی شار بگرێتە ئەستۆ ، ئەم هێزەش پێکهێنرایەوە کە (١٥٠) کەس بوون و جلی شینیان بۆ ئامادەکرا.[١٥٢] سلێمانی بەرە بەرە کۆنترۆڵ دەکراو پەیتا پەیتا پیاوانی عەشایەری کورد لەدەوروبەری سلێمانیەوە دەهاتنە ناو شارو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ ئینگلیز نیشان دەدا.[١٥٣]

بێگومان سۆن دوای ئەم ڕووداوانە زیاتر شوێنی خۆی قایمکرد، ئینگلیزەکانیش زۆریان لامەبەست بوو کە سۆن بەردەوام بێت لەسەر کارەکانی و بۆ ئەوەی چاوترسێنیان بکات. لەهەمان کاتیشدا زیرەکانە دڵیان بەلای خۆیاندا بەکێش بکەن، سۆن بۆ ئەم کارە لەهەموو ئینگلیزەکانی ئەو سەردەمە زیاتر دەستی دەدا، کوردیەکی باشی دەزانی و چاك شارەزای ئەم بەشەی کوردستان بوو، بۆ بەڕێوەبردنی ئەم هەرێمەش، وەك د. کەمال مەزهەر دەڵێت:- "وەك هەر ئیستعمارێکی دیکە ژەهرو شەکری تێکەڵ دەکرد ".[١٥٤]

سۆن خۆی لەسەرەتادا لەخانووی (ئەمین ئەفەندی مەلا قادر) دابوو، قوتابخانەی فەیسەڵیش کە ئەمڕۆ بازاڕی (عەسریە) دایەرەی سیاسی و شوێنی دانیشتن و ئیش و کار بەڕێوەبردن بوو، (سەرا)ی ئێستاش ئەو ڕۆژگارە دادگاو تاپۆو پۆلیسخانەو بەندیخانە بوو.[١٥٥]

ئەو کاتە (برادفۆرد) ڕەئیسی پۆلیسی سلێمانی بوو، کاپتن (هۆڵت)یش یاریدەدەری حاکمی سیاسی بوو، بەڵام دوایی کاپتن (رایت) لەشوێنی بوو بەحاکمی سیاسی و پشکنەری دارایی، (ئەحمەد موختار) قازی بوو، (صدیق مەزهەر )یش حاکمی شار بوو.[١٥٦]

---

[١٥٢] ڕەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ٢ ، ل ١٣٣ .

[١٥٣] شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ٢ ، ل٨٤، ڕەفیق حیلمی: یاداشت، ب٢، ل١٧٢.

[١٥٤] چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد، ب١، ل١٥٣،١٥٤.

[١٥٥] جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٢، ل٧٧.

[١٥٦] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦-٨٧.

ئینگلیزەکان باس لەوە دەکەن کە ماوەیەك دوای گرتنەوەی سلێمانی، هەوڵی ئەوەیان داوە کاروباری شارەکە بدەنەوە دەست کوردەکان.[157] لێرەدا مەبەستیان ئەو کوردانەیە کە دەست و پێوەندی خۆیان بوون و لەقسەیان دەرنەدەچوون، هەر ئەوانەشیان لەپۆست و پلەو پایەی ئیداریدا دادەمەزراند، بۆ نموونە (غەفور ئاغا)یان کردبووە گەورەی شارو ئەرکی دابین کردنی ئازوقەی سلێمانی و چاودێری کردنی نرخی ناو بازاڕیان پێسپاردبوو.[158] هەر بۆیە وێڕای پڕوپاگەندە سەر زارەکیەکانیان بڕوای تەواویان پەیدا کردبوو کە پێویستە خۆیان راستەوخۆ لەڕێگای ئەفسەرە سیاسیەکانیانەوە حوکمڕانی کوردستان بکەن، (های) کە ئەو کاتە ئەفسەری سیاسی بووە لە شاری هەولێر، لەم بارەیەوە دەڵێت: " لە کوردستاندا ئەستەمە بێ بەکارهێنانی هێز هەڵس و کەوت بکرێت، هەر بۆیە حوکمڕانی راستەوخۆ تاکە رێگاچارەیە بۆ حوکمڕانیکردنی کوردستان "، (سۆن)یش لەم بارەیەوە دەڵێت: " هەرچەندە تەماشای کوردەکان دەکەم ئەو باوەڕەم لادروست دەبێت کە نەشایستەی ئۆتۆنۆمی بوون نەخۆشیان ئەوەیان دەویست، کوردەکان لەڕەواندز پێیان وتم: ئەگەر دەسەڵاتی حکومەتێك لەئارادا نەبێت وەك مەڕی بێ شوانمان لێدەێت ئەم بۆچوونەش تەنها شارەکان ناگرێتەوە، بەڵکو لادێ نشینەکانیش هەمان بیروبۆچوونیان هەیە، چونکە بازرگان و جوتیارەکان لەئاغاکان دەترسێن، ئاغاکانیش لەنێوخۆیاندا سڵ لەیەکتر دەکەنەوە، هەر بۆیە پێویستە هێزێکی دەرەکی هەبێت بۆ راگرتنی لەنگەری کۆمەڵ، چونکە کورد بەئەقڵیەتی خوێندکار بیر دەکاتەوە، پێویستی بەوە هەیە کە لەهەندێك کاتدا توندوتیژ بێت لەگەڵیداو هەندێك کاتی دیکەش کلۆشەکرێکی نیشان بدەی، چونکە توندوتیژی لەئەندازە بەدەرو نەرمونیانی بێ ئەندازەش بەهەمان شێوە

[157] ادمۆندز: هەمان سەرچاوە، ل٨١.

[158] أ . م . منتشاشفیلی: العراق فی سنوات، ل٣١٢: ادمۆندز، هەمان سەرچاوە، ل٨٣.

لەنگەری خوێندکارەکە تێك دەدات و هەڵس وکەوتی ئاسایی نابێت، بەڵام کاتێك داری دەست گەورەکەی دەبینێت، دەچێتەوە باری ئاسایی خۆی ".[١٥٩]

هەر بۆیە دەسەڵاتدارانی بەریتانیاش بەم ئەقڵەوە خوازیاربوون حوکمڕانی کوردستان بکەن، هەر ئەم بۆچوونەی (سۆن)یش وای کردووە کە بەو پەڕی دڵنیاییەوە بڵێن " لەسایەی حوکمڕانی سۆنەوە، ئارامی و هێمنی لەسلێمانیدا بەرقەرارە ".[١٦٠]

بێگومان سۆن لەم بارەیەوە لەسلێمانیدا هیچ درێغیەکی نەکردو چی لەتوانادا بوو بۆ جێگیرکردنی ئیدارەی راستەوخۆی ئینگلیز لەسلێمانیدا ئەنجامی دا، هەرچەندە ئینگلیزەکان لەبارەی هەیکەلی ئیداریەوە گۆڕانکاریەکی بەرچاویان نەکرد بە بەراورد لەگەڵ سیستمی پێشووی عوسمانیدا، بەڵکو هەمان سیستمیان هێشتەوەو ئەفسەرە سیاسیەکانی بەریتانیا لەهەموو شارێکدا دەسەڵاتەکانی موتەسەریفی پێشووی عوسمانیان هەبوو، لەهەمان کاتدا ئەرکی دادوەریشیان لەئەستۆ دەگرت، بەڵام وێڕای ئەوەش هەردوو پۆستی موتەسەریف و دادوەریشیان هێشتبۆوە، بەم شێوەیە کوردستانی باشوور، ببوو بەچەند هەرێمێك و لەلایەن حاکمێکی سیاسیەوە بەڕێوەدەبرا، هەرێمەکانیش بەسەر چەند قەزاو ناحیەو گوندێکدا دابەش کرابوون.تەنانەت لەڕۆژگاری حوکمڕانی راستەوخۆی بەریتانیادا، هەمان یاسای باجگری سەردەمی عوسمانی پەیڕەو دەکرا کە ئەویش سیستمی (ئیلتزام)* بوو.

لە سەرەتادا ئینگلیزەکان زۆر بەتوندی یاسای باج کۆکردنەوەیان بەسەر کورددا پراکتیزە دەکرد، بەڵام دواتر، کە بارودۆخی کوردستان هێور

---

[١٥٩] لە د. عوسمان عەلی وەرگیراوە: فترە الحکم المباشر ١٩٩٩ – ١٩٢٠، ادارە المیجرسون فی جنوب کردستان، مجلە، ئاڵای ئیسلام، السنە ١٣، العدد، ٢،٣، ایلول ١٩٩٩.

[١٦٠] لوسیان رامبۆ: الکرد والحق، ترجمە، عزیز عبدالاحد نباتی، اربیل، ١٩٩٨،ل٧٩.

* نیزامی ئیلتیزام بریتیە لە فرۆشتنی پۆستی باجگری ( باج کۆکردنەوە ) بەو کەسەی بەڵێن بە حکومەت دەدات کە ساڵانە زۆرترین بڕی باج کۆبکاتەوە ، ئەم پرۆسەیەش لە زیاد کردنێکی ئاشکرادا ئەنجام دەدرێت . ( د. عوسمان عەلی : هەمان سەرچاوە)

بـۆوە، سیسـتمێکی تـەواو و وردو تـێروپڕ لەلایـەن بـەریتانیاوە بـۆ بـاج کرکۆدنەوە، داندرا بەتایبەتی لە رۆژگاری حوکمڕانی مێجەر سۆن دا ، خەڵکی سلێمانی پازدە هێندەی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی باجی (توتن)یان دەدا بەئینگلیزەکان، خەڵکەکەش ئەم بارەیـان لاپەسـەند نـەبوو ئینگلیزەکـانیش ئەوەیان لەبەرچاو نەدەگرت کە دوو سێ سـاڵ پێشـتر ئـەم وڵاتـە دووچـاری قاتو قڕی و گرانیەکی ترسناك هاتبوو وڵاتەکە وێـران ببـوو، دوای نـەمانی دەسـەڵاتی شـێخ مـەحمودیش ئینگلیزەکـان تـەواو تونـد ببـوون و بـەهۆی فەرمانبـەرە کرێ گرتەکانیانـەوە باجیـان کۆدەکـردەوە، حاکمـە سیاسـیەکانی بەریتانیا پەیوەندی راستەوخۆیان لەگەڵ لادێ نشینە کوردەکاندا بەستبوو، لێنەدەگـەڕان ئاغـاو سـەرۆك هـۆزە کوردەکـان بـاج کۆبکەنـەوە، بـەم شـێوە بەریتانیا بۆی دەرکەوت هەوڵەکانی بۆ حوکمڕانـی راستەوخۆی کوردستان تا ئەندازەیـەکی بـاش سەرکەوتووە، بەتایبـەتی لـەماوەی نێـوان مـانگی ئایـاری ساڵی ١٩١٩ تا تشرینی یەکەمی ١٩٢٠، کە سۆن لە سلێمانیدا حاکم بوو، هەر ئەمەش وای لە (ولسن)ی نوێنـەری بالای بەریتانیا کرد کە لـەمانگی نیسانی ١٩٢٠ دا لـە راپۆرتێکیـدا بـۆ وەزارەتـی دەرەوە بـەو پـەڕی دڵنیاییـەوە بڵێـت "لەهـەموو عـێراقدا نێوچەیـەك نیـە هێنـدەی سـلێمانی مـل کـەچ و گوێڕایـەڵی حوکمی بەریتانیا بێت، تەنانەت پانتایی ئەو زەویانەی بەگەنم و جۆ چێندراون دووچەندا بووەو سێ هێندەی ئەو پانتاییە کە دەکرێت بەتوتن"[١٦١].

(سۆن)یش بۆ جەخت کردن لەسەر راستی قسەکانی (ویلسن)، توانـی تەنـها لـە سـاڵی (١٩٢٠)دا بـڕی بیسـت هـەزار جونەیـهی ئیسـترلینی بـاج کۆبکاتـەوە لەسـلێمانی وبیخاتـە سـەر بودجـەی سـاڵانەی شـاری سـلێمانی، لەراپۆرتێکیشدا بۆ وەزارەتی موستەعمەرات ئەوە دەدرکێنێت کە مان گرتن و راپەڕینە گشتیەکانی عیراق، هیچ کاریگەریەکیان بۆ سەربارو دۆخی سلێمانی نیە، شاری سلێمانی ئارام ترین شوێنە لـەعیراقدا، (ویلسن)ش لای خۆیـەوە

[١٦١] د. عوسمان علی: هەمان سەرچاوە؛ أ.م. منتشاشفیلی: العراق فی سنوات، ل٣١٦.

بۆچوونەکانی سۆنی دووپات دەکردەوە کـە ٩٩٪ خـەڵکی کوردسـتان لەگـەڵ ئەوەدانین کە حوکمی راستەوخۆی ئینگلیز لەکوردستاندا لاببرێت.[١٦٢]

سۆن ئەو ماوەیەی لەسلێمانیدا حوکمڕانی دەکرد تـا لـەتوانایدا بـوو هەوڵی ئەوەی دا دەست و پێوەند بۆخۆی پەیدا بکات، لەم پێناوەشدا هـەوڵی کڕینی خەڵکی دەدا.[١٦٣]

تا دوا ئەندازە رقی لەو دەستەیە بوو کە لەسلێمانیدا بەلایـەنگری تـورك دەناسـران،[١٦٤] زۆریشـی لامەبەسـت بـوو بەشـێوازێکی تایبـەت حوکمڕانـی سلێمانی بکات، بەڵام ئەو سـەردەمە خـەڵکی بە نـەنگییان دەزانـی خۆیـانی لێ نزیك بکەنەوە یا بەرەو پیری بچن.[١٦٥]

ئـەم تـێڕوانین و بیرکردنەوەیـەی خـەڵکی بەرامبـەر بـەئینگلیزەکان دوای پاشگەزبوونەوە لەبەڵێنەکانیان و دورخستنەوەی شێخ مەحمود بۆ هندستان زیاتر سەری هەڵدا، لەکاتێکدا پێشتر خەڵکی پێی وابوو بەریتانیا کوردستانی ئازاد دروست دەکات، بەڵام دوای ئەو روداوانە ئیدی لـەپێش چـاوی خـەڵك کـەوتن و کـەم کـەس هـەبوو رووی بێت هاموشۆیان بکات، رەفیق حیلمـی لـەم بارەیەوە دەڵێت : "لەو رۆژانەدا خەڵکی نەفسیەتی بەرزبوو، لەڕووی نـەدەهات بچێتە ناو دامو دەزگای حکومەتەوە، شـەرمیان ئـەکرد بچنـە سـەرای حکومـەت روویـان نـەدەهات بچنـە ریـزی پیاوەکـانی میریـەوە، بەدەگمـەن رێدەکـەوت کـە یەکێك هەوڵ بۆ کارێکی میری بدات، بۆ وەزیفە لەمو لەو بپارێتەوە".[١٦٦]

ئەو کاتە سۆن هـەوڵی ئـەدا ئـەو رۆشـنبیرانە لـەخۆی نزیـك بخاتـەوە کـە لـەنێو خـەڵکیدا بـە(منـەوەر) ناسـرابوون، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش دامـەزراندنی چاپخانەیەکی بـەکارێکی گرنـگ دەزانـی، ئـەو سـەردەمەش ئینگلیزەکان چـەند

---

[١٦٢] سەرچاوەی پێشوو.

[١٦٣] د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە، ب١، ل١٥٣-١٥٤.

[١٦٤] رەفیق حیلمی،: یاداشت،ب٣، ل١٩.

[١٦٥] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨-٢٩.

[١٦٦] سەرچاوەی پێشوو،ل٢٨.

ئــامێرێکی کۆنــی چاپیــان هێنــابووە شــارەکانی بەســرەوبەغداو کــەرکوك ، بەمەبەستی راپەڕاندنی کارە ئیداریەکانیان. لەسەر خواستی سۆن یەکێك لەو ئامێرانە بەر سلێمانی کەوت و گەورەترین کاری ئـەم چاپخانەیە دەرکردنـی یەکەم رۆژنامەی کوردی بوو لەکوردستانی عیراق باشوور.[١٦٧]

ئەم رۆژنامەیە ناوی (پێشکەوتن) بوو، یەکـەم ژمـارەی لـەرۆژی ٢٩ی نیسانی ١٩٢٠ دەرچوو.[١٦٨]

سۆن بـەهۆی ئـەم رۆژنامەیـەوە توانـی دەسـتەیەك روناکبـیری نـاوداری وەك (جەمال عیرفان، شێخ نوری شێخ سالح، جەمیل صائب و زەکی صائب)ی لــەخۆی نزیــك بخاتــەوەو وەهایــان لێبکــات لــەو رۆژنامەیــەدا بنوســن و بەرهەمەکانیان بڵاوبکەنـەوە.[١٦٩] تەنانـەت ســۆن خۆشـی بەشـداری لەنوسین و بڵاوکردنەوەیدا دەکرد.[١٧٠]

بەهۆی ئـەم رۆژنامەیەشـەوە هـەوڵی بڵاوکردنـەوەو پـەرەپێدانی زمـانی کوردی دەداو خۆی سەرپەرشتی ئـەو مەسـەلەیەی دەکـردو سوور بوو لەسـەر ئـەوەی زمانی خوێندن لـەخوێندنگاکانی سـلێمانیدا بـەکوردی بێـت، بـۆ ئـەم مەبەستەش بەپەلە ئەلف وبێـی کوردی دانا بەیارمەتی مامۆستایان (محەمـەد رەشـیدو زەکـی کابـان) بــەنێوی (ئەووەڵــەمین کیتــابی قیرائــەتی کــوردی) و بەرنامــەی خوێندنــی ســەردەمی عوسمــانی گۆڕانــی بەرســەرداهات و نــاوی خوێندنگــای (تەشــویقیە) گــۆڕدرا بــە(نموونــەی ســەعادەت)، هــەر لــەو سەردەمەشدا خوێندنگای (نموونەی عیرفان)یش کرایەوە.[١٧١]

---

[١٦٧] د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك، ب١، ل١٥٤.

[١٦٨] عەلی ناجی کاکە حەمە ئەمین عەتار، سیروان بەکر سامی: پێشکەوتن، یەکەمین رۆژنامەی سلێمانی، ١٩٢٠-١٩٢٢، هەولێر، ١٩٩٨، ل٤.

[١٦٩] د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك، ب١، ل١٥٥.

[١٧٠] د. عوسمان علی: هەمان سەرچاوە.

[١٧١] رەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١،ل٤٧٤، کەمال رەئـوف محەمـەد،: یەکـەم حکومەتی کوردستان، رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە: ١١٦٦، ١٩٩٥/٢/١٥.

سۆن لەژمارە (١٢)ی پێشکەوتن دا، ناوی شاری لەنوسراوە رەسمیەکاندا گۆڕی بە(سلێمانی) کە تا ئەو کاتە هەر بە(سلیمانیه) دەنوسرا.[١٧٢]

سۆن وەك چۆن لەخوێندنگادا هەوڵی پێشخستنی زمانی کوردی دەدا، بەهەمان شێوە، لەپێشکەوتن دا رایگەیاند کە هەر کەسێك بەکوردیەکی پەتی و پاراو بنوسێت و نوسینەکەی رەوانەی رۆژنامەکە بکات، بڕێك پارەی وەك پاداشت پێدەدرێت، بۆ ئەم مەبەستە پێشبڕکێیەکیشی رێکخست .ئەو رۆژگارە لەنێو خەڵکی شاردا قسەوباسی زۆر دەکرا سەبارەت بە کارو کردەوەکانی سۆن لە سلێمانیدا، خەڵکانێکی زۆر نەیاری بوونو دژی ئەو کەسانەش بوون کە لەپێشکەوتن دا وتاریان دەنوسی و هاوکاریان دەکرد، چونکە پێشکەوتن لەسەردەستی سۆن دەردەچوو، کە بێگومان بەپلەی یەکەم لەخزمەتی ئینگلیزو سیاسەتەکانیاندا بوو لەکوردستاندا، بۆ نموونە لەژمارە (١٢)ی پێشکەوتن دا نوسەرێك بەنازناوی (م.س.ع) وتارێکی بڵاوکردۆتەوە، بەئاشکرا باس لەچاکەی بەریتانیاو پێشکەوتنیان دەکات کە چۆن سلێمانیش لەسایەی دەسەڵاتی ئەواندا بوژاوەتەوەو دەڵێت : " تەماشای پارو ئەمساڵی خۆمان بکەین، پاروپێرار هەموومان لەبرسان ئەمردین وا ئەمساڵ هەموو دەوڵەمەندبوین، وڵاتمان خۆش بووە، رێگامان بۆ کراوە، شەمەندەفەر نزیك بۆتەوە، جەردەو دزو درۆزن کەم کراوە رەگو ریشەو سەرچاوەیان بەجارێ براوە "[١٧٣]

ئەم نوسینەش ئەوە دەردەخات کە سۆن وێڕای خراپەکاریەکانی کەسانێك هەبوون لێی رازیبوون، ئەویش لەهەوڵی ئەوەدابوو کە ژمارەی ئەو جۆرە کەسانە زیاد بکات، لەم پێناوەشدا هەوڵی ئەوەیان دەدا وا لەخەڵکی بگەیەنن ئەوان لەهەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی کورد دان بەشێوەیەك کە

[١٧٢] پێشکەوتن: ژمارە (١٢)، ١٥/ی تەمووز/١٩٢٠.

[١٧٣] سەرچاوەی پێشوو،ل١.

لەگەڵ هەست و سۆزی کورددا بگونجێت[١٧٤] ئەمەش وای کردووە کە نوسەران و کەسایەتیە دیارەکانی ئەو سەردەمە هەریەکەو بەشێوەیەك باس لەکارەکانی سۆن و ئینگلیزەکان بکەن، بەتایبەتی لەبواری خزمەتگوزاری و بەتەنگەوە هاتنی خەڵکدا.

(ئەحمەد خواجە) لەم بارەیەوە دەڵێت : "لەسایەی مێجەر سۆندا، دائیرەی ئەشغال دامەزرا، لەماوەی چوار ساڵدا بێجگە لەپردی تانجەڕۆو پێچەکانی ژاژیلە بەولاوە کارێکی تریان لێنەبینرا بەناوی کوردستانەوە بەلێشاو روپیە لەناو ئەبراو نەکوردو نەکوردستان سودی لێنەدەبینی "[١٧٥].

(ئەحمەد تەقی)یش سەبارەت بەکارەکانی سۆن دەڵێت : "پاش تێکچوونی ئیدارەی شێخ مەحمود لەمێجەر سۆن هیچ شتێکی وانەبینرا عەلامەتی باشی بێ دەرهەق بەکوردو کوردستانی جنوبی و ئیجرائاتی شەدیدی کرد دەرهەق بەو کەسانەی موقابیل ئیدارەی پێشوو سادیق و موخلیس بوون "[١٧٦].تەنانەت ئەحمەد تەقی باس لەوە دەکات کە چۆن سۆن خەڵکی ئازار داوەو سوکایەتی پێکردوون و ناچاری کردوون کە لەکاتی تێپەڕبوونیدا لەبەری هەڵسن.[١٧٧]*

---

[١٧٤] د. عوسمان علی: هەمان سەرچاوە.

[١٧٥] ئەحمەد خواجە، چیم دی،ب١، ل٦٠.

[١٧٦] بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی،ل١٥.

[١٧٧] سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

* جارێکیان وا رێدەکەوێت سۆن بە ناو بازاڕدا تێدەپەڕێت ٬ بەڵام ( مەلا عەلی مۆرهەڵکەن ) ناوێك لەبەری هەڵناسێت ئەویش بانگی‌دەکات و لێی تووڕە دەبێت ، مەلا عەلی دەڵێت : من موسڵمانم و تۆ غەیرە دینی جائیز نی‌یە لەبەرت هەڵسم ، سۆن لەمەوە رقی لێهەڵدەگرێت ، ڕۆژێك دەنێرێ بە دوایدا پێی دەڵێت بڕیارم داوە مانگی ( ٤٥ ) ڕوپیەت بۆ ببڕمەوە ، بەڵام مەلا عەلی وەری ناگرێت و پێیدەڵێت من کە دینەکەم ڕێگەم پێنەدات لەبەرت هەڵسم ، کەواتە ڕێگەشم پێنادات پارەت لێ وەرگرم ، سۆن لە وەڵامدا پێیدەڵێت خوا بە قوربانی عەقلی خۆت بکات ئەگەر وەرتگرتایە ئەم زانی چیم لێدەکردی . ( ڕەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ،ب١، ل ٤٧٥ – ٤٧٦ ) .

رەسوڵ هاواریش بەهەمان شێوە، پێی وایە کارەکانی سۆن شێوازێك بووە بۆ چاوبەستەکێ کردن لەخەڵکی و فریودانیان بەتایبەتی گرنگی دانی بەزمانی کوردی.[١٧٨]

د. کەمال مەزهەریش سەبارەت بەسۆن دەڵێت "مێجەرسۆن نە بەرۆژنامەی پێشکەوتن و نەبەهیچ کارێکی تر نەیتوانی گەلی کورد فریوبدات".[١٧٩]

لێرەدا دەبێ ئەو راستیە لەبەرچاوبگرین کە دەربڕینی ئەم بۆچونانە زیاتر لەڕوانگەیەکی سیاسیەوە بووە، ئەو رۆژانە نیشتمانپەروەران و رۆشنبیران رقی زۆریان لەسۆن و دەست و پێوەندەکانی بووە، هاوشانی ئەم دەستەیەش، کەسانێکی زۆر هەبوون لایەنگری تورك بوون، ئەمانە سەرجەمیان دژی سۆن بوون، لەبەرامبەریشدا سۆن تا دوائەندازە قینی لەدەستەی تورکخواکان بوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك رێگای بەنیشتمانپەروەرانیش نەدەدا کە جموجۆڵ بکەن، بەڵکو دەستەیەك لەسیخوڕو بەکرێگراوی لەدەوروبەری خۆی کۆکردبۆوە وەك چاودێریکەر (خەفیە) بەسەر نیشتمان پەروەرانەوە دابنابوون، ئەمانە خەڵکانێکی بێزراو بوون و ئەهلی سلێمانی سڵاویشیان لێ نەکردوون و روویان پێنەداون.

هەر بۆیە سۆن پێشکەوتنی کردبووە مینبەرێك بەمەبەستی بانگەشە کردن بۆ بەریتانیاو تانەوتەشەر دان لەتورکخواکان و ناحەزانی ئینگلیز، رەفیق حیلمی لەم بارەیەوە دەڵێت : "هەندێ لەوانەی کە لەپێشکەوتن دا ئەیان نووسی لەوانە نەبوون بەهەناوێکی نیشتمانیەوە هاتبنە کایەوەو لەنوسین مەبەستیان گیانی وڵات پەرستی و کوردایەتی بڵاوکردنەوە بێت، بەڵکو زیاتر چاویان لەخۆبردنە پێشەوە لە(سۆن) و گەیشتن بوو بەو پاداشتە سوك و بێ

---

١٧٨ رەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب١،ل٤٧٥-٤٧٦.

١٧٩ چەند لاپەرەیەك، ب١،ل١٥٥-١٥٦.

نرخـە، ئەمانـە ئەیانویسـت کـە (سـۆن) لەخـەڵك بکـەن بـەخوا یـا هیـچ نـەبێ (بت)یکی لێ دروست بکەن ". [180]

بەڵام وێڕای ئەم رایانە، (جەمال بابان) باس لەوە دەکات کە سۆن، جگە لە هەڵوێستە خراپەکانی بەرامبەر بەشێخ مەحمود، هەندێك کاری کردووە بۆ ئەو سەردەمە بەهەنگاوی باش دادەنرێت، جابەهەر مەبەستێك کردبێتی، لـەم بارەیەشـەوە نموونـە بەڕاکێشـانی پـردو ڕێگاوبـانو کـەم کردنـەوەی بـاج دێنێتـەوە بۆ ئـەو بازرگانانـەی کەلوپـەلو شمـەکیان هێنـاوە، هـەروەها بـاس لەپاراستنی ئارامی و ئاسایشی ناو شارو کردنەوەی خوێندنگاو چاپکردنی رۆژنامەو قەرزو دەستگیرۆیی کردنی جوتیارانو پاراستنی پاكو خاوێنی ناو شار دەکات. [181]

(میرزا ئەمین مەنگوڕی)یش، زۆر بەئاشکرایی لایەنگیری سۆن دەکاتو دەڵێت : "لەپاش گیرانی شێخ مەحمود، مێجرسۆن کرا بەحاکمی سلێمانی و ئیـدارە هـەرچی و پەرچیـەکی شـێخ مـەحمودی تێکـداو نەیهێشـت واریداتـی سلێمانی لەلایـەن پیـاوە دزەکـانی شـێخ مـەحمودەوە لـەناوببرێ، واریداتـی سلێمانی گەیاندە پێنج ملیۆن روپیە ". [182]

لـێرەدا دەتوانـین بڵێـین (سـۆن) بـەدەر لـەکارو کـردەوە سیاسـیەکانی، هـەندێك هـەنگاوی هـەڵناوە شایسـتەی باسـکردن بێـت. پێشـکەوتن لـەریزی پێشـەوەی ئـەو کارانەیـەتی، بەئەندازەیـەك ڕەفیـق حیلمـی وێـڕای ڕەخنـەو سـەرنجەکانی سـەبارەت بـەو رۆژنامەیـە، دەڵێـت : "لـە پێشـکەوتن دا هـەندێ باسی جوانو وتار یا وێژەی بەنرخیش بڵاوکرایەوە ". [183]

ئـەم هەنگاوانـەی (سـۆن) زیـاتر پەیوەسـت بـوون بـەوەوە کـە نێوبـراو بەرنامەیەکی هەبوو کاری بۆ دەکرد، ئـەویش ڕاهێنـانی کوردەکـانی سلێمانی

---

[180] یادداشت، ب١، ل١٩.

[181] شارە گەشاوەکەم، ب٢، ل٧٦-٧٧.

[182] حـەقائقی بەسـەرهاتی شـێخ مـەحمود لەپـەنای ئیسـتقلالی کـورددا، یادداشـت، (دەستنووس)، ل٣-٤.

[183] یادداشت.ب١، ل١٩.

بوو بەوەی کە بتوانن لەنێو (عیراق)دا هەڵ بکەن و هەوڵیشی دەدا لەم کارەیدا هەستی نەتەوایەتی کوردیش لە سلێمانیدا لەبەرچاو بگیرێت، بۆ ئەم مەسەلەیەش دەیویست کارێکی وەها بکات دەسەلاتدارانی سەرروو خۆی بارودۆخی تایبەتی کوردستانی باشوور لەبەرچاو بگرن.

لەڕاستیشدا یەکێك لەشوێنەوارە هەرە دیارو بەرچاوەکانی حوکمڕانی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لەسلێمانیدا، بلاوبوونەوەو پەرەسەندنی بیری کوردایەتی بوو لەنێو خەڵکیدا، لەکاتێکدا بەر لەجەنگی جیهانی یەکەم ئەم بیرە تەنها لەنێو هەڵبژاردەو توێژی ڕۆشنبیرانی کورددا هەستی پێدەکرا.

ڕۆشنبیرانی سلێمانی لەو سەردەمەدا، پێیان وابوو زۆرینەی خەڵك دژی حوکمڕانی ڕاستەوخۆی ئینگلیزن و ئەو حوکمەی (سۆن) لەڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە بەڕێوە دەچێت، چونکە سۆن خەڵکێکی زۆری دورخستبووەو دەستی بەسەر ماڵ و موڵکیاندا گرتبوو، لەڕاستیشدا (سۆن) هەموو دژایەتی و ناڕەزاییەکی خەڵکی سەرکوت دەکرد، تەنانەت (لیز- Lees)ی هاوڕێی، پێی وابوو سۆن وەك زۆردارێکی سەدەکانی ناوەڕاست حوکمڕانی دەکات، تەنانەت (سۆن) خۆشی لەم بۆچوونەدا لەگەڵ (لیس) دابوو،بەکارهێنانی توندوتیژی بەمەسەلەیەکی پێویست دەزانی.

بەلام لەڕاستیدا سیاسەتەکانی سۆن خۆی لەخۆیدا سەرچاوەی سەرەکی ناڕەزاییەکانی خەڵك بوو لەدەسەلاتی ئینگلیزەکان.

سۆن خەڵکی ناچار دەکرد باجێکی زۆر بدەن، تەنانەت لەو سالانەشدا کە بێبارانی بوایە، بڕی باج بەشێوەیەك زیادی کردبوو کە تەنها لە ساڵی ١٩١٩دا (٢٥٠) هەزار جونەیهی ئیسترلینی لەنێوچەی سلێمانیدا کۆکرابۆوە، بەلام تەنها (٦٣) هەزاری خەرج کردبوو بۆ خوێندن و خوێندەواری. بێگومان بەم شێوەیەش هیچ گۆڕانکاریەکی بەرچاو لەو بوارەدا وەدینەهاتبوو، بەڵکو ژمارەی خوێندنگاکان و خوێندکاران لەچاو سالانی پێش جەنگی جیهانی یەکەمدا هیچ جیاوازیەکی وەهای نەبوو. لەکاتێکدا (سۆن) تەنها لەساڵێکدا

بڕی (٢٠) هەزار جونەیهی ڕەوانەی بەغدا کردبوّوە،و لەکاتێکدا شاری سلێمانی پێویستیەکی زۆری پێ هەبوو.[١٨٤]

سۆن بەتەنگ داواکاریەکانی خەڵیکەوە نەبوو، بەدەنگیانەوە نەدەچوو. ئەحمەد خواجە باس لەوە دەکات، کە چۆن دوای هەوڵ و تەقەللایەکی زۆرو نوسینی مەزبەتە، داواکارییەکیان خستۆتە پێش چاوی سۆن بۆ کردنەوەی خوێندنگایەکی سەرەتایی و یەکێکی ناوەندی بەلام تەنها ڕەزامەندی بۆ کردنەوەی سەرتاییەکە نیشان داوەو کردنەوەی خوێندنگای ناوەندی ڕەتکردۆتەوە.[١٨٥]

بەم شێوەیە ئەو کارانەی ئینگلیز لەسلێمانیدا ئەنجامیان دەدا، تەنها بە مەبەستی کپ کردنی دەنگی ناڕەزایی خەڵکی و خزمەت کردنی سیاسەتی داگیرکەرانەی خۆیان بوو.

ب-کاردانەوەی جەماوەر.

لەرۆژگاری دەسەلاتی ڕاستەوخۆی ئینگلیزدا، وێڕای ئاوابوونی ئەستێرەی شێخ مەحمودو دەسەلاتەکەی، بەلام ئینگلیز نەیتوانیبوو ئامانجەکانی لەسلێمانیدا وەك پێویست بپێکێت، وەك سۆن بەرنامە ڕێژی بۆ دەکرد، بریتی بوو لە ئامادەکردنی خەڵکی سلێمانی بۆ ژیان لەنێو قەوارەی (عێراق) دا. بەلام ئەم کارە هێندە ئاسان نەبوو، چونکە ڕۆشنبیران و نیشتمانپەروەرانی سلێمانی هەرگیز ئامادە نەبوون خۆیان بە بەشێك لەعێراق بزانن و گوییان بە گۆڕانکاریەکانی عێراق نەدەدا، بۆ نموونە کاتێك لەسەر داوای (پێرسی کۆکس ) عبدالرحمن النقیب، یەکەم وەزارەتی عێراقی لە ١٩٢٠/١٠/٢٥ دا پێکهێنا،[١٨٦] لەژمارە (٢٩)ی ڕۆژنامەیپێشکەوتن دا هەواڵی پێکهێنانی ئەو وەزارەتەو یەکە بەیەکەی وەزیرەکانی بلاوکراوەتەوە، بەلام لەکۆتایی هەواڵەکەدا ئەم دەستەواژەیە نوسراوە کە دەڵێت : "ئەم دەزگاو برەو

---

[١٨٤] د. عثمان علی: هەمان سەرچاوە.

[١٨٥] چیم دی، ب١، ل٧١،٧٢.

[١٨٦] د. رجاء حسین حسنی الخطاب: عبدالرحمن النقیب حیاتە الخاصة واراؤه السیاسیة وعلاقتە بمعاصریة، ط١، بغداد، ١٩٨٤، ل٢١.

حکومەتە دەخلی بەسەر کوردستانەوە نیە ".[۱۸۷] بڵاوکردنەوەی هەواڵەکەش بەم شێوەیە گوزارشتێکی جوانە لە هەستی نەتەوەیی رۆشنبیرانی سلێمانی.

ئینگلیزەکانیش بەچاکی لەویستی کوردەکانی سلێمانی گەیشتبوون بۆیە پرسی کوکس ئەوەی لەوەزارەتەکەی نەقیب گەیاند کە خۆی راستەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری سلێمانی دەکات.[۱۸۸] هەر بۆیە کۆکس لە ۲۵ / ۱۱/ ۱۹۲۰ بەدواوە ڕاستەو خۆ خۆی سەرپەرشتی کارو باری کوردستانی دەکرد و نەیبەستبونەوە بە دام و دەزگاکانی شارەکانی ویلایەتەکانی بەغداو بەسرە[۱۸۹].

دوای ئاوارەکردنی شێخ مەحمود، نیشتمانەپەروەران لەسلێمانیدا هێندە بەئاسانی جڵەو نەکران، بەڵکو کەوتنە خۆ بۆ بەرگرتن لە سیاسەتی بەریتانیا، هەرچەندە بەحوکمی فشاری زۆری (سۆن)ەوە، پێکەوەنان و دروست کردنی رێکخراوی سیاسی ئاشکرا کارێکی ئەستەم بوو، بەڵام وێرای ئەو هەموو فشارو توندو تیژیە، چەندین دەستەو گروپی جیاواز لەسلێمانی لەسەر دەستی لاوانی نیشتمانپەروەر پێکهات.[۱۹۰]

ئەحمەد خواجە ئەم رێکخراوە نهێنیانە بە پێنج دەستە دادەنێت کە بەپرۆگرامەوە کەتونەتە کار بۆ بەرهەڵستی ئینگلیزەکان و جەمال عیرفان سەرۆکایەتی کردوون ، بریتی بوون لەرێکخراوەکانی (بەرزی وڵات، کوردستان، گزنگ، فیداکارانی کورد،وەتەن پەروەران).[۱۹۱]

(نەوشیروان مستەفا)ش بەهەمان شێوە باس لەوە دەکات کەدوای گیرانی شێخ مەحمود، جوڵانەوەی کورد تەواو نەبووەو لەشاری سلێمانیدا رۆشنبیرەکان چەند رێکخراوێکی بچوك بچوکیان پێکهێناوە.[۱۹۲] تەنانەت

[۱۸۷] پێشکەوتن: ژمارە (۲۹)، ۱۱/۱۱/۱۹۲۰.

[۱۸۸] علاءالدین السجادي: هەمان سەرچاوە، ل٩٤.

[۱۸۹] رەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ۲ ، ل ٩٤ .

[۱۹۰] رەفیق حیلمی: یاداشت، ، ب۱، ل۳۲.

[۱۹۱] چیم دی، ب۱، ل٦١.

[۱۹۲] کوردستانی عێراق و دیاردەی فرە حزبی، کوردستانی نوێ، ژ (۲١٦١). ١/٦/۲۰۰۰.

چالاكیەكانی ئەم دەستەو گروپانە تەنها لەنێو سلێمانیدا قەتیس نەبووە، جەمال عیرفان لەو سەروبەندەدا بریاری دا پەیوەندی لەگەڵ (سمكۆی شكاك) دا بكات، كە ئەو كاتە شۆڕشی لەكوردستانی رۆژهەڵاتدا بەرپاكردبوو، هەر بۆیە (رەشید جودتو عارف صائب)ی بە نهێنی رەوانە كرد بۆ لای سمكۆ، بەڵام بە هۆی ئەو شكستە كاتییەوە كە بەسەر سمكۆدا هاتبوو هەر دوو نێردراوەكە لەسەر قسەی (سەید تەها) گەڕانەوە سلێمانی.[193]

ئەوەی زیاتر خەڵكی دەبزواند ئەو سیاسەتە چەوتە بوو كە ئەفسەرە سیاسیەكانی ئینگلیز لەسەری دەرۆیشتن، بەتایبەت كاتێك گاورو جولەكەیان دەهێناو دەیانكردنە كاربەدەستو راوێژكار، ئەوەندەی ترخەڵكیان بێزار دەكرد.[194]

لەو رۆژانەدا ئەو دەستەو كۆمەڵانە رۆڵی بەرچاویان هەبوو لە بەربەرەكانی ئنگلیزداو تینێكی گەورەیان هەبوو وایان كردبوو ژمارەیەكی زۆر لەلاوە خوێندەوارەكان و خەڵكی شارو لادێكان بكەونە خۆ بۆ بەر بەرەكانی ئینگلیز، هەرچەندە ئەو كۆمەڵانە لەسەر بناغەیەكی باشو بەهێزیش دانەمەزرابوون، بەڵام شوێن دەستیان دیاربوو لەخەباتی سیاسیدا.[195]

هەر لەو سەردەمەدا لەنێو سلێمانیدا باوی دەروێشی داهاتبوو، ژمارەیەكی زۆر لەدەروێشەكان لەناو كۆڵانو مزگەوتەكانی سلێمانیدا بڵاوببونەوەو بنكەیەكیان لەگەڕەكی سەرشەقام دامەزراندبوو، ئەم مەسەلەیەش لەلایەكی دیكەوە ئینگلیزەكانی خستبووە ئەندێشەوە.[196]

چونكە ئەفسەرە سیاسیەكانیان جگە لە توندو تیژی، لەهەمان كاتدا رەچاوی هەندێك لایەنی كۆمەڵایەتی و ئاینی خەڵكیشیان نەدەكرد. ئەوەبوو لەسەردەمی سۆن دا لەسلێمانی شوێنێك كرابۆوە بۆ (لەش فرۆشی)و كاری ناشایستە، كە سۆن خۆی ناوی نابوو شوێنی (ئافرەتەبێ رووەكان)* و ٤٠ تا

---

[193] ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب١، ل٦٤.

[194] د. عثمان علی: هەمان سەرچاوە.

[195] رەفیق حیلمی: یاداشت، بە٢، ب١، ل٨٢.

[196] ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب١، ل٧٤.

خۆی ناوی نابوو شوێنی (ئافرەتەبێ رووەکان)[*] و ٤٠ تا ٥٠ ئافرەتی تێدابوو.[١٩٧]

هەر لەسەردەمی حوکمی راستەوخۆی ئینگلیزیشدابوو کە بۆ یەکەم جار رێگادرا لەسلێمانیدا بەئاشکرا مەی بفرۆشرێت و لەژمارە (٧٤)ی پێشکەوتن دا ئاگاداری بڵاوکراوەتەوە کە پێویستە هەر کەسێك شەراب دروست بکات (موفەتیشی گومرگ) ئاگادار بکات، بە پێچەوانەشەوە سزا دەدرێت.[١٩٨]

بەم شێوەیە سۆن دوای ئەوەی زیاتر لەدوو ساڵ حوکمڕانی کرد لەشاری سلێمانیدا، لە ٥ی ئازاری١٩٢١، بەپێی هەواڵێك کە لەژمارە (٤٦) پێشکەوتن دا بڵاوبۆتەوە، دەستی لەکارکێشایەوەو بەپێی ناوەڕکی ئەو هەواڵە سۆن بۆ ماوەی شەش مانگ بەموڵەت گەڕاوەتەوە بۆ لەندەن و (مێجەر گۆڵد سمیث) هاتۆتە شوێنەکەی.[١٩٩]

---

* رەسول هاوار لەم بارەیەوە دەڵێت " سۆن شوێنی بۆ ژنە خراپ و داوێن پیسەکانی ئەو سەردەمە کردبۆوە و پۆلیسی پارێزگاری شوێنەکەیان دەکرد ، کە ئەو ڕۆژانە بوونی شوێنی وا کوفر و ناشایشتە بوو هەرچی بەلای ئەوەدا بچوایە خۆڵ و دۆی دەکرا بەسەرداو بەرەو پشت سواری گوێ درێژیان دەکرد ، وەکو ئەگێڕنەوە ( جەلالی فاتە بچکۆل ) ناو یەکێك بووە لەوانەی کە سەرپەرشتی ئەو شوێنەی کردووە دوای ڕۆیشتنی سۆن شار بەدەر کراوە" ، ئەحمەد خواجەش لەم بارەیەوە دەڵێت : "ئینگلیزەکان لە کوردستاندا چاکەیەکیان بەجێ نەهێشت کە شایستەی یاد کردنەوە بێت ، ئەوە نەبێت کە (ئەرو سپیخانە ) یەکیان ناو جەرگەی شاری سلێمانیدا دامەزراند " ، شێخ لەتیفیش لە یاداشتەکانیدا بە هەمان شێوە باس لەوە دەکات کە سۆن لە سلێمانیدا ( تیا ترۆخانە ) یەکی کردۆتەوە بۆ ئەوەی ڕەوشتی خەڵکی پێ بێنێتە خوارەوە . ( رەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب١ ، ل ٤٧٦)؛ ئەحمەد خواجە : بیرەوەری ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، ژمارە ( ١١١ ) ، ل ٨٥ ؛( شێخ لەتیف : یاداشت ، ل٦٠ ).

[١٩٧] جەمال بابان: شارە گەشاوەکەم، ب٢، ل٨٥.

[١٩٨] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٥: پێشکەوتن: (٧٤)، ١٩٢١/٩/٢٢.

[١٩٩] پێشکەوتن: ژمارە (٤٦). ١٩٢١/٣/١٠.

دوای ڕۆیشتنی سۆن ڕۆژنامەی پێشکەوتن بەردەوام بوو لەدەرچوون، هەرچەندە خزمەتی سیاسەتی بەریتانیای دەکرد، بەڵام لەهەمان کاتدا دەلاقەیەك بوو بۆ خەڵکی سلێمانی کە لێوەی دەیانڕوانیە ڕووداوەکانی دەوروبەر لەجیهان، بەتایبەت ئەو هەواڵانەی کە پەیوەست بوون بە دوا ڕۆژی سیاسی قەوارەی تازە دامەزراوی عێراقەوە، بۆ نموونە لەژمارە (٤٧)ی ڕۆژنامەی نێوبراودا هەواڵی سەفەری (سێر پێرسی کۆکس)و (ئایمەر هالدن) بەمەبەستی بەشداریکردن لەکۆنگرەی قاهیرە* بڵاوکراوەتەوە.[٢٠٠]

ئەم شێوە هەواڵانەو ئەو گۆڕانکاریانەی هاتبوونە پێش ڕەوشێکی نائاسایی لەسلێمانیدا هێنابووە ئاراوە، جمو جۆڵی سیاسی خەڵکی بەشێوەیەکی سەرەکی بەمەبەستی هێنانەوەی شێخ مەحمود ئاراستە کرابوو.[٢٠١]

ڕۆشنبیران و نیشتمان پەروەرانی سلێمانی پەیوەندی بەتینیان لەگەڵ هۆزە کوردەکانی دەوروبەریشدا هەبوو، ئەوانیشیان هاندەدا کە داوای گێڕانەوەی شێخ مەحمود بکەن، (ئەحمەدی‌حمە ئاغای پشدەری) وەك شایەتێکی حاڵی سەردەمەکەی باسی کردووە کە چۆن ئەو کاتە عەشایەر مەزیەتەو داوایان داوەتە ئینگلیز تاوەکو شێخ مەحمود بگێڕنەوە، دان بەو ڕاستیەشدا دەنێت کە لەسلێمانیەوە (سەید عەوڵای حاجی سەید حەسەن)و (تایەری ئەمین ئەفەندی) کاغەزیان بۆ ناردوون و داوایان لێکردون نامە بنوسن

---

*دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانیی یەکەم کار بەدەستانی ئینگلیز پاش تێپەڕ بوونی دوو سێ ساڵێك هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە پێویستە کۆنگرەیەك بۆ لێپرسراوانی بەریتانی دەربارەی گیرو گرفتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ببەسترێت بۆ ئەم مەبەستەش شاری قاهیرەی پایتەختی میسر دەست نیشان کرا لەسەر پێشنیاری مستەر ( ونستۆن چەرچل ) ی وەزیری موستعمەراتی بەریتانی ، کۆنگرەکە لە نێوان ڕۆژانی ١٢ – ٣٠ / مارت / ١٩٢١ بەسترا . ( د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر : کۆنگرەی قاهیرەو کارو باری ناوچەکانی کورد ، گۆڤاری نوسەری کورد ، ژمارە ٢ ، خولی سێهەم ، ئابی ١٩٨٥ ).

[٢٠٠] پێشکەوتن: ژمارە (٤٧) ١٩٢١/٢/١٧.

[٢٠١] د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك، ب١، ل١٥٦.

بۆ کۆکس لە بەغدا تاوەکو شێخ مەحمود بنێرێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی کوردستان تەنانەت ئاماژە بەوە دەکات کە شێوەی نوسینی داواکاریو مەزبەتەکانیشیان بۆ ناردوون‌و پوولیشیان بۆ ڕەوانە کردوون.[٢٠٢] ئەمەش بۆخۆی بەڵگەیەکی روون ئاشکرایە کە رۆشنبیرانی سلێمانی لە جم‌و جۆڵی سیاسیاندا لەدەوروبەر دانەبڕوان‌و بەردەوام پەیوەندیان پێکەوە هەبووە.

بەڵام دەسەڵاتدارانی بەریتانیا ئەو کاتە هێشتا تینیان بۆ نەهاتبوو بۆیە ئەم مەسەلەیەیان هێندە لاگرنگ نەبوو، هەربۆیە بۆ وەڵام دانەوەی ئەو واتە واتەی کە لەسلێمانیدا بڵاو ببۆوە، پێشکەوتن لەژمارە (٥٨)ی دا، باس لەوە دەکات کە حاکمی سلێمانی لەبەغدا لەگەڵ مەندوبی سامی کۆبۆتەوەو سەبارەت بەمەسەلەی هێنانەوەی شێخ مەحمود گفتوگۆیان کردووە، بەڵام مەندوبی سامی قەبوڵی نەکردووە بهێنرێتەوە.[٢٠٣]

ئەم بارودۆخەی سلێمانی تادەهات زیاتر ئاڵۆز دەبوو، ئینگلیزی خستبووە مەترسیەوە، بەتایبەت ئەو کاتە لەسلێمانیدا بیروڕای جیاواز هەبوو، بەئاشکراش هەست بەم مەسەلەیە دەکرا، ڕەسول هاوار لە ڕووی بیرو بۆچوونەوە دانیشتوانی سلێمانی بەسەر سێ تاقمدا دابەش دەکات، دەستەی یەکەمیان بریتی بوون لەوانەی لەرۆژگاری دەسەڵاتی عوسمانیدا کاربەدەست و موچەخۆر بوون، ئەمانە لەلایەن ئینگلیزەوە بێزراوبوون، دەستەی دووەم زۆرینەی خەڵکە رەشۆکیەکەبوو کە تا ئەندازەیەکی بەرچاوو کاریگەریی ئاینیان بەسەرەوە بوو، وێڕای تاقمی سێهەم کە هیچ باوەڕێکیان بەئینگلیز نەمابوو، چونکە هیچیان بۆ کورد نەکردبوو، ئەمانە نەسەر بەئینگلیزو نەتورکخوا بوون،[٢٠٤] بەڵام وێڕای ئەم سێ دەستەیەی هاوار باسیان لێوە دەکات، دەستەیەکی دیکەی تازە پیا کەوتوش هەبوو، کە لە داموو دەزگاکانی

---

[٢٠٢] بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی حمە ئاغای پشدەری، ل٥٤-٥٥.

[٢٠٣] پێشکەوتن: ژمارە (٥٨) ، ١٩٢١/٦/٢.

[٢٠٤] شێخ مەحمودی قارەمان، ب٢، ل١٤٤.

میریدا دامەزرابوون و سەر بەئینگلیز بوون، بەلاّم زۆرجار سەرجەم ئەم دەستانە، دژ بە لاوە نیشتمانپەروەرو رۆشنبیرەکان دەوەستان.[٢٠٥]

ویّرای ئەم جیاوازی بیرو بۆچوونە، زۆر بەزەقی هەست بەوە دەکریّت کە خەلکی سلیّمانی لەگەلّ ئەوە دانەبوون کە بەشیّك بن لەدەولّەتی تازە دامەزراوی عیّراق، تەنها، ژمارەیەکی کەم نەبیّت لەبازرگان و خاوەن مولّکەکان،ئەمانەش زیاتر لەژیّر کاریگەری هۆکارە ئابوریەکاندا بوون.[٢٠٦]

لەبەلّگەنامەیەکی بەریتانیدا یاداشتانامەیەکی میّجەر ( یۆنگ ) ی تیّدایە دەربارەی کورد کە تیّیدا دەلّیّ :" بۆ چوونی من ئەوە بوو کە هیچ کوردیّك لە ناوچە کوردیەکاندا بەوە رازی نیە بخریّتە ژیّر دەسەلاّتی فەیسەلّ، ئەگەر چی رەنگە بتوانریّ جگە لە سلیّمانی ئەوانی تر بهیّنریّنە ژیّربار ئەگەر دلّنیا بکریّن لەوەی بەریتانیا سەرپەرشتی فەیسەلّ دەکاو بەپیّی راویّژی بەریتانیا دەروا بەریّوە "، لیّرەدا زۆر بە روونی هەست بەوە دەکەین کە ( یۆنگ ) سلیّمانی لە شارەکانی دیکە جیا کردۆتەوە و دلّنیایە لەوەی سلیّمانی بە هیچ شیّوەیەك نە بە حوکمی فەیسەلّ رازیەو نە ئامادەشە بلیکیّندریّت بە دەولّەتی تازە دامەزراوی عیّراقەوە ، تەنانەت ( یۆنگ ) لە هەمان راپۆرتدا راشکاوانە ئەم دەستەواژەیە بەکاردەهیّنیّت و دەلّیّت :" سلیّمانی زۆر کەللە رەق و درن ." هەر ئەو سەردەمە پیّدەچیّت حکومەتی بەریتانیا بە نیاز بوبیّت فەیسەلّ هان بدات کە گەشتیّك بە ناوچە کوردیەکاندا بکات و بۆ ئەمەش داوای لە ئەفسەرە سیاسیەکانی خۆی کردووە کە کارو باری بە پیرەوە چوونی بۆ ریّك بخریّت ، بۆیە ( یۆنگ ) بە ئاشکرا بیرو رای خۆی دەردەبریّت و دەلّیّت :" لە شویّنیّکی وەکو سلیّمانیدا کاتیّك دەتوانریّ ئەو پیّشوازیە لە

[٢٠٥] أ.ب، هەوری: سولەیمانی لەسالّی ١٩٢٥و ١٩٢٦ دا، گۆڤاری بەیان ژمارە(٢٨)، ئاب، ١٩٧٥، ل٢٩.

[٢٠٦] د.عبد الستار طاهر شریف:الجمعیات والمنظمات والاحزاب الكردیةفي نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨،بغداد، ١٩٨٩،ل٩١.

فەیسەڵ بکرێ ، مەگەر پێیان بگوترێ : فەیسەڵ دۆستی ئینگلیزەو مەلیـ
عێراقە نەك مەلیکی کوردەکان". [٢٠٧]

هەر بۆیە، حکومەتی بەریتانیاش رەچاوی ئەم هەستەی سلێمانـ
دەکرد. ئەوەتا لەژمارە (٥٩)ی پێشکەوتن دا هەواڵی ئەوە بلاوکراوەتەوە کـ
جەنابی حاکمی سیاسی سەردانی بەغدای کردوە بەمەبەستی گفتوگۆ کرد
سەبارەت بەدوارۆژی سلێمانی و راشکاوانە دەڵێت: "لەبەرنواندنی بیری هەمو
سلێمانی، کە هەتا سێ ساڵ ئیدارەی حکومەتی سلێمانی لەهی عێراق جیاوا
بێت، لەپاش رابووردنی ئەم سێ ساڵە دیسانەوە فرسەتێکی تر بەئەهالی ئە
لیوایە ئەدرێت کە بە تەحریکی قەتعی بیری خۆیان بنوێنن، کە ئایا یەکێتی
لەگەڵ حکومەتی میللی بەغدا بەباش ئەزانن یانا" [٢٠٨] بەریتانیا تەواو
دڵنیابوو لەم بۆچوونە جودا خوازەی سلێمانی، تەنانەت کاتێك میر (فەیسەڵی
کوڕی شەریف حوسێن)* لەلایەن بەریتانیاوە دەست نیشان کرا بۆ تەختی
عێراق و لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٢١ گەیشتە بەغدا تاوەکو ببێتە شای ئەو قەوارە
نوێیە، بەریتانیا بریاریدا کە راپرسیەك ئەنجام بدرێت بەمەبەستی پیشاندانی
رەزامەندی بەرامبەر فەیسەڵ [٢٠٩] بەڵام لەم هەنگاوەشدا هیچ گوشارێك
نەنراوەتە سەر دانیشتوانی شاری سلێمانی، هەر بۆیە لەژمارە (٦٥)ی
پێشکەوتن دا هەواڵی ئەوە بلاوکراوەتەوە، کە حاکمی سیاسی سلێمانی،
دانیشتوانی شارەکەی سەر پشك کردووە، لەبەشداری کردن لەو راپرسیەدا،

---

[٢٠٧] رەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل ١٠٥، ١٠٧.
[٢٠٨] پێشکەوتن: ژمارە (٥٩)، ١٩٢١/٦/٩.
* فەیسەڵی کوڕی حوسێن لە ساڵی ١٨٨٣ لە شاری مەککە لە دایك بووەو خوێندنی لەسەر دەستی مامۆستای تایبەت لە کۆشکەکەی باوکیدا خوێندووە ، ماوەیەك لە ئەستەنبول ژیاوە لەگەڵ بنەماڵەکەیدا و ساڵی ١٩٠٨ گەڕاوەتەوە بۆ مەککە و تێکەڵی کارو باری سیاسەت بووەو پەیوەندی لەگەڵ عەرەبە ناسیۆنالیستەکان بەستووە بە تایبەتی پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩١٣سەردانی دیمەشقی کردووە لەسەرو بەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا پشتیوانی تەواوی لە بەریتانیاو هاوپەیمانەکان کرد و تا مردیش پشتی بە ئینگلیز دەبەست .
(عبدالغنى الملاح : تاريخ الحركة الديمقراطية في العراق / ط٢ ، بيروت ، ١٩٨٠ ، ل ٢٧-٢٨).
[٢٠٩] السيد عبدالرزاق الحسني: تاريخ العراق السياسى الحديث، ط١، ج٢، بغداد، ١٩٨٩، ل١٠.

شارەکەی سەر پشك کردووە، لەبەشداری کردن لەو راپرسیەدا، لەوەش ئاگاداری کردونەتەوە کە بەشداری کردن یا بەشداری نەکردنیان هیچ کاریگەریەکی نیە بۆسەر کاروباری دوا رۆژی لیوای سلێمانی.[210]

هەر بۆیە وەك سەرجەم سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، شاری سلێمانی بەهیچ شێوەیەك بەشداری لەراپرسیەکەی (فەیسەڵ) دا نەکردووەو بەپیریەوە نەچوون،[211] هەرچەندە هەوڵیان دا لەنێو شاردا زمانی خەڵك تاقی بکەنەوەو رایان وەبگرن بۆ پشتگیریکردنی فەیسەڵ ، ئەحمەد خواجە بەم جۆرە باس لەو کارەی ئینگلیزەکان دەکات و دەڵێت : " لەگەڵ هێنانی فەیسەڵی یەکەمدا، لەلایەن پیاوە درۆزن و دەس بڕەکانی بەریتانیاوە لەسلێمانی کە ئەو وەختە ناوچەی هەرە بەهێزی داوای سەربەستی و ئازادی کورد بوو لەکوردستاندا، کەوتنە تەڵەکەبازی و ئەم پرسیارانەیان دروست کرد:-

١-پرسیاری یەکەم : (لام باش نیە)
٢-تێکەڵ بوون بەعەرەبی عێراق.
ب-باوەڕکردن بەفەیسەڵی یەکەم.
٢-پرسیاری دووەم: (لام باشە)
بەپێچەوانەی پرسیاری یەکەم.

لەدوای ئەم پرسیارو بەخت بێ نیە، لەهەموو لیوای سلێمانیدا تەنیا دوو لام باشە دەرچوو، کەچی لەجیاتی بەڵێنە نامەردانەکەیان ناوی کوردستانیان کردبەشمال"[212]،بێگومان ئەمەش جەخت کردنێکی ئاشکرای

---

[210] پێشکەوتن، ژمارە (٦٥)ی ٢١/تەمموزی /١٩٢١.

[211] حسین جمیل: العراق شهادة سیاسیة- ١٩٠٨-١٩٣٠، لندن، ١٩٨٧، ل٧١. ؛دیریك کینان: کوردو کوردستان ، وەرگێڕانی،ئەبوبەکر خۆشناو سلێمانی، ١٩٩٩، ل٤٤؛ د. ابراهیم خلیل احمد، د. جعفر عباس الحمیدي: تأریخ العراق المعاصر، موصل، ١٩٨١، ل٣٢. ؛ پێشکەوتن: ژمارە (٦٦)ی ٢٨/تموزی/١٩٢١.

[212] ئەحمەد خواجە: مێژووی لام باش نیەی سلێمانی، گۆڤاری هیوا، ژمارە (٦-٧)، کانونی دووەم، ١٩٥٩، ل٤٩،٥٠.

خەڵکی سلێمانی بوو بۆ دەربڕینی ویستی خۆیان لەدامەزراندنی قەوارەیەکی سەربەخۆو جودا لە عێراق[٢١٣].

لەسلێمانیدا تا دەهات جموجۆڵی سیاسی کۆمەڵەو گروپە بچوکەکان زیاتر پەرەی دەستاندو داواکاری هێنانەوەی شێخ مەحمود زیاتر دەبوو، دەسەڵاتدارانی ئینگلیزش لەسەر لاپەڕەکانی پێشکەوتن پڕوپاگەندەکانی گێرانەوەی شێخ مەحمودیان بەدرۆدەخستەوە.[٢١٤] بەڵام کاتێك بەروونی لەویستو داخوازیەکانی خەڵکی سلێمانی دڵنیابوون‌و زانییان سوورن لەسەر هێنانەوەی شێخ مەحمودو ئامادەنین وەك بەشێك لەعێراق مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، کاربەدەستانی بەریتانیا بۆ چاوبەستەکێ بڕیاریاندا وەك هەنگاوێك ئەنجومەنێك لەسلێمانیدا پێکبهێنن بەنێوی (مەجلیسی ئیدارەی) سلێمانی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شارەکە و یارمەتیدانی حاکمی سیاسی، کە لێرەدا مەبەستیان چارەسەرکردنی ئاژاوەو پشێویەکانی سلێمانی بوو.[٢١٥]

ئەوەبوو یەکەم ئەنجومەنی شار لە ساڵی ١٩٢٠ هەڵبژێردرا کە لەم ناوانە پێکهاتبوو:( میرزا فەرەج، برایم ئاغای خەفاف، تۆفیق وەهبی، غەفورئاغای حاجی ئەولا)[٢١٦].

دووەم ئەنجومەنی شاریش لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢١ هەڵبژێردرا، بۆ ئەم مەبەستەش لەژمارە (٧٦)ی پێشکەوتن دا ڕاگەیاندنێکیان بڵاوکردەوەو تیایدا ئەوە روون کراوەتەوە کە ژمارەی ئەندامانی مەجلیسی ئیدارەی سلێمانی لە (١٢) ئەندام پێك دێت، کە چواریان لەلایەن دانیشتوانەوە هەڵدەبژێردرێت‌و چواریشیان مەئموری حکومەتن، چوارەکەی دیکەش نوێنەرایەتی قەزاکانی دەوروبەری سلێمانی دەکەن.[٢١٧]

---

[٢١٣] عبدالرحمن البزاز: العراق من الاحتلال حتى الاستقلال، ط٣، بغداد، ١٩٧٦، ل٩٠ ؛ هارقی موریس، جون بلوخ: لا اصدقاء سوى الجبال، ترجمة، راج ال محمد، دمشق، ١٩٩٦، ل٨٤.

[٢١٤] پێشکەوتن، ژمارە (٦٥)ی ٢١/تەموزی/١٩٢١.

[٢١٥] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، ب٢، ل٢١، ٢٢.

[٢١٦] پێشکەوتن: ژمارە (٣٨)،١٣/کانونی دووەمی١٩٢١.

[٢١٧] پێشکەوتن: ژمارە (٧٦)ی ٦/ی تشرینی یەکەم/١٩٢١.

ئەم ئەنجومەنە هەرچەندە لەڕواڵەتدا واپیشان دەدرا کە لەلایەن خەڵکیەوە بەئازادی هەڵدەبژێردرێت بەڵام لەڕاستیدا لەژێر چاودێری، حاکمی سیاسی‌دا بوو، ئەو کەسانەشیان بۆ ئەم پۆستە دەپاڵاوت کە لایەنگری خۆیان بوون و خاوەن بەرژەوەندی بوون[۲۱۸] * .

لەڕێکەوتی ١٦ی تشرینی یەکەمی١٩٢١ دا ئەنجومەن هەڵبژێردراو ئەم ناوانە بوون بەئەندامانی یەکەم ئەنجومەنی ئیدارەی سلێمانی کە پێهاتبوون لە (حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا، عەبدول فەتاح چەلەبی، جەمال عیرفان، حاجی برایم ئاغا) لەشاری سلێمانی جگە لەم چوارەش:-(سدیق مەزهەر)ی سەرۆکی دادگاو ساڵح پاشاو (کاپتن هۆڵت)ی یاریدەدەری حاکمی سیاسی و ئەحمەد موختار قازی، ئەندامانی ئاسایی ئەنجومەنەکە بوون، لەخەڵکی قەزاو ناحیەکانیش چوار کەسی دیکە دەست نیشان کران، بەم شێوەیە لەژێر سەرۆکایەتی حاکمی سیاسی شاردا، ئەنجومەن دەست بەکاربوون.[۲۱۹] بەڵام ئەم هەنگاوەش نەیتوانی نیشتمانپەروەرانی سلێمانی بێدەنگ بکات و داخوازیە راستەقینەکەیان پێ فەرامۆش بکات کە بریتی بوو لەهێنانەوەی شێخ مەحمودی بەرزنجی، بەڵام ئینگلیزەکان ئامادەنەبوون بەهیچ شێوەیەك مل کەچ بکەن بۆ ئەو داواکاریەی دانیشتوانی سلێمانی، هەر بۆیە بیریان لەشێوازێکی دیکە کردەوە، ئەوەش بەدانانی کەسێکی دیکە لەشوێنی شێخ

---

[۲۱۸] أ . م. متشاشیفلی: العراق فی سنوات، ل٣١٦.

* ڕەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا باس لەوە دەکات کە چۆن لە لایەن خەڵکیەوە ناوی ئەویش بە مەزبەتە پێشکەش بە کاپتن هۆڵت کراوە ، بەڵام ئینگلیزەکان ڕازی نەبوون ببێت بە ئەندامی ئەو مەجلیسە بۆیە ( جەمال عیرفان ) یان ناردۆتە لای تاوەکوپەشیمانی بکاتەوە بەڵام ئەو هەر پەشیمان نەبۆتەوە ، ناچار لە کۆتایدا بە نووسراوی ڕەسمی مەزبەتەکەی ئەویان ڕەت کردۆتەوە بە بیانوی ئەوەی ڕەفیق حیلمی لە ڕێگای دەرس ووتنەوەوە باشتر خزمەت دەکات . ( یاداشت ،ب١ ، ل ٢٢ ) .

[۲۱۹] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، ب٢، ل٢١-٢٢.

مەحمود، بەتایبەتی کاتێك (عەلی شەفیق)ی میرئالای تورك کە بە(ئۆزدەمیر)** ناسرابوو بەخۆی و چەند سەربازێکی تورکەوە لە ۱۹۲۲/٦/۲۳ دا.[۲۲۰]

گەیشتە کوردستانی خواروو لە ( رەواندز ) جێگیر بوو، کەوتە هاندانی خەڵکی دژ بەئینگلیزەکان، هەر کەسێك ناحەزی بەریتانیاو حاکمە سیاسیەکانیان بوایە خۆی دەگەیاندە رواندوزو دەچووە پاڵ ئۆزدەمیر.[۲۲۱]

هەر بۆیە ئینگلیزەکان بەدوای کەسێکدا دەگەڕان کە بەدیلی شێخ مەحمود بێت و لە ئاست تورکەکاندا خۆڕاگربێت، مەرج نەبوو ئەو کەسە کوردێکی نیشتمان پەروەر بێت.[۲۲۲]

هەر ئەم بۆچوونەش وای لەبەریتانیا کرد کە لەنێو کەسایەتیە کوردەکانی ئەو سەردەمەدا، بیریان بۆ کەسێکی وەك ( حەمدی بەگی بابان )* بچێت، بۆ ئەوەی لەشوێن شێخ مەحمود بیکەن بەگەورەو دەم راستی کورد

---

** ئۆزدەمیر کۆلۆنیلێکی سوپای کەمالیەکان بوو کە بەرەگەز لە چەرکەسەکانی مسر بوو ، نێو براو خۆیی و دەستەیەك سەربازی تورك بەمەبەستی ئاژاوە نانەوەو دژایەتی کردنی بەریتانیا هاتنە کوردستانی باشورو لە رەواندوز جێگیر بوون ، ئیدی بەم شێوەیە توانیان ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی ناحەزی ئینگلیز لە خۆیان کۆ بکەنەوەو هەرێمێکی فراوانیش کۆنترۆڵ بکەن ، ئەمەش وای کرد کە ئینگلیزەکان مەترسیان لێ بنیشێتوو بە ناچاری لە کۆتایدا شێخ مەحمودیان هێنایەوە بۆ کوردستان بەمەستی دەرپەڕاندنی ئەم دەستەیە . (رەفیق حیلمی ، یاداشت ، بەرگی دووەم ، ب ۱ ، ل۲۵-۲٦ ) .

[۲۲۰] ادموندز:هەمان سەرچاوە، ل۲۲۲؛ رەفیق حیلمی: یادداشت، ب۱، ل۲٤.

[۲۲۱] رەفیق حیلمی: یادداشت، ب۱، ل۲٦-۲۷.

[۲۲۲] حوسێنی مەدەنی: هەمان سەرچاوە، ب۱،ل۳۳۲.

* حەمدی بەگ کوڕی محەمەد پاشای خدێو و برای ئەحمەد پاشای سلێمان پاشای دوا میری بابانە، ساڵی ۱۸۷۰ لەدایك بووە، لەمەکتەبی شاهانەی ئەستەمبۆل خوێندویەتی، و سەربە گرووپی ئیتیحاد و تەرەقی بوو، ئەوانیش وەك نوێنەری خۆیان ناردیانە بەغدا،رۆشنبیری‌یەکی بەرز و کتێبخانەیەکی یەکجار دەوڵەمەندی هەبووە، کە لە عیراق دڵشکاوبوو و مەلیك فەیسەڵ دەستی بەسەر موڵکەکانی‌داگرت، و لە ساڵی ۱۹۲٦ چووە لەندەن و لە ۱۹٦۰/۱۱/۱۸ لەوێ کۆچی دوایی کرد.(بڕوانە : میر بصري : اعلام الكرد ، ط۱،لندن،۱۹۹۱، ل۱۵۹)

لەسلێمانی، هەرچەندە ناوبراو کوردیشی نەزانیوەو زیاتر ژیانێکی شاهانە ژیاوە، بەلام وەك رەفیق حیلمی دەڵێت، بەفیتی ئینگلیز کەوتبووە سەرسەودای حوکمداری و دەیویست لە کوردە نیشتمانپەروەرەکان نزیك بێتەوە، کە تا ئەو رۆژە سلێمانی نەبینیبوو، هەر بۆیە ویستویەتی خەڵك لەخۆی کۆبکاتەوەو کۆمەڵەو پارتێك پێکەوە بنێت، لەم مەسەلەیەشدا داوای لە رەفیق حیلمی کردووە کە ئەو ئەرکەی بۆ لەئەستۆ بگرێت، ئەویش لەسلێمانیدا کەوتۆتە جموجۆڵ و کۆمەڵەیەکی بۆ پێکهێنابوو بەناوی (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان). هەرچەندە کۆمەڵەیەکی سیاسیش نەبووە، بەلام توانیویەتی لەماوەیەکی کەمدا ژمارەیەکی باش خەڵك لەدەرەوەی خۆی کۆبکاتەوەو کار بۆ یەکخستنی کورد بکات. هەرچەندە رەفیق حیلمی توانیویەتی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بە سەرۆکایەتی (حەمدی بەگ) رازی بکات، بەلام دواتر ئینگلیزەکان (حەمدی بەگ)یشیان پەسەند نەکردووەو دووریان خستۆتەوە.[٢٢٣]

هەر ئەو سەردەمە تا دەهات (ئۆزدەمیر) زیاتر لەنێو هۆزە کوردەکاندا دەسەلاتی پەیدا دەکردو کێشەی بۆ ئینگلیز دەنایەوەو شەڕو پێکدادان لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، بەریتانیەکان هێزی (لیڤی) سلێمانیان ناردە سەریان، بەلام نەهێزی لیڤی و نە لەشکری سیكو هندۆس ، نەیانتوانی بەر بەچەکداری عەشایەری کورد بگرن، ئەوەبوو لە ٢٣ی ئابی ١٩٢٢ دا هێزەکانی ئینگلیز خراپ شکان. هەر ئەم شکستەش وای لێکردن وەك (مس بیل) دەڵێت چاوێك بەبارودۆخی خۆیاندا بخشێننەوە.[٢٢٤]

د. کەمال مەزهەر لەم بارەیەوە دەڵێت :"ئینگلیزەکان ناچار بوون سەر بۆ ویستی گەل شۆڕبکەن و پیلانی لەناوبردنی شێخ لەبیر خۆیان بەرنەوەو

---

[٢٢٣] یادداشت، ب٢، ل١١٣-١١٤.

[٢٢٤] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١/١٢٦.

ڕێگە بدەن بگەڕێتەوە، بەو هیوایەی دەرسی لەدەردو ئازاری دەربەدەری چەند ساڵەی وەرگرتبێت"[٢٢٥].

بەڵام لەڕاستیشدا جگە لەشێخ مەحمود کەس نەیدەتوانی لەگەڵ خەڵکی ئەو شارەدا مامەڵە بکات و بتوانێت هێوریان بکاتەوە، زەمانیش بەزیانی ئینگلیزو بەقازانجی تورك وەردەچەرخا زۆربەی خەڵکی کوردستان بڕوایان بەئینگلیز نەمابوو کارێکیان بۆ بکا، بەو جۆرە بەلای تورکدا بایان دابۆوە.[٢٢٦]

---

[٢٢٥] چەند لاپەڕەیەك، ب١، ل١٥٥-١٥٦.

[٢٢٦] حوسێنی مەدەنی: هەمان سەرچاوە، ب١، ل٣٢٣.

# بەشی سێیەم

## سلێمانی لە سەردەمی حوکمداریەتی شێخ مەحمود دا

**باسی یەکەم: بارودۆخی سلێمانی بەر لە هێنانەوەی شێخ مەحمود**

**١-هاتنەوەی شێخ مەحمود**

**٢-گەڕانەوەی ئینگلیز بۆ سلێملنی**

**٣-سێهەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود**

**باسی دووەم: هاتنی سمکۆی شکاك بۆ سلێمانی**

**باسی سێیەم: بیروباوەڕی سیاسی لە شاری سلێمانیدا**

## باسی یەکەم
## بارودۆخی سلێمانی بەر لە هێنانەوەی شێخ مەحمود

دوای ئەوەی ئینگلیزەکان کۆمەڵێك شکستی یەك لە دوای یەکیان لە هەریر و رانیە و کۆیە توش هات، بارودۆخەکە تادەهات زیاتر بەرەو ئاڵۆزبوون دەچوو ، بەریتانیا لای خۆیەوە هەوڵی زۆری دەدا بۆدووبارە کۆنترۆڵ کردنەوەی ناوچەکە بەڵام لەو ڕۆژگارە دا هەرگیز خۆیان بە خاوەن دەسەڵاتی تەواو نەدەزانی .چونکە تا دەهات فشاری تورك زیاتر دەبوو، زیاتریش لەلایەن خەڵکەوە دژایەتی دەکران ، بە تایبەتی لە ناو شاری سلێمانیدا، دوای ئەوەی ( ئۆزدە میر) لە ڕەواندوز خۆی قایم کرد، هێندەشی پێنەچوو کەمالییەکان (فەوزی بەگ ) ناوێکیان ڕەوانەی ڕەواندز کرد و کردیان بە (قائمقام)[١] .

سیاسەتی دەست تێوەردانی تورك ، ئینگلیزەکانی پەرێشان کردبوو، پیاوەکانیان بە ئاشکرا لە ناوچەکەدا هاتووچۆیان دەکرد، لەم بارەیەشەوە شاری سلێمانی ئامانجێکی بەر چاوی تورکیای کەمالی بوو ، هەوڵی دەدا ناڕەزایی شارەکە بقۆزێتەوە بۆ خزمەتی سیاسەتی خۆی.بەتایبەتی دوای دوور خستنەوەی شێخ مەحمود و بێبەڵێنی ئینگلیزەکان ،بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان بەلای تورکدا دایان دەشکاندەوە [٢] .

ئینگلیزەکانیش لەسەرەتادا بۆ ئەوەی سنورێك بۆ ئەم دۆخە دابنێن ، بیریان لە دۆزینەوەی ئلتەرناتیڤێك کردەوە بۆ شێخ مەحمود ، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون[٣] .

لە کۆتاییدا ناچار بوون بیر لە شێوازێکی دیکە بکەنەوە بۆ جڵەوکردنی ناڕەزاییەکانی گەلی کورد، بە تایبەتی لەشاری سلێمانیدا ، کە بووبووە مەکۆی

---

[١] لازاریف : المسألة الكردية ، ل٢٢٠

[٢] سەرچاوەی پێشوو ، ل١٠٤

[٣] حوسێنی مەدەنی : هەمان سەر چاوە ، ل٣٣٢

نارەزایی دژ بە ئینگلیز ، پیاوەکانی (ئۆزدەمیر )لە سلێمانیدا پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاودەکردەوە کە گوایە بەم زووانە هێزی تورك دەگەڕێتەوە بۆ ویلایەتی موسڵ و داگیری دەکاتەوە[٤] .

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پڕوپاگەندانە ، ئینگلیزەکان لە سەرەتادا ویستیان سوود لەبیری نەتەوەیی کورد پەروەرانی سلێمانی وەربگرن ، بۆ ئەم مەبەستەش ڕێگایان دا بە (مستەفا پاشای یاملکی)*کە جەمعیەتێك پێکبهێنێت ، کە بە ( جەمعیەتی کوردستان ) ناو نراو یەکەم کۆمەڵەی ئاشکرا بوو لە کوردستانی باشووردا دامەزراو ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکیشیان پێدا بە نێوی ( بانگی کوردستان )[٥] .

بەڵام دامەزرێنەرانی ڕێکخراوەکە ئەو ڕاستیەیان نەدەشاردەوە کە (جەمعیەتی کوردستان ) بەیارمەتی و ڕێگە پێدانی بەریتانیا لە سلێمانی پێکهێنراوە .

ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ١٩٢٢/٧/٢١ لە مزکەوتی ( سەید حەسەنی موفتی ) پیاوماقوڵان و ڕوناك بیران و بازرگانەکان کۆبونەوەولە هەڵبژاردنێکی نهێنی (١٣) کەس بە دەستەی بەڕێوە بەری ( جەمعیەتی کوردستان ) هەڵبژێردران ،لەناو ئەوانەشدا ڕەفیق حلمی ، زۆرترین دەنگی بەدەست هێنا بوو[٦] .

مستەفا پاشای یاملکی لە ڕێگای ( جەمعیەتی کوردستان ) ەوە ، زۆر پەرۆشی ئەوە بوو ، کە بەر بە پڕوپاگەندەی تورکخواکان بگرێت ، بە تایبەتی دوای ئەوەی کەمالیەکان، بەهێز بوون و، کێشە ناو خۆییەکانی خۆیان چارەسەر کرد ،زیاتر بەلای ویلایەتی موسڵدا بایان دابۆوە ، ئەو مەسەلەیەیان

---

[٤] یادداشت : ب٢ ، ل٦٨.

[٥] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد : صفحات من تأريخ العراق المعاصر ، ،بغداد ، ١٩٨٧ ، ل ١٢٩؛ ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) ژمارە(١١٨) ، ٢٧/تموز /١٩٢٢.

[٦] بانگ کوردستان ، ژمارە (١) ، ١٩٢٢/٨/٢.

دەوروژاند[٧] .ئینگلیزەکانیش بۆ هێور کردنەوەی شارەکە ، (یاسین الهاشمی) یان هاندا کەوا سەردانی سلێمانی بکات. بەلام ئالۆزی کێشەکان هێندە پەرەیان سەندبوو، ئاوەهابە ئاسانی چارە سەر نەدەکران ، تەنانەت ئینگلیزەکان بیریان لەوە دەکردەوە کە سلێمانی چۆڵ بکەن و پاشەکشە بکەن ،ئەم ڕاستیەش لەو ڕاپۆرتەدا ئاشکرا دەبێت کە ئینگلیز دابووی بە (عصبةالأمم ) و دانی بەوەدا نابوو کە ئاژاوە لە ناوچەکانی سلێمانیدا زۆر بووە و کوردەکان بە هیچ ڕێکخراوێك ڕازی نین و هەمیشە خەریکی ئاژاوەن[٨].

ئەدمۆندزیش لایخۆیەوە دان بەو ڕاستیەدا دەنێت ، کە بەهۆی خەرجی زۆری سوپاوە، سەرکردایەتی هێزەکانی بەریتانیا حەزیان نە دەکرد سوپا لە شوێنە دوورەکان بەکاربهێنرێت[٩].

هەر بۆیە کاتێ ئینگلیزەکان سلێمانیان چۆڵ کرد بە نیازی ئەوە بوون شێخ مەحمود بگێڕنەوە و بە هۆی ئەوەوە تورکەکان لە ڕەواندوز دەرپەڕێنن ، لەم پێناوەشدا لە هەنگاوی یەکەمدا (شێخ مەحمود )یان هێنایەوە کوێت[١٠].

لەو سەرو بەندەشدا بارو دۆخی سلێمانی ، هێشتا لێوان لێو بوو لە هەستی سەربەخۆیی و جودا خوازی ، تەنانەت کاتێك پروپاگەندەی ئەوە هەبوو کە لە بەغداوە دەستەیەك دێت بە ناوی (هەیئەی ناصحە )ەوە ، تاوەکو لەگەڵ خەڵکیدا قسە بکات . بانگی کوردستان لە ژمارە (٢) ی دا ڕاشکاوانە بەرپەرچی ئەم هاتنەی داوەتەوە و دەڵێت " نازانین ئەمانە کە دێن نەسیحەتی چیمان دەکەن ،ئەگەر مەقسەدیان ، ئەوە بێ نەسیحەتمان بکەن تابع بە عێراق بین ، وەختی خۆی لام باش نیە ، بێزراوە و فیکری کوردایەتی هەتا بێت ڕەگ دادەکوتێ "[١١] .

---

[٧] د.عبد الستارطاهر شریف : هەمان سەرچاوە،ل٩٠.

[٨] ڕەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان،ب٢ ، ل٢٦٣.

[٩] کردو ترك و عەرەب ، ل١١٤.

[١٠] محمد احسان : کردستان ودوامة الحرب ، ط٢ ، اربیل ، ٢٠٠١، ل٢٧ .

[١١] ژمارە (٢) ،١٩٢٢/٨/١٤.

بۆیە ئینگلیز قەناعەتی تەواوی لادروست بوو ، کە جگە لە شێخ مەحمود کەسێکی دیکە ناتوانێ ئەم بارە شڵەژاوەی سلێمانیان بۆ ئاسایی بکاتەوە ،و جڵەوی کارو باری سلێمانی بگرێتەوە دەست [12] ،هەر چەندە زۆر چاکیش شێخ مەحمودیان دەناسی و دەیان زانی بە ویستی ئەوان هەڵناسوڕێ [13] ، بەڵام ، لە دوا ئاکامدا ، بەفەرمانی نوێنەری باڵای بەریتانیا لەعێراق ، ( مێجەر گۆڵد سمیث ) بڕیاریدا کەوا سەرجەم کاربەدەست ومەئمورانی خۆیان لە سلێمانی بگوازنەوە و شارەکە چۆڵ بکەن ، بۆئەم مەبەستەش لەڕێکەوتی ٥یئەیلولی١٩٢٢، گۆڵدسمث ، شێخ قادری حەفید و ژمارەیەك لەپیاو ماقوڵانی سلێمانی بانگهێشت کرد بۆ دەشتی (وەیس ) لەوێدا پێیانی ڕاگەیاند کە فەرمانیان پێداروە . سلێمانی چۆڵ بکەن و بیدەنە دەست خۆیان ، ڕۆژی پێشتریش شەش فڕۆکە هاتبوونە سلێمانی بەمەبەستی گواستنەوەی بارو بارگەی ئینگلیز . گۆڵد سمث، ئەوەشی پێ ووتون ، کە سەرجەم سەربازو چەك وجبە خانەو ئازوخە و پارەی سلێمانی بۆ ئەوان جێدەهێڵن و داواشی لێکردن کە خۆیان بڕیار بدەن کلیلی گەنجینەکە بدەنە دەست کێ [14] .

هەر ئەوکاتە ئامادە بوان لە نێو خۆیاندا بڕیاریان دا ( شێخ قادری حەفید ) هەڵبژێرن و ئەرکی بەڕێوە بردنی شارەکەی پێ بسپێرن ، بەڵام لە هەمان کاتدا داوای ئەوەشیان کرد، کە شێخ مەحمود بگێڕدرێتەوە بۆ سلێمانی وەك حوکمدار [15] .

بەم شێوەیە سلێمانی بێ حکومەت مایەوە وهیچ دام و دەزگایەکی کارگێڕی لە شارەکەدا نەما. هەر بۆیە ، (مەجلیسی میللی سلێمانی)بە سەرۆکایەتی شێخ قادر دامەزرا ، بەمەبەستی پاراستنی ئاسایش و ئارامی

---

[12] کریس کۆچێرا : کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، و: محمد ریانی، چ٢ ، تهران ، ١٣٦٩، ل١١٦ .

[13] ئەدمۆنز : هەمان سەرچاوە ، ل١١٤

[14] بانگ کوردستان : ژمارە (٦) ، ١٩٢٢/٩/١٨ .

[15] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید ، ل٨٣ .

ژیانی خەڵکی.[١٦] دوای ڕۆیشتنی ئینگلیزەکان، سلێمانی زیاتر ئاڵۆزی تێکەوت، ئەویش لە ئەنجامی زیاد بوون و پەرەسەندنی پڕوپاگەندەی تورکخواکان بوو، تەنانەت لە کاتێکدا ئەنجومەن سەرقاڵی تاوتوێ کردنی مەسەلەکان بوو، پەیتا پەیتا کۆبوونەوە دەکرا لەم بارەیەوە، ئاخۆ، چی بکرێت و چییان دەوێت، بۆ ئەمەش سێ پرسیار ئاڕاستەی ئەندامانی(مەجلیسی میللی) و پیاوماقوڵان کراو داوایان لێکرا بیروڕایان دەربڕن کەبریتی بوو لە:-

١-پێکهێنانی حکومەت بۆ کوردستان ؟

٢-پێشوازی کردن لە تورکەکان ؟

٣-هەرکەسێك ئارەزووی حوکم و ددەسەڵاتی ئینگلیز دەکات، بەڕاشکاوانە ڕای‌خۆی بڵێت.

بەڵام هیچ یەکێك لە ئامادە بوان بە ئاشکرا بیرو ڕای خۆی دەرنەبڕی، مستەفا پاشای یامولکی داوای ئەوەی کرد کە دەفتەرێك بهێنرێت و هەرکەسە بیرو ڕای خۆی بنوسێت و ئیمزای بکات، تاوەکو بزانرێت گەورەپیاوان و ڕوناکبیرانی شارەکە چیان دەوێت و بیرو ڕای سیاسیان لەگەڵ چیدایە. بەڵام ئەمجارەش کەس ئامادە نەبوو ناوی خۆی لە دەفتەرەکەدا بنوسێ. (ڕەزابەگ) کە حاکمی قەزابوو، بە لایەنگیری تورك لە قەڵەم درا، وتی: کێ‌خۆی بەلایەنگری ئینگلیز دەزانێ بادەست هەڵبڕێ، بەڵام کەس دەستی هەڵنەبڕی، جارێکی دیکە پرسیاری کرد کێ کوردی دەوێت؟ ئەمجارەش لە چەند کەسێك بترازێت، کەسی دیکە دەستی هەڵنەبڕی، دواتر هەموو بەجارێك ئەم دەستەواژەیەیان دەگوت: "لەگەڵ خەلافەت و ئیسلامیەت مەعلومە هەربژی کوردستان و حکومەتی کوردستان"[١٧].

بێگومان ئەم هەڵوێستەی دواییان پەیوەست بوو بەو پڕو پاگەندە گەورەیەی دەکراو دەوترا، گوایە هەشت هەزار سەربازی تورك بەڕێوەن بۆ

---

[١٦] یاداشت ب٢، ل٨٩.

[١٧] بانگ کردستان: ژمارە (٦) ١٩٢٢/٩/١٨.

سلێمانی، هەر لە سەرەتای ڕۆیشتنی ئینگلیزەوە (کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند)یش خۆی و پیاوەکانی خۆیان کرد بە ناو سلێمانیداو ڕۆڵێکی بەرچاویان بینی لە تورکچێتی و پڕوپاگەندە کردندا . تەنانەت کەریم بەگ و پیاوەکانی (مستەفا پاشای یامولکی) یان دەستگیر کرد و بردیان بۆ بەندیخانە . بەڵام (شێخ قادری حەفید) ی سەرۆکی ئەنجومەن ئەم کارەی بەپەسەند نەزانی و لەگەڵ گەورە پیاوانی دیکەو ڕوناکبیراندا کەوتنە بەینەوە و ئێوارەی هەمان ڕۆژ مستەفاپاشا ئازاد کرا [18] . هەرچەندە بەم شێوەیە بارودۆخەکە کەمێك ئاساییبووەوە ، بەڵام تورکخواکان تەواو خۆیان بردبووە پێشەوە و ڕێگایان نەدەدا لاوە نیشتمانپەروەرەکان و ڕووناکبیران ڕۆڵی خۆیان ببینن ، جگە لەوەی شێخ قادریش خۆی چارەی خوێندەوارەکانی نەدەویست ، لەگەڵ مستەفا پاشا سەرقاڵی ئەوە بوون ، کە تاکۆتایی ئەم مەسەلەیە هەر لەسەر بەرنامەو پڕۆگرامی ئینگلیز سەربگرێت ، هەربۆیە کەوتبونە دوورخستنەوەی ئەوانەی لەگەڵ بیرو بۆچوونیاندا نەدەگونجان [19] .

هەر لەو ڕۆژانەدا (مەجلیسی میللی )بڕیاری لەسەر ئەوە دابوو کە (شێخ مەحمودی بەرزنجی)بکرێتەوە بە حوکمدار و لە ڕێکەوتی ١٥ی ئەیلولی ١٩٢٢ دا ئاڵای یەکەم حوکمداریەتیەکەیان هەڵکردەوەو کەوتنە ڕێکخستنی وەفدێك بۆ بە پیرەوەچوونی شێخ مەحمود کە دەبووایە بگەڕایەتەوە سلێمانی [20] .

وێڕای هەموو کەم و کورتیەك ئەو مەجلیسە توانی پارێزگاری ئارامی و ئاسایشی سلێمانی بکات ، لەو بارودۆخە دژوارەدا نەهێڵێت هیچ کارێکی دزێو ڕووبدات [21] .

---

[18] بانگ کردستان : ژمارە (٦) ؛ رەفیق حلمی: هەمان سەرچاوە، ب٢، ل٢٨ .

[19] رەفیق حلمی: هەمان سەرچاوە ، ب٣ ، ل٢٨ .

[20] بانگ کردستان : ژمارە (٧) ١٩٢٢/٧/٢٢ .

[21] رەفیق حلمی: هەمان سەرچاوە ، ب٢ ، ل٩٧ .

## ١-هاتنەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی

شێخ مەحمود بە بڕیاری بەریتانیا لە (کوێت) ەوە بەرەو بەغدا هێنراو ڕۆژی ١٣ ی ئەیلولی ١٩٢٢ گەیشتە بەغدا [٢٢]. لە سلێمانیشدا خەڵکی کەم و زۆر ئاگاداری هەواڵی شێخ مەحمودو هاتنەوەی بوون. (بانگی کوردستان) یش، لای خۆیەوە هەواڵی هاتنەوەی شێخ مەحمودی بڵاو کردبۆوە و لە زاری (گۆڵد سمیث) یشەوە، ڕایگەیاندبوو کە بەم نزیکانە ڕێگا بە کورد دەدرێت حکومەتێك پێکەوە بنێت بۆ خۆی [٢٣].

شێخ مەحمود لە نێوان ١٣ ی ئەیلول تا ٢٠ ی ئەیلولی ١٩٢٢دا لە بەغدا مایەوەو لەم ماوەیەشدا چەند جارێك چاوی کەوت بە هەریەك لە (فەیسەڵ) و (کۆکس) و بەدورو درێژی لەگەڵیان دوا سەبارەت بە هاتنەوەی و چۆنێتی بەڕێوەبردنی دام و دەزگاکانی حوکمڕانی لە سلێمانی. بێگومان ئینگلیزەکان لەم بارەیەوە ، مەبەستی یەکەمیان لە هێنانەوەی شێخ مەحمود ئەوە بوو، وەك داردەستی خۆیان هەڵی سوڕێنن و بیکەن بەگژ تورکداو لە ڕەواندوز دەریان بکات [٢٤]. شێخ مەحمودیش خۆی زۆر باش لە مەبەستیان گەیشتبوو ، تەنانەت خۆی لە بەغدا بەر لە گەڕانەوەی بە (حەمە ئەمین عەتاری) ژنبرای وتبوو "دەزانی چیان لە من دەوێ؟ دەیانەوێ کارو فرمانێکی پۆلیسیم پێ بسپێرن کە گەڕامەوە بۆ سلێمانی خەڵك لە خۆم کۆبکەمەوەو بچم تورکەکانیان لە ڕەواندز بۆ دەربکەم ، منیش بیرم کردەوەو ترسام ئەگەر لەکاتی گفتو گۆدا بم وتایە شتی واناکەم دوورنەبوو ڕێگەی چوونەوەی سلێمانیم لێبگرن ، بۆیە چارەم نەبوو بەڵێنی ئەوەم دانێ تورکەکان دەربکەم ، بەلام تۆ خۆت دەمناسیت چۆن بە ئیشی پۆلیسی وا هەڵدەستم [٢٥] " .

---

[٢٢] ای . ام هاملتون : طريق في كردستان ، و: جرجيس فتح الله ، ط٢ ، اربيل ، ١٩٩٩، ل١٥٥؛ رسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل٢٧٠ .

[٢٣] ژمارە (٥) ، ٤ / ٩ / ١٩٢٢ .

[٢٤] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان، ب٢، ل٢٨٢، ئەدمۆندز: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٤.

[٢٥] ڕەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ب٢، ل٢٨٢-٢٨٣ .

ئاشكراشە شێخ مەحمود زۆری لامەبەست بوو بە هەر شێوەیەك بێت بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، تەنانەت لە سەرەتادا بەنازناوی (سەرۆكی مەجلیسی میللی) ڕازی بوو بوو ، بەڵام دواتر بڕیارەكە گۆڕاو شێخ مەحمود كرایەوە بە حوكمداری كوردستان [٢٦].

ئەدمۆندز ، پێی وایە ، شێخ مەحمود لە بەغدا ڕاستگۆ بووە ، بەڵام كاتێك گەیشتۆتە، وێستگەی شەمەندەفەری (كنگر بان) و ئەو پێشوازیە گەرمەی بینیوەو هەوای كوردستانی هەڵمژیوە سەرمەست بوەو بەڵێن و پەیمانەكانی لە یاد كردووە [٢٧].

بەرلەوەی شێخ مەحمود بگاتەوە سلێمانی لەسەر بڕیاری حكومەتی عێراق ژمارەیەك لە ئەفسەرە كوردەكان گەڕابوونەوە سلێمانی تاوەكو هاوكاری شێخ مەحمود بكەن ، وەك (تۆفیق وەهبی، عەزیز قەزاز، ئەمین ڕەواندوزی، عەزیز كوردی، فائق كاكە مین) ، كە ئەمانە لە ٢٥ی ئەیلولی ١٩٢٢ دا گەڕانەوە سلێمانی و جۆش و خرۆشێكی زۆریان خستە ناو خەڵكەكەوە،ئەوەش بە هاندان و وروژاندنی هەستی نەتەوەییان ،بەتایبەت لە ناو لاوان و خوێندكارانی سلێمانی [٢٨].

شێخ مەحمود لە ڕێكەوتی ٢٠ی ئەیلول دا لە بەغداوە بە یاوەری مێجەر نۆئیل بەرەو سلێمانی كەوتە ڕێ و لە (كنگر بان)ەوە بەسواری بەڕێگای كفریدا بە نێو عەشیرەتەكانی گەرمیاندا گەڕایەوەو ماوەیەكیش لە ڕێگا لای دەدا ، لەنێو هۆزەكاندا دەمایەوە . تا لەڕێكەوتی ٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٢ دا گەیشتەوە نێو شاری سلێمانی و سەرجەم چین و توێژەكانی خەڵكی شار لەم ڕۆژەدا بە جوانترین و ڕازاوەترین شێوە لە پێشوازی شێخ مەحمودا وەستا

---

[٢٦] ڕەفیق حیلمی : یاداشت: ب٣، ل٢٩: لازاریف : المسالة الكردیة ، ل٢٢١ .

[٢٧] كرد و ترك و عرب، ل٢٧٢ .

[٢٨] بانگ كردستان: ژمارە (٤) ، ١٩٢٢/٨/٢٩ ، ڕەفیق حیلمی : یاداشت:ب٣ ، ل٣٠ .

بوون[٢٩]. ئەو ڕۆژە جگە لە خەڵکی سلێمانی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی دێهات و لادێکانی دەوروبەری شاریش، بۆ پێشوازی شێخ مەحمود هاتبوون[٣٠].

تەنانەت لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتیشەوە وەفد گەیشتبوونە سلێمانی بۆ بەخێر هاتنەوەی شێخ مەحمود[٣١].

مێجەر نۆئیل ئەمجارەش وەك یاوەرو تاکە ڕاوێژکاری ئینگلیز لەگەڵ شێخ مەحموددا هاتبۆوە سلێمانی، لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنیدا، تا ئێوارە هاوشانی شێخ مەحمود لە پێشوازی خەڵکدا وەستا بوو، پاشانیش خانوویەکی تایبەتی بۆ ڕێکخراو لەوێدا نیشتەجێکرا. ڕوناکبیران و نیشتمانپەروەرانی سلێمانی ئەمجارەیان وەك باڵیۆزێکی بێگانە لە (نۆئێل) یان ڕوانیوە و پێیان وابووە هیچ پەیوەندیەکی بە هەڵسوڕاندنی کارو باری حوکمداریەتی شێخ مەحمودەوە نیە[٣٢].

کەلێرەدا پێمان وایە ئەم بۆچوونەی خەڵکی سلێمانی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە ئینگلیزەکان خۆیان شێخ مەحمودیان گێڕابۆوەو بە ویستی خۆشیان سلێمانی‌یان جێهێشت هەرچەندە فشارێکی زۆریشیان لەسەر بوو، بەڵام ئەو قسانەی (گۆڵد سمیث)بە پیاوماقوڵانی سلێمانی ڕاگەیاند دان پیانانێکی ئاشکرای ئینگلیز بوو بە مافەکانی کورد، بۆیە لە سلێمانی‌دا بە چاوێکی دیکە لە (نۆئیل)یان دەڕوانی.

شێخ مەحمود دوای گەڕانەوەی ماوەیەك لە ماڵەوە پشووی داو هیچ ئەرك و فەرمانێکی بەرچاوی ڕانەپەڕاند، تا ڕۆژی ١٩٢٢/١٠/٨ بە ڕەسمی کاروباری گرتەوە دەست و سەرقاڵی چاوپێکەوتن و بینینی ئەوانە بوو کەهاتبوونە سەردانی و ڕۆژی دواتر بەتەواوی کاروباری حوکمداریێتی بەڕێوە

---

[٢٩] ڕەفیق حیلمی: یاداشت: ب٢، ل٩٥: بانگ کردستان: ژمارە(٩) ، ١٩٢٢/١٠/٨ .

[٣٠] ڕەفیق حیلمی: یاداشت: ب٢،ل٩١-٩٢ .

[٣١] یاداشتەکانی شێخ لەتیف ، ل٨٨-٨٩ .

[٣٢] بانگ کردستان : ژمارە (٩) ، ٨/ ١٠/ ١٩٢٢ .

برد . بەلاّم تا ئەوساتە بەنازناوی (حضرت حکمدار) خۆی ناساندبوو[٣٣]. دوای ئـەوەش لەڕێکـەوتی ١٠ی تشـرینی یەکـەمی ١٩٢٢ دا بـەپێی فـەرمانێکی حوکمـداری ، پێکـەوەنانی کابینـەی حکومـەتی کوردسـتانی ڕاگـەیاند و ئـەم ناوانـەی لای خـوارەوە هـەڵبژێردران بـۆ ئـەندامێتی کابینـەی حکومـەتی کوردستان :-

١-شێخ قادری حەفید - سوپا سالار
٢-شێخ محەمەد غەریب - ڕەئیسی داخلیە
٣-عەبدولکەریم عەلەکە -ڕەئیسی مالیە
٤- میر لیوا مستەفا پاشا - ڕەئیسی مەعاریف
٥-ئەحمەد فەتاح بەگ - ڕەئیسی گومرك
٦-حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا - ڕەئیسی نافعە
٧-سەید ئەحمەدی بەرزنجی - ڕەئیسی ئەمنیەتی عمومی
٨-ڕەئیسی شەرع و عەدل - ..................[٣٤]

لێرەدا وەك تێبینـی دەکـەین شـوێنی وەزیـری داد بـەچۆڵی جێـهێڵراوە، بەلاّم دواتـر شـێخ عـەلی قـەرەداغی بۆ ئـەو پۆسـتە دەستنیشـان کـرا[٣٥]. شـێخ مەحمود، پاش ئەوەی هاتەوە سلێمانی و شوێنی خۆی قایم کـرد ، لـەکۆتایی مـانگی تشـرینی یەکـەمی ١٩٢٢ دا نازنـاوی مـەلیکی کوردسـتانی بۆخـۆی هەڵبژارد و ئەم نازناوەش لە ژمارە (١٣) ی بانگی کوردستاندا بە ڕەسمی بلاّو کرایـەوە ، دوا بـەدوای ئـەم هـەنگاوەش لـە نێـو سـلێمانیدا سـوپاکەی شـێخ مـەحمود کـە بـە (عەسـکەری کوردسـتان) ناسـرا بـوو نومایشـێکی سـوپایی گـەورەی ڕێکخسـت و دەسـتە دەسـتە چـەکدارەکان بەبـەردەم شـێخ مـەحموددا تێپـەڕ دەبوون ، کەئەم مەسەلەیەش خۆی لـە خۆیـدا مایـەی نیگـەرانی ئینگلیز

[٣٣] بانگ کردستان : ژمارە (١٠) ، ١٥/ ١٠/ ١٩٢٢ .
[٣٤] سەرچاوەی پێشوو .
[٣٥] بانگ کردستان : ژمارە (١٣) ، ٣/ ١١/ ١٩٢٢ .

بوو زۆریش سەغلەتی کردن [٣٦]، چونکە پێیان وابوو شێخ مەحمود بەیارمەتی و هاوکاری تورکەکانی ڕەواندوز ئەم هەنگاوانە هەڵدەنێت چونکە شێخ مەحمود هەر لە ڕێگای گەڕانەوەیدا هێڵی پەیوەندی لەگەڵ تورکدا بەستەوەو ئۆزدە میریش لەگەڵ گەیشتنەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی ، نامەی بۆ ڕەوانە کرد وەك دەربڕینی نیاز پاکی لە چەند شوێنێك پاشەکشەی کرد [٣٧].

ئینگلیزەکانیش لە بەرامبەر ئەم کارانەی شێخ مەحمود ، بە هاندانی ( سۆن ) لە بەغدا لە ڕێگای ڕۆژنامەکانی ئەوێوە کەوتنە گاڵتە کردن بە شێخ مەحمودو حکومەتەکەی [٣٨].

لە بەرامبەیشدا ، ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان)* کە زمانحاڵی دووهەمین حکومەتی شێخ مەحمود بوو لە ژمارە (یەك)ی دا ، وەڵامی ئەو وتارەی دایەوە کە لە ڕۆژنامەی (العراق) دا بڵاوکرا بووە وە و سلێمانی بە لیوایەکی عێراق لە قەڵەم دابوو، وەڵامەکەش لە ناوەڕۆکەکەیدا ئاستێکی بەرزی بیری کوردانەی ڕوناکبیرانی سلێمانی دەردەخست **.

شێخ مەحمود وێڕای بەڵێنەکانی ، نەیدەتوانی بیرۆکەی سەربەخۆیی و ڕزگاربوون لە مێشکی خۆی دەربکات ، هێندەی پێنەچوو کەوتە هەوڵدان بۆ

---

[٣٦] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب١ ، ل١٢٨ .

[٣٧] بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو سمکۆ ، ل٥٣ .

[٣٨] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب١ ، ل١٣٠-١٣١ ؛ ڕەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان، ب٢ ، ل٣٣٢ .

* ڕۆژی کوردستان، ڕۆژنامەیەکی هەفتانەبوو هەریەك لە(م.نوری)و(عەلی کەمال)دەریان دەکرد، یەکەم ژمارەی لە ١٩٢٢/١١/١٥ بڵاو بۆوە، ژمارە(١٥)کە دوا ژمارەی بوو لە ١٩٢٣/٣/٣دا بڵاوبۆوە.(فاروق علی عمر: هەمان سەرچاوە،ل٧٩)

** عارف صائیب لە وەڵامدا دەڵێت:"تاریخی عالەم و جوغرافیای تەبیعی شاهیدێکی عادیلە کە میللەتی کورد لەرووی زەمیندا هەوو وەختێ نام و ناونیشانی بووەو هەمیشە ماددەتەن ئسپاتی مەوجودیەتی خۆی کردووە.هیچ وەختێ لە مەعاریف ، صەنایع ، تیجارەت...هتد. لە ئەمسالی خۆی زیاتر نەبووبێ کەمتر نەبووە.( ڕۆژی کوردستان: ژمارە (١) ، ١٥ / ١١ / ١٩٢٢)

فراوان کردنی قەڵەم ڕەوی دەسەڵاتەکەی ، کە سەرجەم نێوچە کوردیەکانی ویلایەتی موسڵی دەگرتەوە تا (جبل حمرین) [39]. لەوڕوانگەیەوە شێخ مەحمود بە قەتیس کردنی دەسەڵاتەکەی لە چوارچێوەی سلێمانیدا ڕازی نەدەبوو ، لە قەزاکانی (ڕانیە ، هەڵەبجە ، چەمچەماڵ) ئاڵای حکومەتەکەی هەڵکردو موچە خۆری خۆی ڕەوان کرد بۆ ئەو شوێنانە [40].

لەم سەرو بەندەدا چەندجارێك نۆئیل لە نێوان سلێمانی و کەرکوك و بەغدادا هات و چۆی کرد بەنیازی ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی شێخ مەحمودو ئینگلیز ، بەڵام هیچی وای بۆ نەکرا ، بۆیە لە ئاکامدا بە بەیەکجاری گەڕایەوە بەغداو (چاپمەن) ی لەشوێنی خۆی دانا*[41]. ئینگلیزەکانیش ئەو ڕۆژگارە بارودۆخیان لە ڕوی سیاسیەوە بەرەو باشتر دەچوو نەیاندەویست بەهیچ شێوەیەك دان بە حکومەتەکەی شێخ مەحموددا بنێن ، بەتایبەتی کاتێك توانیان لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ دا پەیمانی ١٩٢٢ بەسەر عێراقدا بسەپێنن. لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ تورکەکان گەیشتنە ئەوەی کە (کەمال ئەتاتورك) ، ڕەزامەندی ئەوەی نیشان دا ، کێشەی ویلایەتی موسڵ بخرێتە بەردەست (کۆمەڵەی گەلان) ، بەمەش ، حکومەتی ئینگلیز دڵنیا بوو، لەوەی کەدەتوانێ بەرژەوەندیەکانی لە کوردستانی باشوردا بپارێزێ و شوێنی خۆی باشتر قایم بکات [42]. هەر ئەم هۆکارانەش وایکردبوو هێندە بەتەنگ داواکاریەکانی کوردەوە نەبن ، گەر هەنگاوێکیشیان لەم بوارەدا نابێت ئەوا

[39] بانگ کردستان : ژمارە (١٣) ، ٣ / ١١ / ١٩٢٢ .

[40] ڕەفیق سالح: سێ ڕۆژنامەی ڕۆژگاری شێخی نەمر، سلێمانی،٢٠٠١، ل٢٦.

* ئەدمۆندز دەڵێت:"نۆئیل لە سەرەتاوە هیچ هیوایەکی بە شێخ مەحمود نەبووە، و پێی وابوو بڕیاری دووبارە هێنانەوەی پیاوێکی وەکو شێخ مەحمود هیچ مانایەکی نیە، چونکە ئەزموونەکانی رابردوو باشترین بەڵگەن بۆ ئەوەی کە ئەستەمە شێخ مەحمود کۆنترۆڵ بکرێت.(کرد و ترک و عرب، ل١١٥).

[41] ڕەفیق حیلمی : یاداشت ، ب٢ ، ل٤٠ .

[42] حامد محمود عیسی : هەمان سەرچاوە ، ل١٤٠ .

زیاتر بۆ چاوبەستەکێ و بردنەوەی (ویلایەتی موسڵ) بوو بۆ خۆیان. بەتایبەتی کاتێك بەوەیان زانی کە شێخ مەحمود تادێت پەیوەندی لەگەڵ تورکەکاندا بەهێز دەبێت و هام و شۆی یەکتری دەکەن [٤٣]. ئینگلیزەکانیش ناهەقیان نەبوو چونکە ئۆزدەمیر پەیتا پەیتا (فەتاحی ئەمین عەتارو ڕەمزی تۆپاڵ) ی ڕەوانەی سلێمانی دەکرد وەك وەفدی تورك و پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاو دەکردەوە، کەلەئاکامدا ویلایەتی موصڵ هەربۆ تورکیا دەبێت [٤٤].

ئەمە جگەلەوەی کە ، شێخ مەحمود دەورانی دووهەمین حکومەتیدا چواردەوری بەپیاوانی ئۆزدەمیرو تورکخوا تەنرا بوو ، تەنانەت (تایەری ئەمین مەسرەف) کەسەر کاتبی ملوکانە بوو، زۆر لە نوئێل زیاتر دەستی دەڕۆیشت لە سلێمانیداو کاروباری هەڵدەسوڕاند [٤٥]. لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین ، کەبەشێکی زۆری ئەو لایەنگریەی تورك بۆ ئەو پشت گوێ خستنەی داواکاریەکانی کورد دەگەڕێتەوە لە لایەن بەریتانیاوە وێڕای مەسەلەی سۆزە ئاینیەکە ، کە فاکتەرێکی دیکەی ئەم حاڵەتە بوو ، وای کردبوو کەکورد هیچ باوەڕێکیان بە ئینگلیز نەمێنێ، ژمارەیەکی کەم نەبێت وەك مستەفا پاشای یامولکی و منەوەرەکان . ئەمانەش بەئاشکرا لە نێو سلێمانیدا دژایەتی دەکران و دوورخرابوونەوە ، تەنانەت ئەو ئەفسەرانەش کە لە بەغدا گەڕابوونەوە ڕێگایان پێنەدرا لە دام و دەزگاکانی حکومەتدا وەك پێویست ڕۆڵی خۆیان ببینن ، ئەم ساردیەش زیاتر، تورکخواکان هێنابوویانە کایەوە [٤٦]. تەنانەت ئەوکاتە کەوا پێویستی دەکرد (جەمعیەتی کوردستان) ڕۆڵی خۆی ببینێت ، بەڵام هیچ جم و جۆڵێکی وەهای نەبوو ، مایەی دڵخۆشی بێت، ئەوڕۆژانەش تا دەهات ئینگلیز زیاتر لە شێخ مەحمود خانە گومان دەبوون، ئەم مەسەلەیەش تەنها پەیوەست نەبوو بە پەیوەندی لەگەڵ تورکدا ، بەڵکو

---

[٤٣] ا٠م منتشاشفيلي : العراق في سنوات ، ل٣٢١ .

[٤٤] ڕەفیق حیلمی : یاداشت ، ب٢، ل٨٤ .

[٤٥] سەرچاوەی پێشوو ، ل٣١ .

[٤٦] سەرچاوەی پێشوو ، ل٩١-٩٢-٩٥ ،

هەندێك دیاردەو كارو كردەوەی دیكەیان لەسلێمانیدا دەبینی كەنەدەكرا پشت گوێی بخەن ، چونكە ئەوان چاوەڕوانی ئەوە بوون شێخ مەحمود پەندی لەدەردو ئازارەكانی دەربەدەری چەند ساڵە وەرگرتبێت .[٤٧] بەڵام شێخ مەحمود لەگەڵ گەڕانەوەیدا وێڕای جاڕدانی حكومەت و بەكارهێنانی نازناوی (مەلیك)، كەوتە برەودان بە بواری خوێندن و خوێندەواریش ، مستەفا پاشای كردە ڕەئیسی مەعاریف، ناوبراویش هێندەی لە توانایدا بوو ، پەرەی بەڕەوتی خوێندن و خوێندەواری دا ، خوێندنگاكانی سلێمانی فراوان كرد ، ئەو سەردەمە چوار خوێندنگا لە سلێمانی كرا بوونەوە ، كەبریتی بوون لە (ئەعدادیەی مەحمودی و لەگەڵ ڕوشدیەی قادری و لەتیفیەی سەرەتایی) [٤٨]، جگە لەم سیانەش سەرەتاییەكی دیكە كرابووەوە بە نێوی (ڕەئوفیە) [٤٩]. بێگومان ئەم چوار خوێندنگایەو مامۆستاكانی ڕۆڵێكی بەرچاویان هەبوو لە هاندانی لاوان و برەو پێدانی گیانی نیشتمان پەروەری، بەتایبەتی كاتێك ئەفسەرە كوردەكان لەو خوێندنگایەدا دەرسیان ئەوتەوەو خوێندكارانیان فێری (مەشقی سەربازی) دەكرد ، تەنانەت خوێندنگای (ئەعدادی مەحمودی) یان وەك ئامادەییەكی سەربازی لێكردبوو ، حەزیان دەكرد بە سیستەمێكی نیوە سەربازی بەڕێوە بچێت ، هەرئەمەش وایكردبوو خەڵكی سلێمانی لەگەڵ بینینی ئەم خوێنكارانەدا حەماسەت بیانگرێت ، كە ئەو ڕۆژانە ژمارەیان (٨٠٠) خوێندكار دەبوو لە كاتی چوونیان بۆ مەشق خەڵكی ناوبازاڕ بە گەورەو بچوكەوە شوێن ئەم خوێندكارانە دەكەوتن و چەپڵەیان بۆ لێدەدان ، چونكە سلێمانی ئەو ڕۆژگارە هێشتا بچوك بوو ، ئەم مەسەلەیەش بزوتنەوەیەكی گەورە بوو لە شارەكەدا تا ئەو ڕۆژە سلێمانی بزوتنەوەی وەهای بەخۆوە نەدیبوو [٥٠].

---

[٤٧] د. كەمال مەزهەر : چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی كورد ، ب١ ، ل١٥٦ .

[٤٨] بانگ كردستان : ژمارە (٣)، ٣٠/ ١١ / ١٩٢٢ .

[٤٩] بانگ كردستان : ژمارە (١٣) ، ٣ / ١١ / ١٩٢٢ .

[٥٠] ڕەفیق حیلمی : یاداشت ، ب٢، ل٩-١٠ .

بێگومان ئەم پەروەردەکردنە کاریگەریەکی گەورەی بۆ سەر خودی خوێندکارەکانیش هەبوو کەبەشداری خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەربڕین بکەن دژ بە سیاسەتەکانی بەریتانیا. ماموستا ئیبراهیم ئەحمەد لەم بارەیەوە بیرەوەریەکانی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت : "لەبەر ئەوەی لەشاری سلێمانیدا بووین ، کەلە شۆڕشەکانی شێخ مەحمووددا بزوتنەوەیەکی گەرم و گوڕی تێکەوتبوو، هەستێکی کوردایەتی بەرز هەبوو ، بۆ نمونە ئێمە مندالْ بووین ، لە دیواری مەکتەبەوە سەیرمان دەکرد قوتابی مەکتەبی مەحمودیە گۆرانییان دەووت : وانابێ ئینگلیز وانابێ ئەم خاکە هەر بۆ تۆ نابێ، یان دەیان ووت : بەیداخی کوردستان دیسان لەریەوە هەستە بابڕۆین بچینە پێشەوە "[٥١] .

ئەم دیاردەیەو دەیانی دیکە ئینگلیزی وەها لێکردبوو هەردوای تێپەڕ بوونی مانگێك بەسەر هاتنەوەی شێخ مەحموددا ، هیچ باوەڕێکیان پێی نەمابوو [٥٢] ، لە هەلێك دەگەڕان بۆ ڕوخاندنی دەسەلاتەکەی و بن کۆلْ کردنی و دەیانویست بەشێوەیەکی یەکلایی کەرەوە کار بکەن بۆ لکاندنی کوردستان بە عێراقەوە. لەم حالەتەشدا دەبوایە حکومەتەکەی شێخ مەحمود نەمێنێ. هەر ئەم بۆچونەش بوو وای لە نوێنەری بالای ئینگلیز (پیرسی کوکس) کرد کەداوا لە فەیسەلْ بکات بۆ دۆزینەوەی شێوازێکی ئیداری چاك و گونجاو کە لە سلێمانیدا جێ بە جێ بکرێت و ئەوەی تێدا ڕەچاو بکرێت کەپێویستە ئەم نێوچەیە بەیەکجارەکی بخرێتە نێو سنوری عێراقەوە،لە ڕووی ئابووری و سیاسیەوە پەیوەست بکرێت لەگەلیدا [٥٣]. هەرچەندە ئینگلیزەکان لای خۆیانەوە تا ماوەیەك هەولیان دەدا بۆ ڕزگار کردنی بارو دۆخەکە، لەم بوارەشدا پیلان و چاو بەستەکێی زۆریان بەکاردەهێنا، کە بەرچاو ترینیان بەیاننامە دوقۆلیەکەی خۆیان و حکومەتی عێراقە، کە (کۆکس) لە

---

[٥١] چەند وێستگەیەکی ژیانی ماموستا ئیبراهیم ئەحمەد لە زمانی خۆیەوە : گۆڤاری خاك، ژمارە (٤٦) ٢٠٠١، ل٣١.

[٥٢] ا.م فنشاشفیلی : العراق فی سنوات ، ل٣٢١ .

[٥٣] حامد محمود عیسی : هەمان سەرچاوە ، ل١٤٠-١٤١ .

بروسکەیەکیدا بۆ وەزیری موستەعمەرات بە ئاشکرا دان بەوەدا دەنێت کە هەستی نیشتمان پەروەری چۆن تەشەنەی سەندووەو کەس باوەڕی بە ئینگلیز نەماوە. بەتایبەتی ڕوناکبیران، بۆیە بە پێویستی دەزانێ کە ڕێگای پێبدەن ، بەیاننامەیەکی دوو قۆڵی دەربکات لەگەڵ (فەیسەڵ) دا و دان پێدانانی هەردوو حکومەت بە مافی کورد دا جارپدات ، بۆ ئەوەی هەڵوێستەکە لە سلێمانیدا بگۆڕن و وەها بکەن کە کۆمەڵێك خەڵك لە خۆیان کۆبکەنەوەو بە هەندێك مەسەلەی سەرزارەکی ڕازیان بکەن و بەلای ئینگلیزدا بابدەنەوە [٥٤] ، ئەوەبوو ئەم بەیاننامەیە لە ٢٢ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ دا بڵاوکرایەوەو دانیان بە مافی کورددا نا لەنێو چوارچێوەی عێراقدا لەوەدا کە حکومەتێك بۆخۆیان پێکەوە بنێن لە ناو چوارچێوەی ئەو سنورەدا ، هیواشیان خواست کورد لەنێو خۆیدا بەزوترین کات ، سەبارەت بەشێوەی ئەم حکومەتەو سنورەکەی ڕێك بکەون و نوێنەری دەسەڵاتداری خۆیان ڕەوانەی بەغدا بکەن بەمەبەستی گفتو گۆ کردن لەمەڕ پەیوەندی ئابووری و سیاسیان لەگەڵ حکومەتی بەریتانیاو عێراق [٥٥]. لەسەرەتادا خەڵکی سلێمانی ئەم هەواڵە کەمێك دڵخۆشی کردن و پێیان وابوو ، لەوانەیە ئینگلیز باوەڕی بەرامبەر بەمەسەلەی کورد گۆڕابێت، تەنانەت خودی شێخ مەحمودیش ، دڵخۆشی خۆی بەرامبەر ئەم هەواڵە بڵاو کردبۆوە لە ڕۆژی کوردستاندا و سوپاسێکی زۆری ئەو نەوازشەی بەریتانیای کردبوو دەرهەق بەکورد [٥٦].

بۆ ئەم مەبەستەش وەفدێك لەسلێمانیەوە ڕێکخراو ، بەرەو بەغدا ڕەوانە کرا بۆ بینینی (کۆکس) ، بەڵام نێوبراو ئامادە نەبوو بیان بینێت وبە وەفدەکەش ڕاگەیەندرا کە ئەو بەیانە ، تەنها بۆ شێخ مەحمود دەرنەچووە بۆ هەموو کورد دەرچووە ، ئێوە تەنها نوێنەری ئەون ، با نوێنەرانی هەموو کورد

---

[٥٤] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٣٢ .

[٥٥] السید عبدالرزاق الحسني: تاریخ الوزارات العراقیة ،ج١،ط٧،بغداد،١٩٨٨،ل٢٨٢ ؛محمد احسان:هەمان سەرچاوە، ل٢٨.

[٥٦] ڕەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل٤٧٥ ، ڕۆژی کوردستان : ژمارە (٧) ٣ / ١ / ١٩٢٣ .

کۆببنەوەو لەسەر دانانی وەفدێك ڕێکەون ، ئەوسا ئەو وەفدە بێت بۆ ئەوەی باسی ئەو بەیانە بکرێ[٥٧] . هەر ئەم هەڵوێستانەی ئینگلیزیش بوو ، کە زیاتر بارودۆخەکەی ئاڵۆز دەکرد ، بەتایبەتی دوای ئەوەی بە هاندانی ئینگلیزەکان، سمکۆی شکاك هاتە سلێمانی بۆ ئەوەی شێخ مەحمود والیبکات لە تورك دابڕێت ، بەڵام بەپێچەوانەوە هەڵس و کەوتی کرد. بەم شێوەیە کاتێك (چەپمەن) ئەم بارودۆخەی بینی لە سلێمانیدا ، زانی مانەوەی هیچ سودێکی نیە گەڕایەوە بۆ کەرکوك[٥٨] . هەر لەم کاتانەشدا بوو ، شێخ مەحمود نامەی بۆ (شێخ مهدی الخالصی) گەورەی شیعەکان ڕەوانە کردبوو بە مەبەستی هاو ئاهەنگی دژی ئینگلیز[٥٩] . جگە لەمەش نامەیەکی تری بۆ کۆنسوڵی سۆڤیەتی لە شاری (تەورێز) ڕەوانە کردوو، وێڕای پیاهەڵدانێکی زۆر داوای یارمەتی و کۆمەك و پشتگیری لە سۆڤیەتیش کرد[٦٠] .

هەرئەم ڕووداو پێشهاتانەش وای کرد کە (کۆکس) شێخ مەحمود بانگهێشت بکات بۆ بەغدا، بەمەبەستی وت و وێژکردن سەبارەت بەومەسەلانەی پەیوەندی‌یان بە سلێمانیەوە هەیە ، بەڵێنی ئەوەشی پێدابوو کە زۆر بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەڵام شێخ مەحمود ئەو داوەتنامەیەی ڕەتکردبۆوە ، لە بەرامبەریشدا ئینگلیزەکان ڕۆژانی ٢٤ و٢٥ی شوباتی ١٩٢٣ بەیاننامەی هەڕەشە ئامێزیان بەفڕۆکە بۆ خەڵکی سلێمانی فڕێدا[٦١] . ڕۆژی١ی مارتی ١٩٢٣ فڕۆکەکانی ئینگلیز شێخ مەحمودیان ئاگادار کرد کە دەبێ بەبێ دواکەوتن خۆی و هێزەکانی لە سلێمانی بچنەدەرەوە بەڵام کاتێك شێخ مەحمود ملی نەدا ، ڕۆژی ٣ی‌مارتی١٩٢٣، فڕۆکەکانی ئینگلیز

---

[٥٧] وەلیدی حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٣٣-١٣٥ .
[٥٨] ڕەفیق حیلمی : یاداشت ، ب٣ ، ل٤٥ .
[٥٩] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٣٥ .
[٦٠] د. عەزیز شەمزینی : هەمان سەرچاوە ، ل١٦٣-١٦٤ .
[٦١] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٣٧ .

كەوتنە بۆردومانی شارو ژمارەیەك خەڵكی بێ تاوان كوژران و بریندار بوون*
ئەوسا شێخ مەحمود ناچاربوو بەرەبەیانی ٤ی مارت بەخۆی و هێزەكانیەوە بكشێتەوەو ناوچەی سورداش و ئەشكەوتی (جاسەنە) ی كردە بنكەی سەركردایەتی خۆی [٦٢] . هەرئەو ڕۆژانەی ئینگلیز بۆردومانی سلێمانیان دەكرد ، دووبارە وەفدێكی دیكەی سلێمانی بە سەرۆكایەتی شێخ قادری حەفیدو ئەندامێتی مستەفا پاشای یامولكی و ئەحمەدی فەتاح بەگ و كەریمی عەلەكە گەیشتنە كەركوك [٦٣] . ڕۆژی ٢١ ی مارت گەیشتنە بەغداد چاویان بە (هنری‌دۆبس) ی مەندوبی سامی كەوت ، بەڵام نەیانتوانی هیچ دەقێك یا پێشنیازێك دەربارەی ئایندەی سلێمانی دابڕێژن ، هەر ئەوە نەبێت داوای دوبارە گەڕانەوەی ڕاوێژكاری ئینگلیزیان كردو ڕۆژی ٢٣ ی مارت چاویان بە (فەیسەڵ) كەوت ، بەڵام هیچ شتێك سەبارەت بە پاشەڕۆژی سلێمانی گەڵاڵە نەكرا [٦٤] .

كاتێك وەفدەكە گەڕایەوە ، شێخ مەحمود لە سلێمانی نەمابوو ، لە ئەشكەوتی (جاسەنە) گیرسابۆوەو هەر لەوێش ڕۆژنامەی ( بانگی هەق )* ی چاپكرد [٦٥] .

دوای جێ هێشتنی سلێمانی لە لایەن شێخ مەحمودەوە ، شارەكە بۆ ماوەیەكی دیكە لە لایەن (شێخ محەمەد غەریب) ی زاوای شێخ مەحمودو ڕەزا

* ئەحمەد خواجە لەم بارەیەوە دەڵێت:"فڕۆكەكانی ئینگلیز دوو بۆمبایان بەرداوەتەوە، یەكەمیان لە دەشتی(شێخ جافر)كەوتووە، بەڵام دووەمیان لە ناوەڕاستی سلێمانیدا بەرماڵی(كەریم بەگی خانزادە جوانی)كەوتووە نزیك سەرا، دوو ژن و سێ منداڵی ئەو ماڵەی كوشتووە.(چیم دی: ب١، ل٤٧).

[٦٢] د. كەمال مەزهەر : چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد ، ب٢ ، هەولێر ، ٢٠٠١ ، ل٣٨.

[٦٣] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ،ل١٤٠-١٤١ .

[٦٤] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب١ ، ل١٤٨ .

* ئەو ڕۆژنامەیە تەنها سێ ژمارەی لێدەركراو لە ژمارە یەكیدا ، باس لە بۆردومانەكەی سلێمانی دەكات، بەلام ژمارە دووی تا ئێستا ونە. (فاروق علی عومەر : الصحافە الكردیە ف‍ی العراق، ل٨٢).

[٦٥] بانگی هەق : ژمارە (١) ، ٢٨ / ٣ / ١٩٢٣ .

بەگ و ئەورەحمان ئاغاوە بە هاوكاری و پاڵپشتی كەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند بەڕێوە برا [٦٦]. هەرچەندە هێشتا ئینگلیزەكان نەگەڕابوونەوە ، بەلام ژمارەیەكی بەرچاوی خەڵك سلێمانیان جێهێشت و بەرەو دێهاتەكان ڕۆیشتن[٦٧]. هێزەكانی ئینگلیز ، كەوتنە جموجۆڵ بۆكۆنترۆڵ كردنەوەی ناوچەكانی ژێر دەسەلاتی شێخ مەحمود ، ئەوە بوو سەرەتا لە ڕێكەوتی ٥ ی نیسانی ١٩٢٣ دا ( كۆیە ) یان گرتەوە ، دواتر لە٢٢ی نیسان ڕەواندز بەبێ بەرگری دەستی بە سەردا گیرایەوە و سەید تەهای شەمزینی كرا بە قائمقامی شارەكە [٦٨].

ئینگلیزەكان كەوتنە خۆ بۆ دووبارە داگیر كردنەوەی سلێمانی، دوای ئەوەی لە ڕێگای بەیاننامەوە هەڕەشەیان لەخەڵكی دەكرد كە نابێت كەس هەوڵی بەرگری بدات ، ڕێكەوتی ١٦ی مایسی ١٩٢٣ هێزەكانیان گەیشتە سەر چنار و پیاو ماقوڵانی سلێمانیان بانگ كرد بۆ ئەوێ، بەلام هێزەكانیان بەرەو سلێمانی نەجولان ، بەڵكو ڕووەو نێوچەكانی سورداش و مەرگە چوون و ئەو ناوەیان كێو ماڵكرد ، بەلام شێخ مەحمود لە ١٥ی مایسی ١٩٢٣ ەوە جاسەنەی جێ‌هێشتبوو، و بەرەو (ماوەت) چووبوو ، لەوێشەوە خۆی گەیاندە گوندی (برنجە ) ی هەورامان [٦٩].

---

[٦٦] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٤٢ .

[٦٧] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب١ ، ل١٥٠ .

[٦٨] ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل٣٩٦-٣٩٧ .

[٦٩] سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٩٦-٣٩٧ .

## ٢_گەڕانەوەی ئینگلیز بۆ سلێمانی

دوای ئەوەی هێزەکانی بەریتانیا لەڕێکەتی ١٦ی مایسی ١٩٢٣ دا گەیشتنە سەرچنار ، هەر هەمان ڕۆژ ئەدمۆندزبە یاوەری سەرانی شارەکە خۆی گەیاندە وە سلێمانی و کەوتەوە ڕێکخستنەوەی کاروبار و دامەزاندنەوەی دامو دەزگاکانی خۆیان لەشارەکە دا ، ئەوە بو(ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ )کرا بە سەرپەرشتیار بەسەر دام و دەزگاو فەرمانگەکانی سلێمانی و ( شێخ قادری حەفید ) یش بەرپرسیارێتیپاراستنی ئاسایش و ئارامی پێ سپێردرا ،ئەدمۆندزیش خۆی لە بینای ( مەکتەبی ئەعدادی)ەکەدا، کاروباری بەڕێوە دەبرد و پێشوازی لەوانە دەکرد کە دەهاتن بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی و دڵسۆزی خۆیان نیشانی ئینگلیز بدەن ، دواجار هێزەکانی بەریتانیا لە ڕێکەوتی ٢٨ی مایسی١٩٢٣ گەیشتنەوە سلێمانی و کۆنترۆڵیان کردەوە [٧٠].

لە یەکەم هەنگاویاندا پەنجا چەکداری هێزی ( لیڤی )یان تەرخان کرد بۆ پاراستنیئاسایشی ناوشار [٧١] .

ڕۆژێك دوای گەیشتنەوەی هێزەکانی ئینگلیز ، سەرەك وەزیرانی عێراق (عبد المحسن السعدون )بە یاوەری وەزیری ناو خۆو موتەسەڕیفی بغدا و ڕاوێژکاری بەریتانیا بۆ کارو باری ناوخۆ گەیشتنە سلێمانی ، بە مەبەستی ئەوەی سلێمانی بخەنەوە سەر ئیدارەی عێراق ، بۆئەم مەبەستەش لەگەڵ، پیاو ماقوڵان و کەسایەتیە ناسراوەکانی شارەکەدا کۆبونەوە ، بەڵام لە ئاکامی کۆبوونەوەکەدا ، سەرەك وەزیران ئەو باوەڕەی لا دروست بوو کە کوردەکانی سلێمانی بە هیچ شێوەیەك ئامادە نین بخرێنە سەر عێراق ، بەڵام گوێڕایەڵی و هاوپشتی خۆیان بۆ نوێنەری ئینگلیز دەرخست، ئینگلیزەکان پێشنیازی ئەوەیان کرد کەوا ئەنجومەنێکی ئیداری کوردی لە سلێمانیدا پێکبێت و سەرۆکەکەشی لەلایەن نوێنەری باڵاو (فەیسەڵ) ەوە بڕیاری لێبدرێت، وێڕای

---

[٧٠] سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٩٧-٣٠١ .

[٧١] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٤٣.

بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردی لە سلێمانیدا ، هەروەها سلێمانی وەك لیوایەکی عێراق مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت ، بەڵام ، بیرو بۆچوونی تایبەتی خۆی هەبێت و نوێنەری تایبەتی خۆی هەڵبژێرێت بۆ پەرلەمانی عێراق ، بەڵام ، لە پەرلەماندا هیچ ئەندامێکی سلێمانی ناچار ناکرێت سوێندی دڵسۆزی بۆ(فەیسەڵ) بخوات.

دوای تاوتوێ کردنی ئەم پێشنیارانە ، هەردوولا ڕەزامەندیان نیشان دا ، بەڵام بەمەرجێك هێزی بەریتانیا لە سلێمانیدا بهێڵرێتەوە بەمەبەستی پاراستنی ئاسایش و ئارامی شارەکە ، بەڵام (هنری دۆبس) ئەم ئەرکەی نەخستە ئەستۆی خۆی ، جگە لەمە هەریەك لە قەزاکانی (ڕانیە، چەمچەماڵ ) لە سلێمانی جیا کرانەوەو خرانە سەر لیوای هەولێرو کەرکوك بەمەبەستی دەست بەسەرا گرتنی تەواوی سلێمانی ، ئەم پشت گوێ خستن و گرنگی پێنەدانە بووە هۆی ئەوەی ئەندامانی ئەنجومەنەکە لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٢٣ دا دەست لە کار بکێشنەوە [٧٢] و هێزەکەی ئینگلیزیش لە ڕێکەوتی ١٧ی حوزەیران دا سلێمانیان چۆڵ کرد ، چونکە دوای ئەوەی لە ١٢ی حوزەیران (هنری دۆبس) هاتە سلێمانی و هەندێ ڕاسپاردەی بۆ کوردەکان دانا ، بەڵام هیچ نەکرا ، کەئەمەش هەربۆ هێور کردنەوەی خەڵکی سلێمانی بوو [٧٣].

هەموویان تارێکەوتی ١٤ ی حوزەیران لە سلێمانی مانەوە ، بەڵام ، شتێکی ئەوتۆیان پێنەکرا بۆ ئاسایی کردنەوەی بارو دۆخی ناوچەکە و کەسێکی وەهایان بۆنەدۆزرایەوە بتوانێ جێگەی شێخ مەحمود بگرێتەوە بۆیە ناچار بوون بکشێنەوە [٧٤].

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لەبارەی ئەم هاتنەی مەندوبی سامیەوە دەڵێت : " هنری دۆبس، هاتە سلێمانی ، لەگەڵ شێخ عەبدولکەریمی قادرکەرەم دا ، لە مزگەوتی گەورە سەرانی نەیاری شێخ مەحمودیان کۆکردەوە ، پاش قسەکانی

---

[٧٢] سەرچاوەی پێشوو ، ل١٤٥-١٤٦ .

[٧٣] ڕەسول هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل٥٠٥ .

[٧٤] د . کەمال مەزهەر : چەند لاپەڕەیەك ، ب٢ ، ل٣٩ .

وەفدەکە، (شێخ محەمەد گولانی) وتارێکی توندو تیژی دەربارەی شێخ مەحمود خوێندەوە ، زێوەرو مەلائەحمەدی حاجی مەلاڕەسول کە هەردووکیان مامۆستای قوتابخانەی (مەحمودیە) بوون منداڵە قوتابیەکانیان هێنا ، ئەم (شەرقی) یەیان خوێندەوە، کە جاران پێیان ئەووت (نەشیدی مەدرەسە):

قودومی خێربیٚ مەندوبی سامی
والی عومو می زاتی کیرامی
فەخرە بۆ ئێمە ئەم زیارەتە
باعثی نەجاتە لەم ئەسارەتە [٧٥].

شێخ ڕەوق شێخ مەحمود ، باس لەوە دەکات دوای گەڕانەوەی ئینگلیزەکان ، نۆکەرو بەکریٚ گیراوەکانی ئینگلیز لە سلێمانیدا دەستیان کردووە بەبڵاو کردنەوەی پڕوپاگەندە دژی شێخ مەحمود [٧٦].

دواى ئینگلیزەکانیش ، مستەفا پاشای یامولکی کە لە سلێمانیدا مابۆوە لە ڕێکەوتی٨ ی حوزەیراندا ، ژمارە (١٤) ی بانگی کوردستانی بڵاو کردەوەو چەند هەواڵێکی گرنگی ئەوماوەیەی دەسەڵاتی ئینگلیزی لە سلێمانیدا خستە ڕوو ، بۆ نمونە دوای گەڕانەوەیان بڕیاری ئەوەیان داوە کە ئەو کەسانەی لە زەمانی شێخ مەحمود دا دامەزراون و پۆست و پلەوپایەیان وەرگرتووە بەگشتی کارەکەیان هەڵوەشاوەتەوە ، جگە لەوە هەواڵی، سەردانی (هنری دۆبس) بۆ سلێمانی بڵاوکراوەتەوە لەگەڵ ڕیٚ و ڕەسمی پێشوازی کردن و کۆبوونەوەی لەگەڵ پیاوماقولانی شارەکەدا [٧٧].

وەك ئاماژەمان پێکرد هێزەکانی ئینگلیز لە ١٧ی حوزەیرانی ١٩٢٣ سلێمانیان چۆڵ کرد، بەم شێوەیە مەسەلەی دوبارە گەڕانەوەی شێخ مەحمود بوو بە شتێکی حەتمی و بەڵگە نەویست [٧٨].

---

[٧٥] چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی : ١٧ / ٢ / ٢٠٠١ ، بەغدا .

[٧٦] ڕەسول هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل٥٠٦ .

[٧٧] بانگ کردستان: ژمارە (١٤) ، ٨ / ٦ / ١٩٢٣ .

[٧٨] د . کەمال مەزهەر :چەند لاپەڕەیەك ، ب٢ ، ل٣٩ .

## ٣- سێهەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود

دوای چۆڵکردنی سلێمانی ، ژمارەیەك لە کوردەکانی نەیاری شێخ مەحمود شارەکەیان جێ هێشت و شان بەشانی هێزەکانی ئینگلیز بەرەو کەرکوك ڕەویان کرد ، کە ئەو ڕۆژانە لەنێو خەڵکیدا بە ( ڕۆیشتنە عمومیەکە) ناسرابوو [٧٩].

ئەمانە کاتێك چوونە کەرکوك ، لەلایەن تورکمانەکانی ئەوێوە سوکایەتیان پێدەکراو ژمارەیەکیشیان لەڕێگا ڕووت کرانەوە [٨٠]. کەبێگومان بەشی زۆری ئەمانە ، لەوانە بوون کەلە شێخ مەحمود زویر بووبوون و لەگەڵیدا نەدەگونجان ، دوای نەمانی دام و دەزگای شێخ مەحمود گەڕانەوەو خزمەتێکی زۆریشیان کرد.

د.کەمال مەزهەر لەبارەی ئەمانەوە دەڵێت : " لەو سەدان و سەدان بەڵگەنامە نهێنیانەی ئینگلیز دا کەمن دیومن ناوی کەسێکیان بەخراپی نەهاتووە" [٨١]. بەشێکی زۆر لەوانەی سلێمانیان جێ هێشت ، ئەو ئەفسەرە دڵسۆزانە بوون کە لە ڕیزی سوپاکەی شێخ مەحمود دا بوون، بەڵام لەلایەن (جلخوار)* ەکانەوە ، بە هەموو شێوەیەك دژایەتی دەکران و پیلانی لەناو بردنیان بۆ دادەنان [٨٢].

---

[٧٩] ژیان : ژمارە (١٨) ، ٢٧/ ٥ / ١٩٢٦ ، ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل٣٠٢ .

[٨٠] ڕەشید شەقی : هەمان سەرچاوە . ل٣٣ .

[٨١] د. کەمال مەزهەر : لەو پێشەکیە وەرگیراوە ، کە بۆ (ژیانەوە) و شوێنی لەڕۆژنامە نوسی کوردیدا ، ١٩٢٤-١٩٢٦ نوسراوە ، عەبدوڵا زەنگەنە ، هەولێر ، ٢٠٠٠ ، ل١٥ .

* سەبارەت بەم نازناوە دوو بۆچوون هەیە : یەکەمیان پێی وایە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پیاوێك زۆرجار چۆتە لای شێخ مەحمود ، کەلایەنگرێکی سەرسەختی تورکەکان بووە،و بەردەوام چاکەتەکەی خوار بووە، بۆیە سەرجەم تورکخواکان ئەو نازناوەیان بەسەردا دابڕاوە، بۆچوونی دووەم ئەم نازناوە بۆ کۆپانی گوێ درێژ دەگێڕنەوە، پێدەچێت ئەمەی دووەمیان ڕاستتر بێت، چونکە وشەی (جل)لە زمانی عەرەبیدا بەمانای کۆپان دێت.(ڕەفیق سالح : سێ ڕۆژنامەی ڕۆژگاری شێخی نەمر،ل١٥ ؛ ڕەشید شەوقی : هەمان سەرچاوە، دەستنوس).

شێخ مەحمود خۆی یەك ڕاست نەگەڕایەوە سلێمانی ، بەڵكو كەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند و پیاوەكانی ، گەیشتنەوە ناو شارو دەستیان بەسەردا گرتەوە و بانگەوازیان بۆ خەڵكەكە دەركرد ، ئاسایش و ئارامی بپارێزن و كەوتنە هەڕەشە كردن لەوانەی پاڵپشتی و هاوكاری ئینگلیزیان كردووە [٨٣]. دواتر شێخ مەحمود لە ڕێكەوتی ٢٦ ی حوزەیرانی ١٩٢٣ گەیشتەوە سلێمانی [٨٤].

لەگەڵ گەیشتنەوەیدا ، (هنری دۆبس) بۆ ڕوونكردنەوەی هەڵوێستی ئینگلیز بەرامبەر بە شێخ مەحمود ، ئەم بڕیارانەی لای خوارەوەی دەركرد .

١-دوای شكستی هەوڵەكان بۆ لكاندنی سلێمانی بە عێراقەوە ، سلێمانی دەگەڕێتەوە بۆ بارو دۆخی پێش هەڵمەتەكانی بەریتانیاو هیچ پەیوەندیەك و بەیەك گەیشتنێك ناكرێ لەنێوان حكومەتی عێراق و ئەواندا .

٢-ئەم بڕیارەی پێشوو تەنها بەشێك لە لیواكە دەگرێتەوە كە ڕێگا نادەن بخرێنە سەر عێراق و كۆنتڕۆڵی حكومەتەوە ، بەڵام ئەو ناحیەو قەزایانەی جیاكراونەتەوە هەموو كارێكیان لە ڕێگەی حكومەتەوە دەكەین.

٣-شێخ مەحمود ئاگادار بكرێتەوە كە ئێستا حاكمە لە سلێمانیدا ، وەخۆی و كاروبارەكانی وازلێهێنراون ئەگەر دەست درێژی نەكاتە سەر دەرەوەی سنوری مەركەزی سلێمانی .

(هنری دۆبس) بەنامەیەكی تایبەتیش ئەم بڕیارانەی گەیاندە شێخ مەحمود ، هەموو هەنگاوێكی پێویستیشیان نا بۆ دابڕینی (ڕانیە ، قەڵادزێ، سەنگاو ، چەمچەماڵ ، هەڵەبجە، قەرەداغ ، ماوەت) و بەتوندی ئاگاداریان كردەوە كە نابێ دەست بخاتە كاروباری ئەم ناوچانە. كەئەم هەڕەشەیە خۆی

---

[٨٢] ڕەشید شەوقی : هەمان سەرچاوە ، ل٢٩ .

[٨٣] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٤٧ .

[٨٤] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب٢ ، ل٤٤-٤٥ .

لە خۆیدا ، دەکرا لە هەموو ئان و ساتێکدا بکرێتە بیانوو بۆ لێدانی شێخ مەحمود[٨٥] .

شێخ مەحمود ، کەوتەوە کارکردن ، بۆ دامەزراندنەوەی حکومەتێکی نوێ لە سلێمانیدا، جگەلەوە دووبارە بیری لەوە کردەوە کە ڕۆژنامەیەك چاپ بکاتەوە . ئەوەبوو دووبارە ڕۆژنامەی (ئومێد ئیستقلال)* لە سلێمانی‌دا چاپ کرایەوە. لە یەکەم ژمارەشیدا کەلە ٥ ی ئەیلولی ١٩٢٣ دا دەرچوو، ناوی ئەندامانی سێهەمین کابینەی حکومەتی شێخ مەحمود تێدا بڵاو کرایەوە کە بریتی بوون لە :-

١-شێخ محەمەد غەریب _ ڕەئیسی داخلیە .

٢-سەید ئەحمەد ئەفەندی _ ڕەئیسی مالیەو گومرك .

٣-معروف ئەفەندی _ ڕەئیسی مەحکەمە .

٤-حاجی مەلا سەعید ئەفەندی _ ڕەئیسی تجارەت و مەعاریف .

٥-ڕەزا بەگ _ قوماندانی عەسکەری .

هەر لە هەمان ژمارەدا لە ژێر ناوی (ئەشراف و مونەتەخەبەی ئەهالی) ناوی ژمارەیەك کەسایەتی دیکەی سلێمانی نوسرابوو [٨٦] . بەڵام سنوری دەسەڵاتی ئەمجارەی شێخ مەحمود بەرتەسك بوو ئینگلیزەکانیش لەسەر

---

٨٥ د. کەمال مەزهەر : چەند لاپەڕەیەك ، ب٢ ، ل٤٠ .

* بەڵام ئەمجارەیان چاپخانەکەیان وەك یەکەمجار جێ نەمێشتبوو ، هەرچەندە لە ئەشکەوتی (جاسەنە) وە هێنابوویانەوە بۆ سلێمانی ، دوای ئەوەی شێخ مەحمود لەو ئەشکەوتەدا جێیهێشت ، بەڵام ئەمجارەیان ئینگلیزەکان لەکاتی ڕۆیشتنیان و چۆڵکردنی سلێمانیدا بەمەبەستی پەکخستنی میلێکیان لێ دەرهێناو لە گەڵ خۆیان بردیان ، بەڵام چاپخانەکە چاك کرایەوەو. لیژنەیەك پێکهێنرا بۆ جێبەجێ کردنی کاری دەرکردنی ڕۆژنامەیەك ئەندامانی لیژنەکە پێکهاتبوون لە (ئەحمەد خواجە ، ماجید مستەفا ، عادلی شێخ سەلام ، سەید ئەحمەد بەرزنجی ، سەبری کاکە ڕەش) دوای کۆبوونەوەو گفتوگۆ چەند ناوێکیان دەستنیشان کرد، بەڵام لەکۆتایدا بە تیرو پشك ناویان نا (ئومێدی ئیستقلال)،( د. کەمال مەزهەر : چەند لاپەڕەیەك ،ب١،ل١٥٨)

٨٦ ئومێدی ئیستقلال : ژمارە (١) ، ٢٠ / ٩ / ١٩٢٣ .

داوای عێراق سلێمانیان لە دەوروبەرەکەی دابڕیبوو بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی ، بەڵام هێندەی پێنەچوو شێخ مەحمود لە کۆتایی تەمووزی ساڵی ١٩٢٣ دا کەوتە هەوڵدان بۆ دوبارە کۆنترۆڵکردنەوەی ئەو ناوچانەی لە سلێمانی جیاکرابوونەوە [٨٧]. ئینگلیزەکانیش دوای مۆرکردنی (پەیمانی لۆزان)* لە ڕێکەوتی ٢٤ ی تەمووزی ١٩٢٣ ، پێیان وابوو هیچ ئیلتیزامێکیان بەرامبەر کوردی کوردستانی باشور نەماوە ، تەنانەت لەو ڕاپۆرتە تایبەتەی بەریتانیا ناردویەتی بۆ (کۆمەڵەی گەلان) هۆکارەکانی پاشگەز بوونەوەی خۆیان ڕوون کردۆتەوە و دەڵێن : " لە کاتی گفتوگۆی لۆزاندا بەئاشکرا بەهیچ جۆرێك باسی ئەوە نەکرا کەناوی دروست بوونی حکومەتێکی کوردی ببرێ و ئیتر لەوساوە ، وادانرا کە دەبێت کوردستان بەشێك بێت لە عێراق [٨٨]" .

هەربۆیە کاتێك زانیان شێخ مەحمود دوبارە خەریکی تەقەللادان و پەل هاویشتنە ، کەوتنە خۆ بۆ لێدانی حکومەتەکەی و لەناو بردنی دەسەڵاتەکەی ، ئەوەبوو لە ڕێکەوتی ١٦ی ئابی ١٩٢٣ دا بۆردومانی شاری سلێمانیان کرد ، بە بۆمبای (٢٢٠) پاوەندی کەیەکەم جاربوو لەمێژوودا ئەم بۆمبایە بەکاربێت ، تەنانەت (جۆن سالمۆند) ی فەرماندەی هێزی ئاسمانی لە عێراق خۆی سواری فڕۆکە بووە بەمەبەستی بۆردومانی سلێمانی ، بەتایبەت بۆ لێدانی ماڵی شێخ مەحمود هاتووە [٨٩]. پێدەچێت شێخ مەحمود ئەوکاتانە زۆری لامەبەست بووبێت لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ڕێکەوێت، چونکە لە ئومێدی

---

[٨٧] وەلید حەمدی : هەمان سەرچاوە ، ل١٤٦ .

*لەسەر داوای وڵاتانی سەرکەوتووی جەنگی یەکەمی جیهانی ، لە ١٩٢٢/١١/٢٠ کۆنگرەی لۆزان دەستی بە کارەکانی کرد، نوێنەری بەریتانیا لەم کۆنگرەیەدا (لۆرد کیرزن)بوو،(عصمت ئینۆنۆ)ش نوێنەری تورکیا بوو، کە لە ئاکامدا بڕیارەکانی ئەم کۆنگرەیە کۆتایی پێهێنانی خەونەکانی کورد بوو لە پەیمانی سیڤەردا.(فاضل حسین: هەمان سەرچاوە،ل٤٤-٤٥)

[٨٨] د. فؤاد حمه خورشيد مصطفى : القضية الكردية في المؤتمرات الدولية ، اربيل ، ٢٠٠١، ل١١١؛ڕەسول هاوار:شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل٤٧٨ .

[٨٩] ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل٣١٢ .

ئیستقلال دا بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش هەست بەم مەسەلەیە دەکرێت و چەند بابەتێك لەو ژمارەیەدا سەبارەت بە ڕێکەوتن لەگەڵ ئینگلیزدا بڵاو بۆتەوە [٩٠].

تەنانەت ئەوڕۆژانە شێخ مەحمود پەیتا پەیتا نامەی ڕەوانە دەکرد بۆ نوێنەری باڵای ئینگلیز لە بەغدا داوای لێدەکردن ، نوێنەری خۆیان بنێرن بۆ سلێمانی. بەڵام ئینگلیزەکان ڕازی نەدەبوون و بەپێچەوانەوە ئەوان بە شێخ مەحمودیان ڕادەگەیاند کە بچێت بۆ بەغدا تا چارەنوسی سلێمانی لەگەڵدا باس بکرێت [٩١].

شێخ مەحمود لەبیری ئەوەدا بوو کە چاپخانەی نوێ بۆ سلێمانی بهێنێت لە ئەڵمانیاوە و گەشە بە چاپ و بڵاوکردنەوە بدات، سەرقاڵی سکە لێدان و پارەی کاغەز چاپ کردن بوو ، بەڵام بارودۆخی ناهەمواری شارەکە ڕێگای نەدا ، هیچ هەنگاوێکی بەرچاو بنرێت هێندە نەبێت پولی پۆستە لەم سەردەمەدا چاپ کرا .[٩٢] بەڵام لەڕێکەوتی ٢٠ی مایسی ١٩٢٤ دا بەیاننامەیەکی زۆر بەسەر سلێمانی و دەوروبەریدا بەردرایەوەو ئاگاداری خەڵکیان کردبوو کە ناوچەکە بۆردومان دەکرێت ، ڕۆژی ٢٢ ی مایسی ١٩٢٤ شێخ مەحمودیان ئاگادار کردەوە گەربێتو ناوچەکە جێ نەهێڵێت ئەوا شارەکە بۆردومان دەکرێت [٩٣].

لەو سەردەمەدا ، ترس و دڵە ڕاوکێی خەڵکی بەشێوەیەك بوو کەس نەیدەوێرا بەڕۆژ لەنێو شاردا بمێنێتەوە پێش ڕۆژ هەڵاتن گەورەو بچوك شاریان جێ دەهێشت و خۆیان دەگەیاندە دەشتایی و سەرقەبران و دەورو بەری شار ، تا خۆرئاوا خۆیان دەشاردەوە ئینجا دەگەڕانەوە ، ئەم حاڵەتە وای کردبوو جگە لە دام و دەزگای حکومەت ، بازاڕو دوکانیش نەمێنێت ، تەنانەت

---

[٩٠] ژمارە (٢) ، ٢٧ / ٩ / ١٩٢٣ .
[٩١] ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل٣٢٦ .
[٩٢] د. کەمال مەزهەر : چەند لاپەڕەیەك ، ب١ ، ل١٥٩ .
[٩٣] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد : چەند لاپەڕەیەك ، ب٢ ، ل٤٢ .

شێخ مەحمود خۆشی وەك ئەو خەڵکە لە نێو شار نەدەماو بە زۆری دەچووە تەکیەی (شێخ مارف) لە سەرقەبران[٩٤] .

جارێکی دیکە هێزە ئاسمانییەکانی ئینگلیز ، لە ٢٥ ی مایسی ١٩٢٤ سلێمانیان بۆردومان کردو خەڵکی شارەکە بە شێوەیەکی گشتی ڕەویان کرد ، بەرەو لادێکان چوون ، لە کۆی (١٩٣٠٠)کەس سلێمانی تەنها (٧٠٠) کەسی تێدا مایەوە. ئەم بارە ماوەی چوار مانگی خایاند تا هەموویان گەڕانەوە شوێنی خۆیان و بۆردومانەکەش بووە هۆی کاول کردنی زۆری شارەکە[٩٥] .

بەم شێوەیە ئەم جارەش دەسەڵاتی شێخ مەحمود لە سلێمانیدا لەژێر فشاری بۆردوماندا کۆتایی پێهات و لە ڕێکەوتی ١٦ ی تەمموزی ١٩٢٤ دا شێخ مەحمود ناچارکرا سلێمانی چۆڵ بکات و ڕووبکاتە شارباژێڕو لە گوندی (سیتەك) بارگەی خۆی بخات[٩٦] .

هێزەکانی بەریتانیا لە ڕێکەوتی ١٩ / ٧ / ١٩٢٤ دا سلێمانیان گرتەوە ، کە هێزێکی تێکەڵ بوو لە (لیڤی) و هێزی حکومەتی عێراقی[٩٧] . بۆ یەکەم جار یەکەم فەوجی حکومەتی عێراق توانی بگاتە سلێمانی ، ئەم فەوجەش ناوی (موسی الکاظم) بوو[٩٨] . ئینگلیزەکانیش لەگەڵ گەڕانەوەیاندا (چەپمەن) یان کردەوە لێپرسراوی کارگێڕی شاری سلێمانی و دەسەڵاتی موتەسەڕیفیان پێدا.

---

[٩٤] ئەکرەمی صاڵحی ڕەشە : هەمان سەرچاوە ، ب٢ ، ل٣٥١ – ٣٥٢ .

[٩٥] د. کەمال مەزهەر : چەند لاپەڕەیەك ، ب٢ ، ل٤٢ ؛ چیم دی ، ب٢ ، ل٦١ .

[٩٦] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب٢ ، ل٦٤ .

[٩٧] کشف القناع عن بعض الوقائع العراقية : مذکرات عبدالعزيز ياملکی ، بغداد ، ١٩٥٧ ، ل١٣ ، ئەدموندز : هەمان سەرچاوە ، ل٣٤٨ ، عبدالرزاق الحسني : تاريخ الوزارات العراقية ، ج١ ، ل٢٨٠ .

[٩٨] چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد) : Med TV .

# باسی دووەم
# هاتنی سمکۆی شکاك بۆ سلێمانی

## ١- بەراییەکانی پەیوەندی نێوان سمکۆ و خەڵکی سلێمانی :

سەرەتاکانی ئاشنا بون و یەکتر ناسینی شێخ مەحمود و خەڵکی سلێمانی لەگەڵ سمکۆدا بۆ ئەو ڕۆژانە دەگەڕێتەوە ، کە شێخ مەحمود بە دیل گیرا و خانوادەی شێخ مەحمود ئاوارەو پەڕاگەندە بوون ڕوویان کردە کوردستانی ڕۆژهەلات ، ماوەیەك لە لایەن مەحمود خانی دزلی و مەحمود خانی کانی‌سانان میوان بوون دواتر روویان کردە هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتی سمکۆ ، کە ئەو کاتە دەسە لاتێکی زۆری هەبوو پانتاییەکی فراوانی خاکی کوردستان و ئازەربایجانی ئیرانی لە ژێر دەستدا بوو ، کاتێکیش ئەم خێزانانە پەنایان بۆ برد هەرچی لە توانایدا بوو درێغی نەکرد بەرامبەریان[٩٩] .

تەنانەت ئەو پەڕی نەوازشی بەرامبەر ئەو بنەماڵەیە نواند بوو، فەرمانێکی دەرکرد بوو، کە پێویستە پارێزگاریی لە ژیان و سەروەریی ئەم بنە ماڵەیە بکرێت و چییان پێویست بێ لەسەر حسابی ئەو بۆیان بکرێت ، دژی ئەو کەسانەش دەوەستاوە کە داوایان دەکاتەوە[١٠٠] .

دەتوانین بڵێین ئەم ئاشنا بوونە لێرەوە دەستی پێکرد، چونکە لە ڕۆژگاری دەسەلاتدارێتی حکومەتی کوردستاندا ئەو هەلە نەڕەخساوە ، کە ئەم دوو سەرکردەیە یەکتر بناسن .*

جگە لەوەی کەم سەرکردەی کورد هەیە خۆشیی بە چارەی سەر کردەیەکی دیکە هاتبێت ، ڕەفیق حلمی لەم بارەیەوە دەڵێت "لە کوردستان

---

[٩٩] د. عبد الرحمن قاسملۆ :کوردستان و الاكراد ، ل٩٨ .

[١٠٠] یادداشتەکانی شێخ لەتیف ، ل٦٩-٧٠ .

* بە هۆی لێك دابڕانی کوردستان بەردەوام مێژووی کورد وەك کۆمەڵە ڕوداوێکی لێکدابڕاو نەك پێکەوە گرێ دراو دێتە پێش چاو هیچ کامێکیان تەواو کەری ئەوی دیکە نەبوون.( ڕەفیق سابیر : بەرەو مێژوو ، ستۆکهۆڵم ، ١٩٩١ ، ل١٢)

زوعەما زۆر ڕەقابەت دەنوێنن لەگەڵ یەكتری وحەسوودی بە یەك دەبەن، ئەمە مەنشەئێكی گەورەی بێ هێزیانە ، سمكۆ نەی دەویست چارەی شێخ مەحمود ببینێت ، شێخ مەحمودیش نەفرەتی لە سمكۆ دەكرد "[101] .

وێڕای ئەم گرێ كوێرەیەی دەروونی سەركردەكانی كورد ، ڕۆڵی داگیر كەرانەی ئینگلیزیش زۆر بە زەقی بەدەر دەكەوێت ، لەوەدا كە بە هەموو شێوەیەك دژ بە سمكۆ و شۆڕشەكەی بوون و ڕێگای هیچ پەلهاویشتنێكیان نە دەداو لێنەدەگەڕان هیچ هەوڵێكی دیپلۆماتیسەركەوتووی هەبێت، تەنانەت دوای پەیماننامەی ئەنگلۆ-ئێرانی ساڵی ١٩١٩ سمكۆ هیچ هیوایەكی بە پشتیوانی ئینگلیز نەما بۆ پشتگیری كردن لە تەقەلاكانی كورد بۆ پێكهێنانی یەكێتیەكی نەتەوایەتی كوردەكانی هەرسێ پارچەكەی ڕۆژ هەڵات و باشوور و باكور، بۆیە سمكۆ هەرگیز نەیتوانی هیچ كارێكی چەكداری هاوبەش لەگەڵ بزوتنەوەی كورد لە پارچەكانی عێراق و توركیا ئەنجام بدا[102] .

بەم شێوەیە دەرفەتی لێك نزیكبوونەوەی ئەم دوو سەركردەیە ئەستەم بوو، هەر چەندە (كریس كۆچێرا ) ئاماژە بۆ ئەوە دەكات گوایە ، نۆئێل بەرنامەی ئەوەی هەبووە كە شێخ مەحمود و سمكۆی شكاك و سەید تەها دژی توركەكان بكات بە یەك و هانیان بدا[103] .

بەڵام لە ڕاستیدا پێناچێت ئینگلیز هیچ پلانێكی هەبوو بێت بۆ یارمەتی دانی سمكۆ، چونكە بەر دەوام لە ڕۆژنامەكانی بەریتانیادا سمكۆ بە

---

[101] خلاصەی مەسئلەی كورد ، موصل ، ١٩٣٤ ، ل٧ .

[102] صالح محمد امین : كورد و عەجەم ، چاپی یەكەم ، ١٩٩٢ ، ل ٣٣٣ -٣٤٤ .

[103] مێژووی كورد لەسەدەی نۆزدە و بیستدا ، وەرگێڕانی ، محمد ریانی ، چ٢ ، تهران ، ١٣٦٩ ، ل١١٦ .

دزوجەردە و (ڕۆبن هـود) ی ڕۆژ هـەڵات نێـو دەبـراو زۆر خۆشـحاڵبوون بەژێـر کەوتنی [١٠٤].

بۆیە دوای گیرانی شێخ مەحمود و گەڕانەوەی حوکمی ڕاستەو خۆی ئینگلیز بۆ سلێمانی هیچ سەر چاوەیـەك باس لـەوە ناکات کە پەیوەندی لـە نێواندا هەبووبێت ، بەڵام دواتر ، ڕەوتـە نیشتمانیەکان هـەوڵی کردنـەوەی ئـەو دەرگایەیان داوە ، مستەفا پاشـای یامولکی دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لـە سـەردەمی دەسـەڵاتی ئینگلیزدا ، هـەر چـەندە لـە بـەغدا مـەرجی ئـەوەیان بـە سەردا سەپاند بوو کە بۆی نییە لە سلێمانی دەرچێت بێ ڕەزامەندی ئینگلیز ، بـەڵام ئـەو لـە مـانگی تشـرینی یەکـەمی سـاڵی ١٩٢١ دا بـەرەو کوردسـتانی ڕۆژهەڵات بە ڕێکەوتووە و لەوێ لە گونـدی (چاری) چاوی بـە سمکۆ کـەوتوو چاوپێکـەوتنی لەگـەڵدا ساز کـردووە ، ئامانجیشـی لـەم سـەر دانـەدا ئـەوە بـوو سمکـۆ هـانبدات شۆڕشـەکەی بگوازێتـەوە نێـو خـاکی کوردسـتانی بـاکور دژی کەمال ئەتا تورك شۆڕش بکات [١٠٥].

دوای ئەمەش ، وەك ڕەفیق حلمی باسی لێوە دەکات ، ناو بانگی سمکۆ لە سلێمانیدا بۆ ئەوانە دەگەڕێتەوە کە لـە ( سـەردەشـت و سـابڵاغ ) ەوە ڕایـان کـردووە و هـەندێکیان دەهاتنـە سـلێمانی ، باسـی دڵ ڕەقـی و زەبـرو زەنگـی سمکۆیان دەکرد و دەڵێت ئێمە لەوانەمان دەبیستەوە [١٠٦] ، جگە لەمانەش فوئاد مەسـتی لـە بیرەوەریـەکانیدا ، باس لـەوە دەکـات کـە سمکـۆی شـکاك داوای لـە ڕۆشنبیرانی سلێمانی کردووە کە بچنـە پـاڵ شۆڕشـەکەی ، کـارو بـاری لەگـەڵدا ڕێکخـەن، لـە بەرامبـەریشـدا ژمارەیـەکی زۆر لـە ڕۆشـنبیران ڕەزامـەندیان نیشـان

---

[١٠٤] د. کمال مظهر : دراسات فی تأریخ ایران الحدیث و المعاصر ، بغـداد ، ١٩٨٥ ، ل٢٥٢ ؛یاسـین خـالد حسن : کردستان الشرقیة ، دراسة فی الحرکة التحرریة القومیة فیما بین ١٩١٨-١٩٣٩ ، کلیة الاداب ، جامعة صلاح الدین ، رسالة ماجستیر غیر منشورة ، ١٩٩٥ ، ل١١٢ .

[١٠٥] هـاوار : حـاجی مسـتەفای یـامولکی و سمـایل خـانی شـوکاك ( سمکـۆ ) ، گۆڤـاری مامۆستای کورد ، ژمارە (٨) ، سوید ، ١٩٨٩-١٩٩٠ ، ل٢٦ .

[١٠٦] یادداشت : ب ٢،ل ٧٧ .

داوە و یەکەم دەستە (سدیق شاوەیس ، ڕەشید جەودەت ، عارف سائیب ، فایەق ئیسماعیل بەگ ، ماجد مستەفا و خۆم ) بەدەنگ داواکەیەوە چووین،بەڵام هەر کە گەیشتینە بۆکان ، بیستمان جوڵانەوەکەی سمکۆ لە نێو براوە ، ئێمەش گەڕاینەوە [107].

تا سەردەمی دووهەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود ، پەیوەندی نێوان سمکۆ و خەڵکی سلێمانی هەر هێندە بوو کە ئاماژەمان پێکرد ، بەڵام لە سەر دەمی دووهەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود دا ، لە هەردوو ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان ) و (ڕۆژی‌کوردستان)دا، پەیتا پەیتا هەواڵی سەرکەوتنەکانی سمکۆ بڵاو دەکرایەوە و زیاتر خەڵکی شارەکە پێی ئاشنا دەبوون [108].

ئەو کاتە لە سلێمانیدا بە (سمایل خانی سمکۆ ) دەناسراو خەڵکی هەر بەو ناوە نێو بانگیان بیستبوو[109] . تەنانەت مستەفا پاشای یاملکی داوا لە کوردەکانی ئەودیو دەکات ، هاوکاری و کۆمەکی ئەوڕۆژنامەیە بکەن بە ناردنی هەواڵ و دەنگ و باس ،[110] لە هەمان ڕۆژنامەدا دوای بڵاو کردنەوەی هەواڵی دووبارە داگیر کردنەوەی شاری (ورمێ) لە لایەن سمکۆوە ، تێبینیەك نوسراوە کە مەغزایەکی جوانی هەیە ئەوەش کە دەڵێت : "مەعلوم دەبێ کە خەبەری خێری تەشەکولی حکومەتی موستەقیلەی کوردستان لە سلێمانیدا دەماری حەمیەت و غیرەتی کوردانی هێناوەتە حەرەکەت"[111] .

ئەم هەواڵانە سەرچاوەی زیاتر ئاشنا بوون و لێك نزیك بوونەوەی کوردەکانی سلێمانی و (سمایل خانی سمکۆ ) بوون ، بەڵام کاتێك هێزەکانی

---

[107] د. كمال مظهر احمد : صفحات من الما ضي يرويها الاستاذ فؤاد مستي ، جريدة التآخي ، ژمارە (١٥٨٢) ، ١٩٧٤/١٠/٢١.

[108] بانگ کردستان : ژمارە (٢) ، ١٤/ ٨ / ١٩٢٢ .

[109] چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا (ئیبراهیم نەحمد) : TV med، سازی کردووە .

[110] بانگ کردستان : ژمارە (١) ، ٢ / ٨ / ١٩٢٢،لە بەشی فارسییەکەیدا.

[111] بانگ کوردستان : ژمارە (١٠) ، ١٠/١٥ / ١٩٢٢ .

ئێران فشارێکی زۆریان بۆ سمکۆ هێناو لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتیدا هەڵکەندرا ، بە ناچاری ڕووی کردە تورکیا، لەوێش هێزێکی سوکەڵەی تورك دای بە سەریاو ، زیانێکی زۆریان لێداو ژنێکی کوژراو خەسرەوی کوڕی بە دیل گیرا ، وێڕای دەست بە سەرا گرتنی پارە و پولێکی زۆر ، ئینجا سمکۆ خۆی و ژمارەیەك لە پیاوەکانی بەناخۆشیەکی زۆر دەرباز بوون [١١٢] و خۆیان گەیاندە کوردستانی باشوور و دواتر لە سەر ئامۆژگاریی و ڕێنمایی سەید تەها ڕووی کردە ناو چەی ( بەحرکە ) لە لیوای هەولێر بە مەبەستی دیدەنی و ڕێکەوتن لەگەڵ ئینگلیزەکان، ڕاستی ئەم قسەیەش لەوە دا ئاشکرا دەبێت کە سمکۆ خۆی هیچ باوەڕێکی بە ئینگلیز نەبووە و زانیویەتی فریوی دەدەن [١١٣] .

هەر بۆیە لە سە رقسەی ( سەید تەها ) ڕووی کردە ئەو ناوچەیەو لە بەحرکە چاوی بە نوێنەرانی ئینگلیز کەوت کە لەگەڵ سەید تەهادا هاتبوون بۆ بینینی ، هەر چەندە ئینگلیزەکان حەزیان نە دەکرد هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ سمکۆدا ببەستن ، بەڵام ئەو کاتە بە حوکمی ئەوەی سمکۆبە دەستی تورکەکان ئەو گورزەی لێدرابوو ، ئینگلیز دەیویست سوود لەم هەلە وەربگرێت و سمکۆ و شێخ مەحمود لێك نزیك بکاتەوە و ، پێکەوە بیانکات بە گژ ئۆزدەمیر و دەستە چەکدارە تورکەکەی ڕەواندوزدا ، واتە دەیانویست لە ڕێگای ( سمکۆ ) ەوە پەیوەندیەکانی نێوان شێخ مەحمود و ئۆزدەمیر تێکبدەن [١١٤] .

ئیدی سمکۆ لە (بەحرکە)وە بەهۆی (عیزەت تۆپچی‌یەوە ) ، کەوتە ئاڵ وگۆڕ کردنی تەلەگراف لەگەڵ شێخ مەحمود ، کە ئەوکاتە ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) دەقی ئەو بروسکانەی بڵاو کردۆتەوە کە لە نێوانیاندا ئاڵۆ گۆڕ کراوەو تا ئەندازەیەکی بەرچاو ستایش و پیاهەڵدانی ئینگلیزی تیادا بەرچاو

---

[١١٢] کریس کۆچێرا : هەمان سەرچاوە ، ل١٠٢-١٠٣ ؛ صاح محمد امین : هەمان سەرچاوە ، ل٣٧١ .

[١١٣] بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود وسمکۆ، ل٥٩-٦٠ .

[١١٤] محمد ڕەسول هاوار : سمکۆ ( ئیسماعیل ئاغای شوکاك ) و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد، ستوکهۆڵم ، ١٩٩٥ ، ل٥٧٦ ؛ ڕەفیق حلمی : یادداشت ، ب ٣ ، ل ٣٤٦ ؛ حوسێنی مەدەنی : هەمان سەرچاوە ، ب ٢ ، ل٣٤٦ .

دەکەوێت ، پێدەچێت ئەو تەلە گرافانەی سمکۆ ، بەچاودێری و ئاگاداری ئینگلیز ڕەوانە کرابێت بۆ شێخ مەحمود ، چونکە سمکۆ بەئاشکرا بە شێخ مەحمود دەڵێت "ئەوەی ئینگلیز نەیکا بۆ کورد سەرناگرێت" ، جگە لەوەش ، سمکۆ لەو بروسکانەدا ، بەنازناوی (حوکمدار) شێخ مەحمود دەدوێنێت ، کە بێگومان دەیزانی ، شێخ مەحمود وەك (مەلیکی کوردستان) خۆی ناساندووە ، بەڵام لێرەدا دەستی ئینگلیز بەئاشکرا خۆی دەردەخات کە چۆن سمکۆیان هانداوە بۆ نزیك بوونەوە لە شێخ مەحمود [115] .

هەرئەم بروسکانەش بوو هیوای لای ئینگلیز پەیدا کردبوو ، لەبەرئەوە ڕێگایان بە سمکۆدا بچێت بۆ سلێمانی بۆ دیدەنی شێخ مەحمود [116] .

سمکۆش ئەو ڕۆژگارە هیوای زۆری بەوە بوو کە ئینگلیزەکان هاوکاری بکەن و پشتگیری لە شۆڕشەکەی بکەن ، گەر ئەوەشی بۆ نەکەن ، هیچ نەبێت یارمەتی بدەن بۆئەوەی کەبگەڕێتەوە سەرشوێن و ڕێگای خۆیو لەگەڵ ئێراندا ئاشتی بکەنەوە،[117] ئیدی بەم شێوەیە مەسەلەکان بەرەو پێش دەچوون تاوەکو شێخ مەحمود بە ڕەسمی داوای لە سمکۆ کرد ڕووبکاتە سلێمانی بۆ گفتوگۆو زیاتر لێك حاڵی بوون [118] .

ئەوڕۆژگارەش پەیوەندی نێوان شێخ مەحمودو ئینگلیزەکان تەواو تێك چووبوو، بارودۆخی سلێمانی تەواو شڵەژا بوو ، پڕبووبوو لەسوارەی عەشایەرو چەکدارێکی زۆر لە کۆڵان و شەقامەکاندا دەهاتن و دەچوون ، ژمارەیەکی زۆر لەسەرۆك هۆزە کوردەکان لە دیوانی شێخ مەحمود کۆدەبوونەوە چالاکیەکی سیاسی نهێنی و ئاشکرا لە ئارادا بوو ، ڕەوشی

---

[115] ڕۆژی کوردستان : ژمارە (٧) ، ٣ / ١ / ١٩٢٣ ، محمد رسول هاوار : سمکۆ ئیسماعیل ئاغای شوکاك ، ل٥٨٣- ٥٨٤

[116] محمد رسول هاوار : سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شوکاك) ، ل ٥٨٤، ڕەمزی قەزاز : هەمان سەرچاوە، ل٣٧٣.

[117] صالح محمد امین : هەمان سەرچاوە ، ل٣٧٣ .

[118] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب١ ، ل١٣٨ .

سلێمانی تادەهات بەرەو خراپتر دەچوو ، بەڵام بەشی زۆری خەڵکەکەی ئاگایان لە هیچ نەبوو ، بەهۆی نەبوونی هیچ ئامرازێکی پەیوەندی لە جیهان دابڕابوون. وەك ڕەفیق حیلمی دەڵێت : "ئەوانەی لەو ڕۆژانەدا لە سلێمانی بوون ، لە عالەمێکی ترا ئەژیان و ئاگایان لە هیچ نەبوو" [119]. بێگومان لە حاڵەتێکی وەهاشدا لە تواناداا نابێت داوا لە خەڵکی بکرێت خوێندنەوەیەکی واقعیانەی بۆ ڕووداوو پێشهاتە سیاسیەکان هەبێت، هەر ئەمەش وایکرد کەوا خەڵکی سلێمانی بەگشتی تێڕوانینێکی زۆر سەیرو هەڵەیان لادروست ببێت ، سەبارەت بەهاتنی سمکۆو میوانداری کردنی لەلایەن شێخ مەحمودو حکومەتەکەیەوە ، دەنگ بڵاو بۆوە لە سلێمانیدا، شارەکە خرۆشاو جم و جۆڵێکی زۆری تێکەوتبوو ، خەڵکی وەك قارەمانێك لە سمکۆیان دەڕوانی و پێیان وابوو لەپێناوی مەسەلەی کورددا هاتووە بۆ سلێمانی و دەیەوێت شۆڕشەکەی خۆی لەگەڵ شێخ مەحموددا یەکبخات و پێکەوە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی بدەن [120]. تەنانەت د.(قاسملۆ) ش لای خۆیەوە هەمان بیروڕای دووبارە کردۆتەوە و نوسیویەتی "سمکۆ لەپێناوی یەکخستنی نەتەوەی کوردو یەکخستنی ئامانجەکانیان ساڵی ١٩٢٣ بەرەو سلێمانی هاتووە" [121]. بەم شێوەیە سمکۆ بەرەو سلێمانی هات ، تەنانەت لە سەرەتادا چووبووە نێو پشدەریەکان و لەوێوە لەگەڵ ژمارەیەك لە پیاوانی ئەواندا بەرەو سلێمانی هات، هەر ئەوکاتەش لە ڕێگاوە پەیوەندی لەگەڵ ئۆزدەمیر بەست ، ئەوەش کاتێك پشدەرییەکان ئەحمەدی حەمە ئاغایان نارده لای ئۆزدەمیر تاوەکو لە مەبەستەکانی سمکۆ دڵنیای بکەنەوە، کاتێکیش سمکۆ گەیشتە سلێمانی ،ئەحمەدی حەمەئاغا هەواڵی سەلامەتی خەسرەوی کوڕی بۆ هێناو

---

[119] یاداشت : ب٢ ، ل٩٣.

[120] ڕەفیق حیلمی : ب٣ ، ل٤٩ ، علاء الدین سجادی : هەمان سەرچاوە ، ل٢٦٠-٢٦١.

[121] اربعون عاما من الكفاح من اجل الحرية ، موجز من تاريخ الحزب الديمقراتی الكردستانی، ترجمة : د. عزالدین مصطفى رسول ، ج١ ، اربیل ، ١٩٩١ ، ل٢٤ .

کۆمەڵێك گفتو بەڵێنیشی لەزاری ئۆزدەمیرەوە پێ ڕاگەیاند[122] ، کەچی لە سلێمانیش بەر لەوەی سمکۆ بگاتە جێ، خەڵك سەرجەم لە چاوەڕوانیدا بوون، نیشتمان پەروەران بەهیوای ئەوە بوون بەم هاتنەی سمکۆ شێخ مەحمود لە تورك دور بکەوێتەوەو لە هەوڵی مەسەلەی سەربەخۆیی کورددابێت ، هەندێکیش ویستویانە شێخ مەحمودو سمکۆ هاوکاری بکەن بۆ دەرپەڕاندنی ئۆزدەمیر ئەمانەش بەپرۆگرامی ئینگلیز ئەم ویستەیان هەبووە[123] . بەڵام بەهەرحاڵ کەس لەچاوەڕوانی بێزار نەبووەو شەوێك پێش هاتنی سمکۆ بەو درەنگە هەڵبەستیان ڕێکخستەوەو ئاوازیان بۆ داناوە تاوەکو لە پێشوازی سمکۆدا خوێندکارانی ئامادەیی بەدەنگەوە بیڵێن ، ڕۆژی هاتنەکەش بە فەرمانی شێخ مەحمود فەرمانگەو دام و دەزگا ڕەسمیەکان دەوامیان نەبووەو دوکان و بازاڕ داخراوەو ماڵی (شێخ مستەفای نەقیب) بۆ سمکۆ ئامادەکراوە ، بەدرێژایی ڕێگاکان پاسەوان و خوێندکاران لە پێشوازیدا وەستاون، ئەمە جگە لەوەی شێخ قادرو ژمارەیەکی زۆر لە گەورە پیاوان ماوەیەکی زۆر لەشار دەرچوون بۆ پێشوازی سمکۆ ، تەنانەت شێخ مەحمودیش بە ئۆتۆمبیل بەرەو پیری چووە[124] .

لە سلێمانی پێشوازیەکی شاهانە لە سمکۆ کراوە و لەگەڵ هاتنیدا حەوت گوللە تۆپیش تەقێنراوە ، خەڵکی سلێمانیش لە ئەندازە بەدەر لەم هاتنەی ئاسودە بوون[125] .

سمکۆ خۆشی زۆر خۆشحاڵ بووە، سوپاس و پێزانینی خۆی پێشکەش بە حوکمدارو خەڵکی سلێمانی کردووەو دواتریش پاش چەند ساڵ لە زۆر کۆڕو کۆبوونەوەدا باسی لەو خزمەت و پێشوازیە کردووە ، تەنانەت

---

[122] عبد الرقيب يوسف ، سدیق ساڵح : بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمە ئاغای پشدەری ، ل٩٣-٩٤ .

[123] ڕەفیق حیلمی : یاداشت ، ب٣ ، ل٤٩ .

[124] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید : ل١٠٥-١٠٦ .

[125] ڕەفیق حیلمی : یاداشت ، ب٣ ، ل٥٠-٥١ .

ژنانی سلێمانیش لەم پێشوازیەدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە و ڕژاونەتە سەر شەقامەکان [١٢٦]. لێرەدا دەتوانین بڵێین ، ئەو هاتنەی سمکۆ ئەگەر بۆ مەبەستی کوردایەتی و یەکخستنی کوردیش نەبووبێت ، گەورەترین ڕۆڵی بینیوە لە زیاتر گەشاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی و وروژاندنی خەڵکدا.

کاتێکیش گەیشتنە سلێمانی و بارەکە ئاسایی بۆوە ، ئەوەندەی پێنەچوو بارودۆخی سیاسی شارەکە هێندەی دیکە جم و جۆڵی تێکەوت، ئۆزدەمیر وەفدێکی ڕەوانەکرد بۆ سلێمانی ، کە پێکهاتبوو لە (ڕەمزی بەگ و فەوزی بەگ) ئەمانە لای شێخ مەحمود بوون بەمیوان و کەوتنە گفتوگۆ ، ئینگلیزیش زۆر بە وردی ئاگاداری ئەوە بوو کە وەفدی تورك لە سلێمانیە ، بەڵام هیچ کاردانەوەیەکی خێرایان نەنواند [١٢٧].

بەم جۆرە ئەوماوەیەی سمکۆ لە سلێمانی بوو ڕێزێکی زۆری لێگیرا ، هەرچەندە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد خەڵکی زۆر هەڵە لەم هاتنەی گەیشتبوون ، وەك عەلائەدین سجادی باسی لێوەدەکات ، سمکۆ هەندێك ڕێو شوێنی حکومەتەکەی شێخ مەحمودی بەدڵ نەبووە ، بەتایبەتی هەڵسوکەوتی شێخ قادری بەباش نەزانیوە ، لەم بارەیەشەوە ، هەندێك ڕێنمایی شێخ مەحمودی کردووە ، کەنابێت لە کاروباری حوکمدارێتیدا ئاوڕ لە خزم و کەس بداتەوە، هەرکەسێکیش زیانی بە دەسەڵاتەکەی گەیاند واچاکە لەناوی بەرێت و چاو لە هەڵەیان نەپۆشێت [١٢٨].

ئەو کاتەی سمکۆ لە سلێمانی بوو ، پەیوەندیەکانی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا گەیشتە بن بەست و هیچ هیوایەك لە ئارادا نەما کە چاوەڕوانی باشی لێبکرێت ، سمکۆش کەلە ڕێگاوە پەیوەندی لەگەڵ ئۆزدەمیردا بەستبوو ، کاتێك لە سلێمانی جم و جۆڵی بەرچاوی تورکەکانی

---

[١٢٦] ڕۆژی کوردستان : ژمارە (٨) ، ١٠ / ١ / ١٩٢٣ ، درەخشان جەلال حەفید : هەمان سەرچاوە ، ل١٥٢ .

[١٢٧] ئەحمد خواجە : چیم دی ، ب١، ل١٤٧، ڕەفیق حیلمی : یاداشت ، ب٣ ، ل٥١-٥٢ .

[١٢٨] شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عیراق، ل٢٦٠-٢٦١ .

بینی هێندەی دیکە کەوتە سەر باوەڕی دژایەتی ئینگلیزو خۆنزیك خستنەوە لە ئۆزدەمیر ، بەلام جەمال نەبەز، ڕایەکی تایبەتی هەیەو لەم بارەیەوە باس لەوە دەکات ، کەسمکۆ لە سلێمانی بێ هودە هەوڵی ئەوەی داوە ئینگلیزو شێخ مەحمود ڕێکبخاتەوە و هەموو پێکڕا بەر بەبزوتنەوەی ئەتاتورك بگرن [129]. کە تەنها خۆی ئەم ڕایەی هەیەو ، هیچ سەرچاوەیەکی دیکە پشتگیری قسەکانی ناکات ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕۆڵیشی بینیوە لەوەدا کە شێخ مەحمود پەلەبکات لە هێنانی وەفدی ئۆزدەمیر بۆ سلێمانی بەمەبەستی گفتوگۆ کردن [130]. ڕەفیق حیلمی وەك کەسێکی بەشدار لە ڕووداوەکان ، بە ووردی باسی ئەوە دەکات ، چۆن لە نیوە شەودا پیاوەکانی شێخ مەحمود لەماڵ دەریان کردووەو بردویانەتە لای شێخ و لەوێ بەئامادە بوونی سمکۆ ، بەدرێژی باسی ئەوە کراوە، وەفد ڕێکبخرێت و بچێت بۆ ئەنقەرە بۆ بینینی کەمال ئەتاتورك و ڕێکەوتن لەگەڵ تورکدا [131]. بێگومان سمکۆ مەبەستی ئەوە بووە ، کەمالیەکان لەگەڵی ڕێکەون و کوڕەکەی ئازاد بکەن و پارەکانیشی بدەنەوە ، وێڕای ئەوەی بەڵێنیان پێدابوو کە بچێتەوە سەر سنوور یارمەتی ئەدەن بۆ دوبارە هەڵگیرسانەوەی شۆڕش لە کوردستانی ڕۆژهەلاتدا، بەلام درۆیان لەگەڵدا کردوو هیچ کۆمەك و یارمەتیەکیان نەداو کوڕەکەشیان ئازاد نەکرد [132].

دوای ئەوەی کە بارودۆخی سلێمانی گەیشتە ئەم حاڵەتە ، ئینگلیز لای خۆیەوە بڕیاری دابوو ئەم حکومەتەش بەدەردی ئەوەی پێشوو بەرێت بۆیە هیچ کاردانەوەیەکی خێرای دەرنەبڕی، لە سەرەتادا (چەپمەن) بڕیاریدا سلێمانی جێبهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ بەغدا [133] ، ئەو ڕۆژگارە بێ بەرنامەییەکی ئاشکرا لە ئارادا بوو چونکە شێخ مەحمود نەیدەتوانی

[129] کوردستان و شۆڕشەکەی ، ل١٥١ .

[130] بیرەوریەکانی ئەحمەد تەقی : ل٥٩ .

[131] یاداشت : ب٣ ، ل٥٧-٥٨ .

[132] صالح محمد امین : هەمان سەرچاوە ، ل٣٧١ .

[133] ئەحمەد خواجە : چیم دی ، ب١ ، ل١٤٧ .

ئاشکرا لە ئارادا بوو چونکە شێخ مەحمود نەیدەتوانی بەتەواوی خۆی یەکلایی بکاتەوە ، لەلایەکەوە ، وەفدی ڕێکدەخست بۆ ئەنقەرە ، لەلایەکی دیکەشەوە وەفدی دەنارد بۆ بەغداو داوای لە (چەپمەن) دەکرد، کاروباری کورد لە بەغدا ڕێکبخەن ، ئەم مەسەلەیە خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لە کورتبینی و بێ بەرنامەیی[١٣٤] .

هەر سەبارەت بەم مەسەلەیە، ڕۆژی کوردستان نوسینێکی تیا بلاوکراوەتەوە بەناونیشانی (تەخلیەی سلێمانی) کە ناوەڕۆکەکەی جوانترین گوزارشتە لە بێ سەرو بەریی و نەزانی دام و دەزگاو سیاسیەکانی کورد ، (نوسەر) دەپرسێت ئاخۆ ئینگلیزەکان بۆچی سلێمانیان چۆلکرد ، خۆ کەس هەڕەشەی لێنەکردوون تا سلێمانی چۆڵ بکەن ، ئاخۆ حکومەتی بەریتانیا بەرامبەر بەخۆی هیچ هێزێك شك ئەبا کەبەرگریەك بکانازانین چ نهێنیەك لەم چۆلکردنەی سلێمانیدا هەیە[١٣٥] . ئەم نوسینە لەکاتێکدا بلاو بۆتەوە ، وەفدی تورکی هاتووچۆی بوو لە سلێمانیدا ، بەگەرمی پڕو پاگەندەی ئەوە دەکرا کە بەم زووانە تورك دەگەڕێتەوە ، تەنانەت (چەپمەن) چاودێری خرابووە سەر ، لە ئاکامدا ئینگلیزەکان لە ڕۆژی ٢٣ ی شوباتی ١٩٢٣ دا بەفڕۆکە بەیاننامەی بەسەر سلێمانیدا بەردایەوەو ، داوایان لە سمکۆ کرد ، سلێمانی جێ بهێڵێت چونکە ، ئەوان بۆردومانی دەکەن ، با زیانی پێنەگات[١٣٦] ، هەربۆیە سمکۆ لە ڕێکەوتی ٢٨ ی شوباتی ١٩٢٣ دا سلێمانی جێ هێشت[١٣٧] ، پاش ئەوەی ماوەی مانگێك و بیست ڕۆژ لە سلێمانیدا مایەوە[١٣٨] . کاتێکیش ڕۆیشت (ڕەشید جەودەت) ی لەگەڵ خۆیدا ی برد وەك ڕاوێژکار[١٣٩] .

---

[١٣٤] یاداشتەکانی شێخ لەتیف : ل١٠٩ .

[١٣٥] ژمارە (١٥) ، ٣ / ٣ / ١٩٢٣ .

[١٣٦] ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل٣٨٤ .

[١٣٧] محمد رسول هاوار : سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شوکاك) ، ل٥٩٣ .

[١٣٨] سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٠٥ .

[١٣٩] ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل٣٨٤ .

بەم شێوەیە سمكۆ سلێمانی جێ هێشت ، بێ ئەوەی هیچ ئاكامێكی باش لەم سەفەرەی بكەوێتەوە ، هێندە نەبێت ئاشنایەتیەكی زیاتر ، لە نێواندا دروست بوو ، جگە لە بەگوڕكردنەوەی هەستی ناسیونالستی خەڵكی شارەكە ، وێڕای ئەوەی كەلە بنە ڕەتدا لێك گەیشتن و نزیك بوونەوە، لەنێوان ئەو دوو سەركردەیە دا كارێكی ئاسان نەبوو ، سمكۆ زیاتر سەركردەیەكی خێڵەكی كۆچەر بوو ، چەكدارەكانیشی لە هۆزەكەی خۆی بوون ، لەكاتێكدا شێخ مەحمود مرۆڤێكی شارنشین و پەروەردەی شار بوو ، وێڕای ئەوەی كەسێكی ئایینی و خاوەن زەوی و زارو دەرەبەگ بوو [١٤٠].

كاتێكیش ڕۆیشت و سلێمانی جێ هێشت ، لە نێو پشدەریەكاندا ، وتبووی "شێخ مەحمود بۆ سەركردایەتی كورد دەست نادات، لەسەر بیروڕایەك جێگیر نیەو نازانێت چ بڕیارێك دەدات و چی دەكات"[١٤١].

لە كۆتاییشدا پێمان وایە شێخ مەحمود لە ئاست گۆڕانكاری و ڕوداوە سیاسیەكانی سەردەمی خۆی نەبوو، نەشی توانی تاسەر پەیڕەو لە سیاسەتێكی جێگیر و دیاری كراو بكات، هەرچەندە ئینگلیزەكانیش بە هیچ شێوەیەك لەگەڵیدا ڕاستگۆ نەبوون، بەڵام بەهەر حاڵ شەڕ و ململانێكانی شێخ مەحمود لە بەرژەوەندی كورددا نەبوو. هەرچی (سمكۆی شكاك)یش بوو ئەوا ئەوكاتەی ڕووی كردە سلێمانی زۆر جیاواز بوو لەو سمكۆیەی لە سەرەتاوە گەورەترین شۆڕشی لە كوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بەرپا كرد، چونكە دوای دەرپەڕاندنی لە ئێران بە تەواوەتی ڕوخاو هیچ باوەڕێكی نە بەخۆی و نە بە كورد نەمابوو، بەڵكو دوای ئەوەی سلێمانی جێهێشت و چۆوە سەر سنوور، چاوەڕوانی ئەوەبوو كەمالیەكان هاوكاری بكەن بۆ دەست پێكردنەوەی شۆڕش.

---

[١٤٠] مجتبی برزویی: أوضاع سیاسی كردستان ، (ازسال ١٢٥٨تا ١٣٣٥ هـ . ش ) چاپ اول، تهران، ١٣٧٨، ل١٨٦ .

[١٤١] عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسول پشدەری : یادداشتەكانم ، بەغداد، ١٩٩٢، ل٣١-٣٢ .

# باسی سێیەم
# بیرو بلوەڕی سیاسی لە شاری سلێمانیدا

سەبارەت بە بیرو باوەڕی سیاسی و هاتنە کایەی ڕەوتی فیکری جیاواز لە سلێمانی دا، دەتوانین سەرەتاکانی ئەم دیاردەیە بگێڕینەوە بۆ سەردەمی هاتنە سەر کاری کۆمەڵەی (ئیتحاد و تەرەقی) و پێکەوە نانی لقێکی ئەم کۆمەڵەیە لە سلێمانی ، وەك لە بەشەکانی پێشتردا ئاماژەمان پێکرد ، نەیارانی بنەماڵەی شێخان و خودی شێخ سەعیدی حەفید ، لە بازرگانەکان و ئەفسەرانی نێو سوپای عوسمانی و کەسانی دیکەش لەم لقەدا کۆبوونەوە[١٤٢] ، بەمەش یەکەم دابەش بوونی سیاسی لە نێو سلێمانیدا ڕوویدا ، کە دواتر بەکارە ساتی کوژرانی شیخ سەعیدی حەفید لە موسڵ دا زیاتر پەرەی سەند .

بەڵام لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم دا ، سلێمانی پێی نایە سەردەمێکی نوێوە و بەهاتنی ئینگلیز بۆ شارەکە ، زیاتر مەسەلە سیاسیەکان بەر جەستە بوون ، هەر چەندە خەڵك لە سەرەتادا بە شێوەیەکی ڕەمەکی خوازیاری هاتنی ئینگلیز بوون ، بە شێکی زۆریان مەبەستی سەرەکیان ڕزگار بوون بوو لەو برسێتی و قات و قڕییەکەی سالآنی جەنگی جیهانی[١٤٣] ، ئەمەش وایکرد کە تاساتە وەختی تێکچوونی یەکەمین حوکمدارییەتی شێخ مەحمود و بەدیل گرتنی خۆی مەسەلەی ئینگلیز خوایی، لە هەموو بۆ چونەکانی دیکە زاڵتربێت[١٤٤] ، بەڵام بە مەبەستێکی نیشتمانیەوە چونکە دوای نەمانی حوکمڕانی عوسمانیەکان لەم وڵاتە ، خەڵکی تا ماوەیەکی زۆر لە ژێر ئالآی شێخ مەحمودا کۆبونەوە و بیریان لە یەکلایی کردنەوەی ململانێکانی پێش سالآنی جەنگی جیهانی نەدەکردەوە، هەستە نیشتمانیەکەش کە تازە سەری هەڵدا بوو وای کردبوو کەس لەوە نە پرسێت

---

[١٤٢] کەمال ڕەئووف محمد : جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی عوسمانی لقی سلێمانی ، کوردستانی نوێ ، ژمارە (١٤٨٦) ، ١٩٩٧/١/٣٠ ، (١٤٨٧ ، ١٩٩٧/١١/٢ .

[١٤٣] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ، Med TVسازی کردووە .

[١٤٤] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمود قارەمان ، ب ٢ ، ل٣٥٩-٣٦٠ .

ئاخۆ پێشەوای ئەم ڕاپەڕین و شۆڕشانە کێن[١٤٥] .هێندە نەبێت ، ژمارەیەکی کەم کۆنە مووچە خۆر و خانە نشینی سەر دەمی عوسمانیەکان لەسلێمانی دا هەبوون ، ئەمانە ئینگلیزیان بە غەیرەدین و کافر لە قەڵەم دەدا کە نابێت شوێن دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی موسڵمان بگرێتەوە.[١٤٦]

بەڵام کاتێك مەبەستی ڕاستەقینەی ئینگلیز بە دیار کەوت دوای تێکدانی دەسەڵاتەکەی شێخ مەحمود و دوور خستنەوەی خۆی ئینجا خەڵکەکە بەرەبەرە لەئینکلیز دەکشانەوە وهیچ هیوایەکیان پێیان نەدەما[١٤٧] ، ئەم هەستەش ڕۆژلە دوای ڕۆژ زیاتر تەشەنەی دەکرد ، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیز بوون بەحوکمڕانی ڕەهای کوردستان و کەوتنە ئازاردانی خەڵکی، ئەمەش وای کرد لایەنگیری تورك بکەن ، کاتێك ئۆزدەمیرو دەستەکەی گەیشتنە ڕەواندوز و کەوتنە پڕوپاگەندە ، تەنانەت ڕەفیق حلمی لە باسی ئەو سەردەمەدا دەڵێت "خەڵك بۆ ڕزگار بوون لە حوکمی ئینگلیز و لە جەوری دەست و پێوەندە سوك و بێ شەرمەکانیان دەستیان ئەدایە هەموو دوژمنێکی ئینگلیز ، پەنایان ئەبردە بەر شەیتان "[١٤٨]

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ، خەڵکە نیشتمانپەروەرە کە بە قەناعەتەوە ، نەدەچوونە پاڵ تورك ، دەشیان زانی تورك سەر بەخۆیی بە کورد نادات ، بەڵام تەنها بۆ دوژمنایەتی ئینگلیز ئەم هەنگاوەیان دەنا، وێڕای سۆزە ئایینەکە[١٤٩] .

لەم سەردەمەدا واتە دوای ئاوارە کردنی شێخ مەحمود ، نەك تەنها ئەو خەڵکە ڕەشۆکی وکۆنە موچە خۆرانی عوسمانی ببوون بە تورکخوا ، بەڵکو

---

[١٤٥] د. جسن جاف : ئەم قسانە بەم پێوانە باویان نەماوە ، بەغدا ١٩٩٦ ، ل ١٢ .

[١٤٦] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمود قارەمان ، ب ٢ ، ل ٣٨١ .

[١٤٧] ڕەفیق حلمی :یادداشت ، ب ٣ ، ل١٩ .

[١٤٨] یادداشت،ب٢، ل٥١.

[١٤٩] بیرەوەریەکانی ئەحمد تەقی: دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود وسمکۆ، ١٩٩٨، ل ٥٧.

هەندێك لە ڕوناكبیرانیش هەمان بۆ چوونیان لادروست ببوو، بە هەڵە بە شان و باهۆی توركیاندا هەڵدەدا ، تەنانەت گەر كەسێك لەگەڵ ئەم ڕەوتەدا نەبوایە بە خاین لە قەڵەم دەدرا [١٥٠] .

ئەمە جگە لەوەی كە ڕوناكبیران و نیشتمان پەروەرانی ئەوسەردەمە لە سلێمانیدا ، هیچ ئاگایەكیان لە كوردەكانی باكوور نە بوو نەیان دەزانی كەمالیەكان چ كارێك بەكوردەكان دەكەن، ڕۆشنبیرانی باكووریش هیچ هەوڵێكیان نە دەدا بۆ پەیوەندی كردن لەگەڵ كوردەكانی باشووردا [١٥١] .

لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە ، كە ڕەوتی توركخوایی لە سەر دەمی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ئینگلیزدا زیاتر تەشەنەی سەندو تا دەهات زیاتر بەهێز دەبوون ، كاتێكیش ئینگلیز لەژێر فشاری ڕووداوە نێو خۆیی و دەرەكیەكاندا ، ناچار بوو شێخ مەحمود لە مەنفاوە بگێڕێتەوە و دووبارە ڕێگای پێبدات حكومەت پێكەوە نێت ، توركخواكان هەر لە ڕێگاوە پەیوەندیان لەگەڵ دا بەست و لەم سەردەمەدا هێندەی دیكە باسكیان بەهێز بوو ، بە شێوەیەك هەڕەشەیان لە نیشتمان پەروەران دەكرد، كەسێك باسی نیشتمان و حكومەتی كوردی بكردایە ئەوان بە نەیاری خۆیان دەزانی و بە هەمان چاوی پیاوی ئینگلیز لێیان دەڕوانی كەتا ئەو كاتەش بەدەر لە وانەی سیخوڕ و بەكرێگیراوی ئینگلیز بوون ، هێشتا ژمارەیەكی كەم خەڵكی ڕوناك بیر و نیشتمان پەروەر مابوون باوەڕیان بە ئینگلیز بێت ، بە تایبەتی دوای ئەوەی (مستەفا پاشای یامولكی ) گەڕایەوە بۆ سلێمانی ، ڕێبەرایەتی ئەم دەستەیەی دەكرد ، لەو ڕۆژانەشدا هەر ئەو مابوو بوێری بەئاشكرا قسە بە توركخواكان بڵێت و لەسەر لاپەڕەكانی ( بانگی كوردستان ) سوكایەتیان پێبكات [١٥٢] ، ئینگلیزەكانیش بەر لە كشانەوەیان ڕێگایان پێدا (جەمعیەتی كوردستان)

---

[١٥٠] ڕەفیق حلمی :یادداشت ، ب ٢ ،ل١٤٦.

[١٥١] سەرچاوەی پێشوو،ب٢ ، ل١٥٠ .

[١٥٢] سەرچاوەی پێشوو ، ب ٢ ، ل ٦ .

دروست بکات و ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان ) بڵاو بکاتەوە[153] ، پێشتر دوای هاتنەوەی بۆ سلێمانی پێیان ڕاگەیاندبوو نابێت لە سلێمانیبچێتە دورەوە بێ پرس[154] .

بەڵام وەك ئاماژەمان پێکرد بە هاتنەوەی شێخ مەحمود تورکخواکان یەکجار بەهێز بوون، ئەمانە سودیان لەو پیاوە ئاینی و خەڵکە دواکەوتوەش وەرگرتبوو بۆ زیاتر پاڵپشتی کردنی خۆیان و تا دەهات زیاتر تەنگیان بە ئینگلیزخواکان و ئەو ڕوناکبیر و نیشتمانپەروەرانەش هەڵدەچنی کە بڕوایان نە بە رتوك و نەبە ئینگلیز هەبوو[155] .

ململانێی ئەو سەردەمە بە ململانێی نێوان تورکخواکان و منەوەرەکان لە قەڵەم دراوە، بێ‌ئەوە هیچ ئاماژەیەك بۆ بوونی پارت و ڕێکخراوی تایبەت بەم دوو دەستەیە بکرێت، تەنها (شێخ لەتیف حەفید ) نەبێت ، لە یادداشتەکانیدا ، باس لەوە دەکات کە دوو پارت لەسلێمانیدا هەبوون لەو ڕۆژگارەدا، ئەوانیش بریتی بوون لە (پارتی نیشتمانی کوردی)، کە مەبەست لە دەستەی منەوەرەکانە و گوایە داوای دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیان دەکرد کە پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزدا باش بێت ، ئەمانە بە گوتەی شێخ لەتیف، لە بازرگان و ژمارەیەك ئەفسەرو منەوەری سەردەمی تورك و ئینگلیز پێکهاتبوون کە لە سیاسەتدا ئیشیان کردبوو .

دەستەی دووەمیش بریتی بوون لە ( پارتی ئیسلامی کوردی ) ، لێرەدا مەبەستی تورکخواکانە کە دژ بە ئینگلیز بوون و ویستویانە لەگەڵ تورکدا ڕێکەون بەمەرجێك دان بەسەر بە خۆیی کورددا بنێت، ئەندامانی ئەم پارتە لە

---

[153] سەرچاوەی پێشوو ، ب ٥، ل٦٩-٧٠ .

[154] هاوار : حاجی مستەفا پاشای یامولکی و سمایل خانی شوکاك (سمکۆ ) ، گۆڤاری مامۆستای کورد ، ژمارە (٨) ، سوید ،١٩٨٩-١٩٩٠ ، ل٢٦ .

[155] أ. ب. هەوری : هەمان سەرچاوە ، ل٢٩ .

پیاوانی ئاینی و عەشایەرو دۆستانی شێخ مەحمود و ژمارەیەك ئەفسەری کوردی نێو سوپای تورك پێکهاتبوون[١٥٦].

پێمان وایە ، لێرەدا شێخ لەتیف راستی نەپێکاوە ، کاتێك ، نوسیویەتی ( پارتی ئیسلامی کوردی) ویستویانە لەگەڵ تورك رێکەون ، بەمەرجێك سەر بەخۆیی کورد بدات،چونکە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد تورکخواکان ، نەك داوای سەربەخۆییان نەدەکرد، بەڵکو ئەوەی باسی نیشتمان پەروەریشی بکردایە بە دوژمنیان دەزانی ، هەڕەشەیان لێدەکرد ، بەلام پێدەچێت شێخ لەتیف ئەم رایەی لە ژێر کاریگەری ئەوەدا دەربڕیبێت کە بە شێکی زۆری تورکخواکان ، لەبنەماڵەی شێخان بوون یا سەر بەوان بوون ، بۆیە ناو براو نا چاربووە ، ئەم بۆ چوونە دربڕێت.

تەنانەت بەپێی هەواڵێك کە لە بانگی کوردستاندا بلاو بۆتەوە ، تورکخواکان لەنێو خۆیاندا کۆمەڵێکی نهێنیان پێکهێناوە و هەستاون بە داگرتنی ئالای کوردستان کە لەسەر دەمی دووەم حکومداریەتی شێخ مەحموددا هەڵکرابوو[١٥٧]، کە ڕەسوڵ هاوار بە دڵنیایەوە دەڵێت " ئەمانە بەیداخی تورکیان لە شوێنی بەیداخی کورد هەڵکردووە "[١٥٨].

ململانێی نێوان ئەم دوو دەستەیە ، واتە (تورکخواکان )و (نیشتمان پەروران ) تەنها لە بواری سیاسیدا نەبوو ، چونکە تورکخواکان مەلاو پیاوە ئاینییە دوا کەوتووەکانیشیان بەپاڵپشتی خۆیان دەزانی ، هەر بۆیە ئەو رۆژگارە ، گەر کەسێك باسی لە زانست و پێشکەوتنیش بکردایە، بەکافر لە قەلەم ئەدرا و دەکەوتنە دژایەتی کردنی[١٥٩].

کاتێك (بانگی کوردوستان ) هێشتا بەردەوام بوو لە دەرچوون ، کەم و زۆر لە سەر لاپەڕکانی هەست بەوە دەکرا کە ئاخۆ ، جەماوەری سلێمانی چەند

---

[١٥٦] یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید ، ل ٧٨-٧٩ .

[١٥٧] بانگ کوردستان : ژمارە (٩) ،١٩٢٢/١٠/٨.

[١٥٨] شێخ مەحمودی قارەمان ؛ ب١ ، ل٢٩١ .

[١٥٩] سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٣٦

دەستەو تاقمی تێدایە، لەم بارەیەوە ژمارە (٥) ی ئەم ڕۆژنامەیە بابەتێکی بڵاوکردبۆوە بە نێوی (مجادەلەی ئەفکار)، لەم نوسینەدا هەست بەوە دەکەین لەپاڵ دوو دەستەکەی پێشوودا، دەستە بازرگانە خاوەن بەرژەوەندیەکانیش هەبوون ، قورسایی خۆیان هەبووە، وێڕای کۆمەڵێك لەوانەی هەقیان بەسەر هیچەوە نییە و، سەرقاڵی بەرژەوەندیەکانی خۆیانن لە هەموو سەر دەم وزەمانێکدا[١٦٠].

سەردەمی دووەمین حکومداریەتی شێخ مەحمود ، سەردەمی بەهێز بوونی (تورکخواکان) بوو ، پلەو پایەی بەرزیان لەو دام و دەزگایەدا هەبوو، کاریگەریان زۆر بوو شێخ مەحموودیش لەم نێوانەدا نەی دەزانی چی بکا، خۆی بۆ یەکلایی نەدەکرایەوە، ئینگلیزەکان هیچ بەڵێنێکیان پێ نەدەدا، تورکخواکانیش لەو ڕۆژانەدا دەسەڵاتیان هەبوو، شێخ مەحمود نەی دەتوانی هەر وا بە ئاسانی دوریان بخاتەوە ، چونکە هێشتا دەمارگیری ئاینی و پەیوەندی کۆنینەی کورد و عوسمانی و خەلافەتی ئیسلامی پاشماوەکانی مابوو، ئەمانەش جڵەوی خەڵکی ساویلکەیان بە دەستەوە بوو ، ژمارەشیان کەم نەبوو، بۆیە شێخ مەحمود نەی دەتوانی لە داوی ئەمانە ڕزگاری بێت[١٦١] ، هەر بۆیە شێخ مەحمود کەوتبووە ژێر کاریگەریانەوە ، لە بەرامبەریشدا (مستەفا پاشای یاموڵکی )* کەوەزیری مەعاریف بوو، لەماڵەکەی خۆیدا،

---

[١٦٠] بانگ کوردستان : ژمارە ( ٥) ١٩٢٢/٩/٤ .

[١٦١] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ٢، ل٣٥٩ .

* مستەفا پاشا کوڕی عەزیز یاموڵکی مەلازادەیە، لە عەشیرەتی (بڵباس)ە، ساڵی ١٨٦٦ لە سلێمانی لەدایك بووە، لە بەغدا ئامادەیی سەربازی خوێندووە، دواتر چۆتە ئەستەمبوڵ بۆ تەواو کردنی خوێندن دوای تەواو کردنیشی ماوەیەك کۆنسوڵ بووە لە (خوی و سەڵماس)پاشان گوازراوەتەوە بۆ (سنە و قارس)، دوای ئاگربەستی ١٩١٨ بوو بە ئەندامی دادگای عورفیی سەربازی و پاشان بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنێکی سەربازی بۆ دادگایی کردنی (کەمال ئەتاتورك)و هاوڕێکانی، هەر ئەو سەردەمەش بە غیابی فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ (کەمال ئەتاتورك)دەرکرد.(میر بصری: هەمان سەرچاوە، ل٧٠-٧١).

دەست بە سەر کرابوو ، شێخ پیاوەکانی خۆی ڕاسپاردبوو ، کەهات بۆ لای بڵێن شێخ مەحمود نوستووە[١٦٢] .

هەر ئەو ڕۆژگارەش بوو و بۆ چاو ترساندنی نیشتیمانپەروەران و ڕوناکبیران ، کەسایەتییەکی وەك (جەمال عیرفان ) لە ڕێکەوتی ١٢ / ١٣ ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢ دا لەماڵەکەی خۆیدا تیرۆر کرا[١٦٣] ، کەپێمان وایە ئەمە یەکەم تیرۆری سیاسیە لەسلێمانیدا ڕوو بدات ، سەبارەت بە کوشتنی (جەمال عیرفان ) قسە زۆر کراوە و ، چەند ڕایەکی باو هەیە ، هەندێك پێیان وایە، (جەمال عیرفان ) بە دەستی پیاوانی عەشیرەتی پشدەر کوژراوە[١٦٤] ، ئەم ڕایە زۆر لاوازو بێ بناغەیە کەسانێکی دیکە هەن ، ئەم مەسەلەیە دەدەنە پاڵ ئینگلیزخواکان[١٦٥] ، بەڵام ڕایەکی هەرە باوو جێ باوەڕ ئەوەیە کە دەڵێت ، (جەمال عیرفان ) بەدەستی تورکخواکان ، کوژراوە[١٦٦] .

لێرەدا دەتوانین بڵێین ، کەوا کوشتنی (جەمال عیرفان ) پیلانێکی تورکخواکان بوو ، بە دەست خۆشانەی پیاوانی ئاینی و مەلاکان ، چونکە (جەمال عیرفان ) وێڕای ئەوەی کەسێکی نیشتمانپەروەربوو لە هەمان کاتدا، مرۆڤێك بوو تا دوا ئەندازە ڕوناکبیر بوو، لەڕوناکبیرانی دیکەش زیاتر دیار و بەرچاو بوو .

ڕایەکی دیکە هەیە شێخ مەحمود تاوانبار دەکات بەکوشتنی (جەمال عیرفان )[١٦٧] ، بەڵام شێخ مەحمود کەسێکی پیاو کوژ نەبوو ، پێناچێ هەرگیز بە بڕیاری ئەو (جەمال عیرفان) تیرۆر کرابێت[١٦٨] ، بەڵام لە سەردەمی شێخ

---

[١٦٢] ڕەفیق حلمی :یادداشت ، ب٢، ل ٩٦ .

[١٦٣] ڕۆژی کوردستان : ژمارە (٥) ١٩٢٢/١٢/٢٠ .

[١٦٤] سیامەند: ڕوناکبیرو سیاسەتمەداری کورد جەمال عیرفان ، گۆڤاری (ڕێبازی خوێندکاران )، ژمارە (٣٠)،١٩٩٨ ،ل٥٥.

[١٦٥] جلال طالبانی : هەمان سەرچاوە ، ل ٥٨ .

[١٦٦] هەڵۆ: ڕونکردنەوەیەك دەربارەی هەندێ لەباسەکانی چیم دی ، گۆڤاری بەیان ، ژمارە (٥) ١٩٧١ ، ل٣٧-٣٨ .

[١٦٧] ئدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل٢٥٧ .

[١٦٨] چاوپێکەوتنی لەگەڵ (کەریم زەند ) ، ڕێکەوتی ٢٠٠٠/١١/٢١ .

مەحموددا بوو، کاربەدەستانی حکومەتەکەشی هەوڵ و تەقەلایەکی بەهێزیان نەخستە کار بۆ دۆزینەوەی بکوژەکانی[١٦٩] .هەرچەندە شێخ مەحمود خۆی (جەمال عیرفان) ی بە پیاوی ئینگلیز لە قەڵەم دەدا[١٧٠] .

ئەم ڕوداوە کاریگەریکی گەورەی هەبوو بۆ سەر دەروونی نیشتمان پەروەران و ڕوناکبیران بەتایبەتی و سەرجەم دانیشتوانی سلێمانی بە گشتی، خەڵکەکە سەر سام بووبوون ، تەنانەت تاماوەیەکی زۆر ئەم ڕووداوە ببوە بابەتی گفتوگۆی کۆڕو کۆبوونەوەکانی سلێمانی ، هەندێك کەس زۆر خەمبار بوون بۆ تیرۆر کردنی (جەمال عیرفان) بەپێچەوانەوە کەسانێکیش هەبوون ئەو مەسەلەیەیان پێخۆش بوو بەڵام ڕووناکبیرانی سلێمانی مەترسیەکی زۆریان هەبوو کەوا ئەوانیش هەمان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت[١٧١] .

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بکەین ، ئەو دەستەیەی بە ئینگلیزخوا لە قەڵەم دەدران، ناشێت بە خاین و بەکرێ گیراو لە قەڵم بدرێن، ئەوانەی لێ دەرچێت کە سیخوڕو دەست و پێوەند بوون ، چونکە ئەو سەر دەمە ، بەشێکی زۆر لەوانەی بە پیاوی ئینگلیز لە قەڵم دەدران، بریتی بوون لەو دەستەیەی کەدەیان ویست شێخ مەحمود لە تورك دوور بخەنەوە و ڕابردووی دەسەڵاتی تورکیان بیر دەخستەوە و ، ئەوانە پێیان وابوو بەشێت کورد تا شوێنی خۆی قایم دەکات پشت بە ئینگلیز ببەستێت و هاوشانی ئەو هەنگاو بنێت و بەپێی سیاسەتی دنیا هەڵسوکەوت بکرێت ، بەڵام تورکخواکان لای شێخ مەحمود بە هەموو شێوەیەك دژی ئەمانە دەدوان[١٧٢] ، هەرچەندە ئەوانەی سەر بە ئینگلیز بوون بیر و ڕایان هەرچی بووبێت لە چوارچێوەی

---

[١٦٩] هەڵۆ : هەمان سەرچاوە ، ل٣٨ .

[١٧٠] عەبدول ڕەقیب یوسف ، صدیق صالح : بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمەئاغای پشدەری، ل١١٣ .

[١٧١] هەڵۆ : هەمان سەرچاوە ، ل٣٨ .

[١٧٢] ڕەمزی قەزاز : هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٩-١١٠ .

کوردایەتی نەچووبوونە دەرەوە ، بەڵکو پێیان وابوو دەبێ هەموو شتێك لە پێناوی چاکەی کوردبێ[١٧٣] .

بە نەمانی دەسەڵاتی شێخ مەحمودو دەر پەڕاندنی ( ئۆزدەمیر ) لە ڕەواندوز، (تورکخواکان) ئەو باوی جارانیان نەما وڕویان لە کزی دەکرد[١٧٤]،هەر چەندە لە سەر دەمی سێهەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمودیشدا هێشتا ئەو پۆلێنە سیاسیە لەسلێمانیدا لە ئارادا مابوو[١٧٥] . تا کێشەی (ویلایەتی موسڵ) یش یەکلایی نەبووبۆوە ، هێشتا ژمارەیەك لە ڕوناکبیران،چاویان لە بەریتانیا بوو کورد ڕزگار بکات[١٧٦] .

بەڵام دوای یەك لایی بوونەوەی ئەو کێشەیە و دەرکەوتنی نیازی ڕاستەقینەی ئینگلیزەکان، ڕەوتی نیشتمانپەروەری ، زاڵبۆوە و جموجۆڵی کوردایەتی بە گوڕو تینێکی نوێوە هاتەوە مەیدان.[١٧٧]

---

[١٧٣] کۆنتفرید یوهانز میولەر: لە ڕۆژهەڵاتی گڕگرتوودا، وەرگێڕانی: بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر،١٩٩٢، ل٤-٥.

[١٧٤] د. کمال مەزهەر :خێرو بێری ڕاپۆرنوسێکی کورد ، ڕەنگین ژمارە (٩٢) ، ١٩٩٦ ،ل ٧ .

[١٧٥] امید استقلال : ژمارە (١٠) ، ١٩٢٣/١١/٢٢ .

[١٧٦] د. کمال مەزهەر پێشەکی ژیانەوە ، ل١٤ ،

[١٧٧] د. کەمال مەزهەر : کورد لە دروشمی ڕژێمی پاشایەتیدا، ڕەنگین ژمارە (١١٠)، ١٩٩٨، ل ١٠ .

# بەشی چوارەم
# سلێمانی لەسالآنی دەسەلآتی هەردوو حکومەتی بەریتانیو عیراقیدا(١٩٢٥-١٩٣٢)

## باسی یەکەم: سلێمانی و کێشەی ویلایەتی موسڵ

١-بارودۆخی سلێمانی دوای گەڕانەوەی ئیدارەی بەریتانیا

٢-هاتنی لیژنەی ( کۆمەڵەی گەلان ) بۆ سلێمانی

## باسیدووەم:کۆمەڵەو رێکخراوە سیاسیەکانی سلێمانی

١-کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان

٢-جەمعیەتی زمردەشتی

٣- لقی کۆمەڵەی خۆیبیون لە سلێمانی

## باسیسێهەم:راپەڕینی شەشی ئەیلولی ساڵی١٩٣٠

١-هۆکارەکانی را پەڕینەکە

٢-را پەڕینی بەردەرکی سەرا

# باسی یەکەم
# سلێمانی و کێشەی ویلایەتی موسڵ

## ١- بارودۆخی سلێمانی دوای گەڕانەوەی ئیدارەی بەریتانیا:

پاش ئەوەی هێزەکانی حکومەتی عێراق توانی بە پاڵپشتی ئینگلیزو هێزی لیڤی لە ڕێکەوتی ١٩تەمموزی ١٩٢٤ دا بێ هیچ بەرگریەك دەست بەسەر سلێمانیدا بگرێ، لەم هێرشەدا بۆ یەکەم جار یەکەمین فەوجی سوپای عیراق هاتە ناو سلێمانی کە ناوی فەوجی(موسی الکاظم ) بوو[١]. بەم شێوەیە سەرجەم دام و دەزگاکانی حکومەتەکەی شێخ مەحمود هەڵوەشایەوەو هەموو شتێك کۆتایی هات و سلێمانی بوو بەیەکێك لە چواردە لیواکەی عێراق[٢].

ئینگلیزەکان لەگەڵ هاتنەوەیاندا هاوشانی هێزەکانیان (کاپتن چاپمان ) و (ئەحمە بەگی تۆفیق بەگ ) یان لەگەڵدا بوو، کە گەیشتنەوە ناو شار دەست بەجێ (چاپمان ) یان کرد بە لێپرسراوی ئیدارەی شارەکە ، لە سەرەتادا بەشێکی زۆری سوپاکەیان لەدەوروبەرو نزیك بە چیای (گۆیژە ) چادریان هەڵدابوو، کە شەوانە لەلایەن پیاوەکانی شێخ مەحمودەوە دەدرانە بەر تفەنگ، چونکە

چەکدارەکانی شێخ مەحمود لە دەورو بەری شاخەکە خۆیان حەشار دابوو[٣].

ماوەیەك دوای هاتنی هێزەکانی حکومەت بۆ سلێمانی، ئینجا وردە وردە ئەو خەڵکەی سلێمانیان بەجێ هێشتبوو دەگەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان، هێندەی پێنەچوو لە کۆتایی ئەو ساڵەدا دوو بارە ژمارەی

---

[١] چاو پێکەوتنێك لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمد کە تەلەفزیۆنی میدیا Med .TV لەگەڵیا ساز کردبوو

[٢] عبد الرزاق الحسني : تاریخ الأحزاب السیاسیة العراقیة ، بیروت ، ١٩٨٣ ، ل ٨٩.

[٣] کشف القناع عن بعض الوقائع العراقیة ، مذکرات عبدالعزیز یاملکی فی العراق ، بغداد، ١٩٥٧ ، ل ٢٠-٢١ .

ئینگلیزەکانیش لای خۆیانەوە ئەو ڕۆژگارە زۆریان لامەبەست بوو سلێمانی بێدەنگ بکەن و لەناوچەکانی دیکەی کوردستانی دابڕن، تەنانەت ئەو هەنگاوەش کە (عبدالمحسن السعدون) هەڵینا لە سەردەمی سێهەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود دا بەوەی کە بەشی زۆری قەزاو ناحیەکانی لە سلێمانی دابڕی تەنها بۆ ئەوە بوو ڕووداوەکانی ئەو شارە هیچ کاریگەریەکیان بەسەر دەوروبەری خۆیانەوە نەبێت ، چونکە ئەوکاتە تاکە کێشەیەك کە لەناوچە کوردنشینەکاندا ڕووبەڕووی وەزارەتەکەی سەعدوون دەبۆوە کێشەی کوردەکانی سلێمانی بوو[7].

لەم پێناوەشدا ئینگلیزەکان هەموو هاوکاری و پاڵپشتیەکی حکومەتی عێراقیان دەکرد، بەمەبەستی جێگیر کردنەوەی ئیدارەو دەسەڵات لە شارەکەدا، ئەوکاتە شێخ مەحمودیش دوورکەوتبۆوەو تا دەهات توشی نوشوستی دەبوو، دەرامەتیکەم دەبۆوەو هاوکارەکانیشی لێی دادەبڕان، زۆرکەس هیچ ئومێدیان بەشۆڕشی کورد نەمابوو.

حکومەتی عێراقیش هیچ ئاوڕێکی لە چاککردنی بارودۆخی شارەکە نەدەدایەوە ، هەر لەهەوڵی ئەوەدابوو کەزیاتر لە ڕووی سەربازیەوە کۆنترۆڵی بکات. بۆ ئەم مەبەستە جارێکی دیکە (عبدالمحسن السعدون) لە دووهەمین وەزارەتیدا لە ٢٤ ی ئەیلولی ١٩٢٥ دا پێشنیاری پێکهێنانی هێزێکی تایبەتی کرد کە لە (٢٥٠) پۆلیس پێك بێت ، بۆ سەرکوت کردنی هەر نارەزایی و هەڵگەڕانەوەیەك کە لە سلێمانی و دەوروبەریدا سەرهەڵبدات .هەربۆیە بەپێی ڕەزامەندی نوێنەری باڵای بەریتانیا ( هنری دۆبس ) ، ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق لە ٧ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ دا ڕەزامەندیان نیشان دا، کە وەزارەتی بەرگری دووتیپ سەرباز ڕەوانەی سلێمانی بکات و بخرێنە سەر میلاکی پۆلیس ، تاوەکو هێزێکی پۆلیسی سوارە لە باشترین و هەڵبژاردە ترین پۆلیس پێکبهێنرێت و فەرماندەیی ئەم هێزەش بدرێت بەلێهاتووترین ئەفسەر لەو بوارەدا ، کە بەردەوام پەیوەندی هەبێت لەگەڵ فەرماندەی هێزی ئاسمانی.

---

[7] لطفی جعفر فرج عبدالله : عبد المحسن السعدون و دوره فی تاریخ العراق السیاسی المعاصر، ط ٢ ،بغداد، ١٩٨٠ ، ل ١٠٧،١٠٣.

دانیشتوانی سلێمانی گەیشتەوە رادەکەی جارانی کە بە(٢٠ ) هەزار کەس مەزەندە ئەکرا[٤].

بەڵام دوای داگیر کردنەوەی بارو دۆخی شارە کە یەکجار خراپ و دژوار بوو ، لە ئاکامی بۆردو مانی فڕۆکەکان و کردەوە سەربازیەکانی هەردوولا ، هەر بۆیە خەڵکی تەواو بێ ئومێد بوو بوون ئەم حاڵەتە تەنها خەڵکە ڕەشۆکیەکەی نە گرتبۆوە ، بەڵکو ڕۆشنبیران و گەورە پیاوانی شارەکەش لە هەمان حاڵەتی بێ ئومێدیدا دەژیان، چونکە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە سێ ئەزموونی حوکمداریێتی شێخ مەحمودیان بینی بوو کە هیچ ئاکامێکی لێنەکەوتبۆوە، هەر بۆیە کاتێك ئینگلیزەکان گەڕانەوە ناو شار ، هەر لە سەرەتاوە کەوتنە کارکردن بۆ ئەوەی لە ناو خەڵکدا ئەوە بڵاوبکەنەوە ،کە شێخ مەحمود بۆتە هۆی نەهامەتیەکانی کوردو لە دەست دانی هەلی سەربەخۆیی کوردستان.

بۆ ئەم مەسەلەیەش توانیبویان کارێکی وەهابکەن کۆمەڵە کەسانێك ئەو باوەڕەیان لا دروست بێت کە ئەگەر بێتو شێخ مەحمود لە ناوا نەبێت کورد مافی خۆی دەستگیر دەبێت، ئەم تەرزە قسانە لەناو خەڵکدا بڵاوبوو بوونەوە کاریگەری خۆیان هەبوو، کە دواتر لەلایەن بنەماڵەی شێخ مەحمودەوە ئەم جۆرە کەسانە بە پیاوی ئینگلیزو بەکرێ گیراو ناو دەبران[٥].

لە کاتێکدا توێژە ڕۆشنبیرەکەی سلێمانیش دوای شکانی شێخ مەحمود ئەو باوەڕەیان لا دروست بووبوو، کە بەرە نگاری ئینگلیز و بەکارهێنانی زەبر و زەنگ کارێکی بێ سوودە[٦].

لەم بارەیەوە بەشێوەیەکی گشتی خەڵکی شارەکە ئەو قەناعەتەیان پەیدا کردبوو کە هەل و مەرجەکە لەبارنیە بۆ بەدەستهێنانی ویست و داخوازیەکانی کورد.

---

[٤] لونگریك : تأریخ العراق الحدیث ، ل ٢٥١.

[٥] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢، ل ٥٠٦.

[٦] د. كمال مظهر احمد : صفحات من الماضي يرويها الاستاذ فؤاد مستي، جريدة (التآخي) عدد(١٥٨٢ )، ١٩٧٤/١/٢١.

بەم شێوەیە توانرا لـە ڕێگـای دامـەزراندن و قوتکردنـەوەی چـەندین بنکـەی پۆلیس لەسـەر شـاڕێگەکان و تـەرخان کردنـی بودجەیەکی زۆر، چالاکیـەکانی شێخ مـەحمود سنوردار بکرێت[8]. کەئەوکاتـە حکومـەت بودجەیەکی زۆری بـۆ مەبەسـتی سـەربازیی لـە سـلێمانیو دەوروبـەریدا تـەرخان کردبـوو ، لـەبری ئـەوەی ئـاوڕێك لـە بـاری ناهـەمواری سـلێمانی بداتـەوە ، تەنانـەت لـەماوەی دووسـاڵ و نیـودا حکومـەت بـڕی (٨١١) هـەزار ڕوپیـەی بـۆ مەبەسـتی ئاوەدانکردنەوەو بنیات نان لەسلێمانی و دەوروبەریدا تـەرخان کـردووە، بەڵام تەنـها (٣٦)هـەزار ڕوپیـەی بۆخوێنـدن و فـێرکردن خـەرج کـراوە ، ئـەویش بەدروستکردنی تەنها یەك خوێندنگای کچان لـە شـاری سـلێمانیدا ،بەڵام لـە بەرامبەردا هەشت* مەرکەزی پۆلیس و سێ بینـای بـۆ سـەرا دروست کـردووە لەگـەڵ (قشـلە ) یـەکی سـەربازیدا لـەنێو شـارەکەو دەوروبـەریدا ، ئەمـەش باشترین بەڵگەیە بۆ پشت گوێ خستنی لیوای سلێمانی و گوێ پـێ نـەدانی[9]، تەنانـەت لیوای سـلێمانی لەبواری خوێنـدن و فێرکردندا ئەوکاتـە دواکـەوتوو ترین لیوای نێو هەر چوارده لیواکەبوو[10].

بێگومـان ئـەم حاڵەتـە تەنـها بـواری خوێنـدنـی نەگرتۆتـەوە ، بـەڵکو لـە بـواری تەندروستیشدا لـە سـاڵی ١٩٢٦دا ئینجا دکتۆرێـك ڕەوانـەی سـلێمانی کـراوەو نەخۆشـخانەیەکی بیسـت جێگـەیی و دەرمانخانەیـەکی تیـادا کراوەتەوە[11]، کە ئەمانەش هیچ مەرجێکیان تێدا نەبوە و لە حاڵەتێکی خراپ و شپرزەدا بوون . ڕەشید شەوقی ئەفسەر لە سوپای عێراقدا کە لە ساڵی ١٩٣٠ دوای کارەسـاتەکەی (٦) ی ئـەیلول هاتوەتـە سـلێمانی ماوەیـەك لـەو

---

[8] لطفی جعفر فرج عبدالله : هەمان سەرچاوە ل ٢٣٦-٢٣٧ .

* حکومەت ئەو هەشت بنکەی پۆلیسەی لە گوندەکانی (دەربەند، تەینال، نۆدێ، ولیاوا، قزلجە، گڵەزەردە، سەگرمەو پەیکوڵی)دروستکرد.(ئەمین زەکی: محاسبەی نیابت،ل١٦).

[9] محمد امین زکی : محاسەبەی نیابەت ، بغداد ، ١٩٢٨ ، ل ١٦.

[10] د. کمال مەزهەر : کوردی سلێمانی و بەغدا، لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا ، پەیڤین ، ژمارە ( ٩) ، ل ٢١١ .

[11] محمد امین زکی : محاسەبەی نیابەت ، ل ٧ .

خەستەخانەیە نووستوەو زۆر بێزار بووە ،لەم بارەیەوە دەڵێت : "خەستەخانەی چی ! خانەیەکی مردووی زیندوو ، چلەی زستانە ژووری هەموو پەنجەرەکانی شکاوە؛ زوقم و با لە هەموو لایەکەوە سەربەستە ، بێ نیزام ، ببرامایەتە تونخانەیەك لەوەچاکتر بوو"[۱۲]. ئینگلیزەکان دوای گەڕانەوەیان لە شوێنی ڕۆژنامەی (ئومێدی استقلال ) ڕۆژ نامەی(ژیانەوە)* یان دەردەکرد ، ئەگەر تەماشایەکی لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژنامەیە بکەین ، زۆر ڕاستیمان لە بارەی پشت گوێ خستنی سلێمانییەوە بۆ ئاشکرا دەبێت ، تەنانەت لەو ڕۆژنامەیەدا ،دەستەی نوسەران داواکارییەکیان نوسیوە لە سەر شێوەی پێشنیان، کەتیایدا داوای ئەوە دەکەن لەبڕی ئەو (۱۵۰) هەزار ڕوپیەیەی حکومەت بەنیازە بەناوی (جەنەڕاڵیمۆد)ەوە خەرجی بکا . خوێندنگایەك ، پردێك یا نەخۆشخانەیەك لە سلێمانی دروست بکەن ، چونکە وەزعی زۆر خراپە[۱۳] . کەچی حکومەت ئاوڕیشی لەم داواکاریە نەدایەوە، تەنانەت لەو بڕە پارەیە بیست خوێندنگا لە عێراقدا دروست کرا ، چواریان بەر (کەرکوك) کەوت و دانەیەکیش لە هەولێر دروستکرا[۱٤] . لێرەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە سلێمانی لەچاو سەردەمی دووهەمین حوکمدارییەتی شێخ مەحمود دا دواکەوتووتر بووە ، چونکە ئەو کاتە سلێمانی چوار خوێندنگای تێدا بووە[۱٥] . بەلام دوای گەڕانەوەی ئینگلیزو حکومەتی عێراق تەنها یەك خوێندنگا لە سلێمانیدا هەبووە، دوای داواکاری و هەوڵ و

---

[۱۲] بە سەرهاتووی کاکە ڕەشید شەوقی ، سەرگوزشتە ، دەست نوس .

* ئەم ڕۆژنامەیە دوای گەڕانەوەی ئینگلیزەکان بۆ سلێمانی ، لەڕێکەوتی ۱۹۲۵/۸/۱۸ یەکەم ژمارەی بلاو بۆوە، کە مەبەستیان لە ناوی (ژیانەوە)ژیانەوەی سلێمانی بوو دوای ئەو نەهامەتیانەی بەسەری هاتبوو، هەریەك لە(جەمیل صائب و م.ئەدیب ) سەرنوسەری بوون. ژمارەیەکی زۆر لە روناکبیرانی سلێمانی بابەت و وتاریان بۆ دەنارد. دوا ژمارەی کە ژمارە (٥٦)بوو، لە ۱۹۲٦/٦/۱٤ بلاو بۆوە.(فاروق علی عمر: هەمان سەرچاوە،ل۹۹-۱۰۰) .

[۱۳] ژیانەوە : ژمارە ( ۳۱ ) ، ۱۹۲٥/۷/۱٦ .

[۱٤] عبد الرزاق الهلالی :تأریخ التعلیم فی العراق فیعهد الانتداب البریطانی .۱۹۲۱-۱۹۳۲ ،ط۱، ۲۰۰۰ بغداد ،ل۱۱۳.

[۱٥] ڕەفیق حلمی : یاداشت ، ب ۲ ، ل ٥۳٤ .

کۆششێکی زۆر لەساڵی ١٩٢٨ دا گەیشتۆتەوە چوار خوێندنگا، کە بریتی بوون لە سەرەتاییەکی کوڕان و یەکێکی کچان ، لەگەڵ یەك خوێندنگای ناوەندی و تەنها یەك پۆلی قۆناغی ئامادەیی ، کەئەمانیش بە خوێندنگایەك ژمێردراون . دوای تەواو کردنی ئەو تەنها قۆناغەی ئامادەیی، دەبوایە خوێندکار یا واز لە خوێندن بهێنێت یا بۆ تەواو کردنی قۆناغی دووەم ڕوویکاتە بەغدا ، تاوەکو بتوانێت ئامادەیی تەواو بکات و لە زانستگا وەربگیرێت ، هەرچەندە هەوڵێکی زۆردرا بۆ کردنەوەی ئەو پۆلی دووەمە ، بەڵام لەبەر نەبوونی مامۆستای کورد بۆ وانە زانستیەکان و نەبوونی کتێب و پرۆگرامی خوێندن بەکوردی ئەم هەوڵە شکستی هێناوەو سەری نەگرتووە[16] .

لەڕووی کارگێڕیشەوە ، تاکێشەی ویلایەتی موسڵ یەکلایی نەبۆوە ، سلێمانی هەر لەلایەن (چاپمان) ەوە سەرپەرشتی دەکراو بەڕێوە دەبرا[17] ، و بەهیچ کەسایەتیەکی کوردیان ڕەوا نەبینیبوو پۆستی موتەسەڕیفی پێبدەن. بەڵام ئەو سەردەمە ڕۆشنبیرانی سلێمانی هێشتا بەتەواوی بەرچاویان ڕۆشن نەبوو بۆووە ، زۆریان پێیان وابوو کە ئینگلیز مافی کورددەدات و کلیلی گشت کێشەکان لای بەریتانیایە، چونکە ژمارەیەکی بەرچاوی ئەو ڕوناکبیرانە لەو ڕۆژگارەدا لەدەوری (ژیانەوە) کۆببونەوە و نوسینیان تێدا بڵاو دەکردەوەو لەوباوەڕەدا بوون لە ڕێگای بەریتانیاوە کێشەی کورد چارەسەر دەکرێت ، هەربۆیە بەئاشکرا ستایشی ئینگلیزیان دەکردو بەشان و باهوی بەریتانیایاندا هەڵدەدا ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەئەوانە پیاوی ئینگلیز بوون ، بەپێچەوانەوە کوردو نیشتمانپەروەری ڕەسەن بوون و ژمارەیەکیان هێندە نەبوو ڕیزەکانی شێخ مەحمودیان جێ هێشتبوو ، وەك (ڕەشید جودت)و(مەحمودجودت)[18] ئەوەندە نەبێت ئەوانە پێیان وابوو بەلاسایی کردنەوەو چاولێکەری پێشکەوتنی ئینگلیزو ڕۆژئاواییەکان دەتوانرێت

---

[16] محمد امین زکی : محاسبەی نیابت ، ل ٩-٨ .

[17] ئەدمۆندز : کرد و ترك و عرب ، ل ٣٦٨ .

[18] د. کەمال مەزهەر : ئەو پێشەکییەی بۆ ( ژیانەوە ) و شوێن لە ڕۆژنامە نوسی کوردیدا نوسیویەتی . ل ١٤ .

گیروگرفتەکانی کۆمەڵ چارەسەر بکرێت و دەکرێت لەوانەوە فێری شتی چاك بین[١٩].

جگە لەوەی ژمارەیەك لەڕوناکبیرانی سلێمانی دڵشکاو بوون لە شێخ مەحمودو تەواو لێی زویر ببوون ، بەرچاوترینی ئەم توێژە (عەلی عیرفان) بوو ، ناوبراو لەسەردەمی شێخ مەحموددا (جمال عیرفان ) ی برای (عارف صائب )ی ژنبرای کوژرابوون ، گەر ئەویش نەبوویێت ، لەسەردەمی ئەودا بوو ، هەربۆیە عەلی عیرفان زۆر داخ لە دڵ بوو ، بەردەوام وتارو نوسینی لە (ژیانەوە) دا بڵاو دەکردەوەو بەئاشکرا تیرو توانجی لە شێخ مەحمود دەگرت و قسەی پێ دەگوت[٢٠].

هۆکارێکی دیکەی ئەو ساردیەی نێوان شێخ مەحمود و ڕوناکبیران بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە شێخ مەحمود لە چەندین بۆنەدا دەستی بەڕووی ئەو کەسانەوە دەناو هیچ متمانەیەکیان پێنەدەکردن، بەردەوام کەسانی نەخوێندەوارو خۆ ڕەپێش کەرو دەست و پێوەند کەوتبوونە نێوان شێخ مەحمود و ڕوناکبیرانەوەو نەیان دەهێشت لە خۆیان بترازێ کەس بەدەرکەوێت[٢١]. بەتایبەت لە ڕۆژگاری دووهەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود دا کەئەوکاتە تورکخواکان زۆر بەهێزبوو بوون، بەڵام دوای داگیرکردنەوەی سلێمانی و نەمانی دام و دەزگاکەی شێخ مەحمود تادەهات ڕەوتی تورکچێتی و لایەنگیری کەمالیەکان ڕووی لە کزی دەکردو باویان نەمابوو[٢٢].

بەئاشکرا لەسەر لاپەڕەکانی (ژیانەوە) سوکایەتیان پێدەکراو بەبێکارو دەست بەتاڵ و خاین لە قەڵەم دەدران[٢٣]. جگە لەوەی سیاسەتی شۆڤێنیانەی کەمالیەکان لەو ساڵانەدا هۆکارێکی دیکە بوو کەوای کرد ڕوناکبیران

---

[١٩] ژیانەوە : ژمارە ( ٥٤ ) ، ١٩٢٥/١/٢٤ .

[٢٠] جەمیل صائب : لە خەوما، ل٢٤.

[٢١] ڕەفیق حلمی : یاداشت ، ب ١ ، ل ٨٥ .

[٢٢] د کەمال مەزهەر : خێر وبێری ڕاپۆرنوسێکی کورد، ( ڕەنگین ) ، ژمارە ٩٢ ، ١٩٩٦ ، ل٧.

[٢٣] ژیانەوە : ژمارە ( ١٥ ) ، ١٩٢٥/٢/١٦ .

بەیەكجاری ڕوولەسیاسەتی ئینگلیز .بكەن[٢٤] ئەو كاتەش ئینگلیزەكان كێشەی موسڵیان یەكلایی نەكردبۆوە بۆیە زۆریان لامەبەست بوو زۆرترین لایەنگر لە خۆیان كۆ بكەنەوە ، ئەو سەردەمەش جگە لە ڕوناكبیرانی سلێمانی ، بازرگانەكان و خاوەن موڵكەكانی سلێمانی نزیكترین دەستە و توێژ بوون كە ئینگلیز بەردەوام متمانەی پێ دەكردن ، ئەوانیش لایەنگیری دەوڵەتی عێراق بوون ، چونكە بەرژەوەندیە ئابوریەكانیان لەگەڵ بەغدا دا بوو[٢٥] .

## ٢- هاتنی لیژنەی ( كۆمەڵەی گەلان ) بۆ سلێمانی ..

دوای ئەوەی كۆنگرەی (لۆزان) نەیتوانی كێشەی ( ویلایەتی موصڵ )* چارەسەر بكات، لە ٢٠ ئەیلولی ١٩٢٤ دا كێشەكە خرایە بەردەستی (كۆمەڵەی گەلان) ئەویش لای خۆیەوە لەسەر پێشنیاری نوێنەری بەریتانیا لە (كۆمەڵەی گەلان) دا لە ٣٠ ئەیلولی ١٩٢٤ دا بەكۆیدەنگ بڕیاری ناردنی لیژنەیەكی دا بۆ لێكۆڵینەوە لە بارو دۆخی ویلایەتی موسڵ و گوێ گرتن لە بیرو ڕای دانیشتوانی هەرێمەكە[٢٦] .

بەم شێوەیە لەوكاتەوە ئینگلیزەكان كەوتنە خۆ ئامادەكردن بۆ پێشوازی كردنی ئەو لیژنەیەو ئامادەكردنی خەڵك لە شارەكانی ئەو

---

[٢٤] ژیانەوە : ژمارە ( ١٥ ) ، ١٩٢٥/٢/١٦ .

[٢٥] د. فاضل حسین : كێشەی ویلایەتی موسڵ ، وەرگێڕانی ، محەمەد شاكەلی ، سلێمانی ، ١٩٩٩ ، ل٣٠٠ ؛ ئەدمۆندز : كورد و ترك و عرب ، ل٣٧٤ .

*لە ڕۆژی ١٩١٨/١١/٢ (عەقید لچمن) گەیشتە شاری موسڵ و داوای لە (عەلی ئیحسان پاشا)ی فەرماندەی هێزی تورك كرد چاوی بە (ولیەم مارشاڵ)بكەوێت، كە فەرمانی داگیركردنی ویلایەتی موسلی پێدراوە، بەپێی هەردوو بەندی (١٦،٧)ی ئاگر بەستی (مندروس) دەبێ توركەكان لە موسڵ بكشێنەوە، هەردوو سەركردە سەبارەت بە چەمكی (میزۆپۆتامیا)كە ئایا ویلایەتی موسڵیش دەگرێتەوە؟ كەوتنە مشتومڕەوە، عەلی ئیحسان پاشا ڕازی نەدەبوو موسڵ چۆل بكات. بەڵام دواتر لە ئەستەمبوڵەوە فەرمانی پێدرا پاشەكشە بكات و موسڵ بداتە دەست ئینگلیزەكان.ئیدی لێرەوە كێشەی موسڵ دەستی پێكرد.(د.فاضل حسین: هەمان سەرچاوە،ل٨،٣٨).

[٢٦] د. فاضل حسین : هەمان سەر چاوە ، ل٧٧ .

ویلایەتەدا بۆ ئەوەی لەکاتی هاتنی لیژنەکەو ڕاپرسیەکەدا دەنگ بۆ چوونە پاڵ عێراق بدەن[٢٧].

بەڵام لەهەموو شوێنێك زیاتر لە سلێمانی دەترسان ،پێیان وابووشەڕی یەکلایی کەرەوە لەسلێمانیدا دەکەن ،چونکە ئەو شارە شوێنێك بوو سەرپاکی دانیشتوانەکەی کورد بوون ، هیچ کەمینەیەکی تێدا نەبوو، کوردەکانی شارەکەش بەدرێژایی پێنج ساڵی ڕابردوو بەردەوام لە شۆڕشدابوون دژ بە حکومەتی بەریتانیا[٢٨]. لە هەمان کاتیشدا ئاشنایەتیان لەگەڵ کێشەکەدا هەبوو، بیرو ڕاشیان لەم بارەیەوە ئاشکرابوو هەر لەڕۆژگاری دوهەمین حکومدارێتی شێخ مەحمووددا ، لە سلێمانیدا کەم و زۆر باس لەو کێشەیە دەکرا ، جگە لەوەش ڕووناك بیرانی ئەم شارە بەردەوام لەو باوەڕەدا بوون کە پێویستە قەڵەمرەوی حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمود ،سەرجەم ویلایەتی موسڵ بگرێتەخۆ ، ئەم ڕاستیەش لەو وتارو نوسینانەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کەلە ڕۆژنامەی ( ڕۆژی کوردستان )دا لە وەڵامی ڕۆژنامەکانی (العراق)و ( نجمە ) دا بڵاو دەکرانەوە ، بۆ نمونە (ڕۆژی کوردستان ) دا وەڵامی نوسینێکی ڕۆژنامەی (نجمە) ی داوەتەوە ،کە تیایدا چەند شتێکی نوسیوە سەبارەت بە ویلایەتی ( موسڵ )و باسی لەوە کردەوە کە کوردستان لە ولایەتی موسڵدا تەنها شاری سلێمانی دەگرێتەوە ، هەر بۆیە (م . نوری ) لە وتارێکدا، ئەو بۆ چونانە بە درۆ دەخاتەوە و سەر جەم قەزاو ناحیەکانی (ئاکرێ، دهۆك ،بارزان ،هەولێر، کەرکوك ،کفری ،ئامێدی ) و دەورو بەری بەنێوچە کورد نشینەکانی ویلایەتی موسڵ دەژمێرێ و تەنها ناو شاری (موسڵ) ی لێدەردەکات ئەوانی دیکە هەموو بە کورد لە قەڵەم دەدات و بە کورد زوبانیان ناودەبات تەنانەت تورکەکانی ویلایەتی موسڵیش بە خەڵکی کوردستان دەژمێرێت ، چونکە پەیوەستن بە کوردستانەوە، لە کۆتایی وتارەکەشدا

---

[٢٧] عبد الرزاق الحسنی : تأریخ الاحزاب السیاسیه العراقیه ، ل٨٩-٩٠. ئەدمۆندز : هەمان سەر چاوە ، ل٣٥٦.

[٢٨] ئەدمۆندز:هەمان سەر چاوە ،ل ٣٧٣ .

بێترس باس لەوە دەكات ، كە هەرگیز ئامادە نین دەست لەم ویلایەتە هەڵبگرن و ئەو مافەش لە بەریتانیا داوا دەكەن[٢٩] .

تەنانەت ( جەمعیەتی كوردستان )* كە مستەفا پاشای یاموڵكی سەرۆكایەتی دەكرد لە ڕێكەوتی ١ی تشرینی یەكەمی ١٩٢٤ دا بروسكەیەكی نارد بۆ (كۆمەڵەی گەلان ) و تیایدا دژ بە داواكاریەكانی توركیا لەم ویلایەتەدا وەستایەوە و ئەوەی ڕەت كردەوە كە هیچ پەیوەندیەك لە نێوان ،كوردو توركدا هەبێت ، پەیوەستەگی ئاینی نەبێت ،ئەم مەسەلەیەش بە نەمانی خەلافەتی عوسمانی پوچەڵ بۆتەوەو هیچ پەیوەندیەك لە نێوان ئەم دوو گەلەدا نییە[٣٠] .

بۆیە ئینگلیز ئەم مەسەلەیەی بە گەرمی باسدەكردو هەوڵی دەدا دانیشتوانی ئەو شارانەی بۆ ئامادە بكات ، زۆر شێوازو ڕێگای دەگرتە بەر ، لە سلێمانیدا یەكەم هەنگاوی لەم پێناوەدا دەركردنی ڕۆژنامەی (ژیانەوە ) بوو . لەڕێگای ئەم ڕۆژنامەیەوە دەیویست وا لە كوردەكانی سلێمانی بكات ئەو باوەڕەیان لادروست ببێت كە چیدی كوردو تورك ناتوانن پێكەوە بژین[٣١] . هەربۆیە كێشەی ویلایەتی موسڵ یەكێكە لەو بابەتانەی (ژیانەوە) بایەخی زۆری پێداوەو دەیان نوسین و وتاری جۆربەجۆری دەربارەی بڵاوكردۆتەوە ، بەشێوەیەك كە هیچ بڵاوكراوەیەكی دیكەی كوردی ناگاتە ئاستی ژیانەوە لەو بوارەدا. وێڕای هەموو شتێك ، ئەم هەڵوێستەی (ژیانەوە) بۆ ئەوە

---

[٢٩] ڕۆژی كوردستان : ژمارە (١٠) ، ١٩٢٣/١/٢٤ .

* ئەم كۆمەڵەیە یەكەم ڕێكخراوی ئاشكرا بوو لە مێژووی كوردستانی عیراقدا كە كاربەدەستانی ئینگلیز لەبەر گەلێك هۆ ناچار بوون ڕێگای كاركردنی پێبدەن.

جەمعیەتی كوردستان مۆری تایبەتی خۆشی هەبووە، جگە لە ناوەكەی وێنەی (خۆر)ێكیشی تێدا هەڵكەندراوە.(د.كمال مظهر احمد: صفحات من تاریخ العراق المعاصر، ل١٢٩).

[٣٠] د. فاضل حسین : هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩٩ ؛ د. عبد الستار طاهر شریف : الجمعیات و المنظمات و الاحزاب الكردیة فی نصف قرن ١٩٠٨ –١٩٥٨، ط ١ ، بغداد ، ١٩٨٩، ل ٩٠.

[٣١] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب ٢ ، ل ٥٩٤ .

دەگەڕێتەوە کە کورد ڕقێکی زۆری لە کەمالیەکان بوو لەو سەردەمەداو بەرژەوەندی کوردیش لەم هەڵوێستەدا بوو[٣٢].

بەر لەهاتنی لیژنەکە بۆ سلێمانی ،چەندجارێك لێپرسراوانی ئینگلیزو حکومەتی عێراق سەردانی سلێمانیان کرد ، لەوانە (عبدالمحسن السعدون) و( مێجەر بۆلی ) ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆو (لۆرد تۆمسۆن) ی وەزیری فڕۆکەوانی بەریتانیا ، لە ١٩٢٤/١١/١٦ دا ( هنری دۆبس ) ی نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عێراق سەردانی سلێمانی کردو لەلایەن پیاو ماقوڵانی شارەکەوە پێشوازی لێکراو سەردانی دام و دەزگاکانی سلێمانی کرد[٣٣].

بێگومان بەشی زۆری ئەم سەردانە ، شێوازێکی دیکەی ئینگلیزو حکومەتی عێراق بوو، بۆ کارکردنە سەر خەڵکی سلێمانی،تەنانەت ماوەیەکی کەم بەرلەهاتنیلیژنەکەی (کۆمەڵەی گەلان )، ئینگلیزەکان لە بەغداوە ڕێنماییان بڵاو کردەوە بۆ پێکهێنانی چەند لیژنەیەکی (بەرگری نیشتمانی) لە هەموو عێراقدا بەمەبەستی وروژاندنی هەستی خەڵکی لەڕێگای خۆپیشاندان و کۆڕو کۆبوونەوەو سازدانی بۆنەی ئاینی و بروسکە ناردن[٣٤].

کاتێك لیژنەکە لە ١٦ ی کانونی دووەمی ١٩٢٥ دا گەیشتە بەغدا ، بەهاندانی بەریتانیا لە سلێمانیشدا کۆمەڵەیەکی سیاسی ئاشکرا بەنێوی ( جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن ) دامەزرا بەمەبەستی بەرگرتن لە داخوازیەکانی تورکیا لە ویلایەتی موسڵ داو بە هەڵبژاردنێکی ئاشکرا دەستەی بەڕێوەبردنی جەمعیەتەکە هەڵبژێردراو بەسەرۆکایەتی(ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) وئەندامێتی (١٧) کەسایەتی* شاری سلێمانی ، کەبەڕوونی لە

---

[٣٢] د. کەمال مەزهەر : پێشەکی ژیانەوە ، ل ١٢-١٣ .

[٣٣] ژیانەوە ژمارەکانی : (٤) ١٩٢٤/٩/١٥ ؛ (٦) ١٩٢٤/١٠/٣ ؛ (٩) ١٩٢٤/١١/٢١.

[٣٤] ئەدمۆندز : هەمان سەر چاوە ، ل ٣٦١.

* ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوون لە:( ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، رەشید مەستی ، پیرەمێرد، حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا،شێخ مەحەمەدی گوڵانی، عزەت بەگی عوسمان پاشا، عەلی عیرفان، حاجی سەعید ئاغا، حەمدی شاعیر، حەمە بەگی قادر پاشا، حاجی برایم ئاغا، میرزا تۆفیق قەزاز، محەمەد بەگی حاجی رەسول بەگ، مەحمود ئەفەندی رەئیسی بەلەدیە، فەتاح ئەفەندی ئەوقات، فایق بەگی مەعروف بەگ، شەوکەتی عەزمی بەگی بابان).(رۆژنامەی ژیانەوە، ژمارە -١٦-لە ١٩٢٥/٢/١٩).

پڕۆگرامەکەیاندا ئەوەیان ئاشکرا کردووە کەوا مەبەستی ئەم جەمعیەتە پارێزگاری کردنە لە سنوری نیشتمانی عێراق ، کە ویلایەتی موسڵ تەواو کەریەتی[٣٥]

ئەم کۆمەڵەیە هەر دوای یەکلایی بونەوەی کێشەی موصڵ هەڵوەشایەوەو لە کارکەوت ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بەدەستی ئینگلیز دروست کرابوو ، هیچ مۆرکێکی نیشتمانیو نەتەوەی کوردی پێوە نەبوو[٣٦] .

بەلاّم وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ، لە بواری دژایەتی کردنی داواکاریەکانی تورکیا کەس شانی لەشانی وتارەکانی سەر لاپەڕەکانی (ژیانەوە) نەدەدا تەنانەت کاتێك هەواڵ گەیشتە سلێمانی کە (فەتاح ئەمینی عەتار) ی ژن برای شێخ مەحمود ،هاوشانی وەفدەکە دێت بۆ سلێمانی وەك یاوەرو چاو ساغی تورکەکان، (عەلی عیرفان) لە وتارێکیدا لە ژیانەوەدا رستێك قسەو وشەی ناشیرین بە ناوبراو دەڵێت و سەرسوڕمانی خۆی نیشان دەدات لەهاتنی لەگەڵ لیژنەکەدا ، تەنانەت هەڕەشەی ئەوەش دەکات کە هەموو سوکایەتیەکی پێدەکرێت لە سلێمانیدا[٣٧] .

(ئەدمۆندز) یش بەهەمان شێوە باسی لەوە کردووە کە گوایە کۆمەڵێ لاو لەسلێمانی بە نیاز بوونە کە (فەتاح) هاتە سلێمانی نەوتی ڕەشی پێدا بکەن[٣٨] .

هەر ئەو ڕۆژانە بەر لەهاتنی لیژنەکە (ژیانەوە) هەواڵی شارەکانی (هەولێرو موسڵ) ی بلاّو دەکردەوە ، بەمەبەستی ئاگادار کردنەوەی خەڵك لە دەنگ و باسی لیژنەکەو ئاکامی ڕاپرسیەکانیان لەو شارانەدا[٣٩] . جگە لەوەش

---

[٣٥] ژیانەوە : ژمارە (١٦)ی ١٩٢٥/٢/١٩ ؛ کەمال ڕەئوف محەمەد : جەمعیەتی پێشکەتنی کوردان ، سلێمانی ١٩٢٦، کوردستانی نوێ (١٤٦٢ ) ١٤/٩/١٩٩٧ .

[٣٦] کەمال ڕەئوف محەمەد : جەمعیەتی پێشکەتنی کوردان ، سلێمانی ١٩٢٦، کوردستانی نوێ (١٤٦٢) ١٦/٢/١٩٩٧ .

[٣٧] ژیانەوە : ژمارە (١٥ ) ١٩٢٥/٢/١٦ .

[٣٨] کرد وترك وعرب ، ل ٣٧٤.

[٣٩] ژیانەوە ژمارەکانی : (١٥) ١٩٢٥/٢/١٦ ؛ (١٦) ١٩٢٥/٢/١٩ .

(جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن) بەیاننامەیەکی بلاوکردەوەو بەئاشکرا بانگەوازی بۆ چوونە پاڵی عێراق دەکرد بەبیانووی پەیوەندی بازرگانی و ئابووری سلێمانی لەگەڵ عێراقدا ، داواشی لە خەڵکی شارەکە دەکرد کە گوێڕایەڵیان بکەن ، سەرپێچیکەرانیشی بە خاین و دوژمنی نیشتمان لە قەڵەم دەدا [٤٠] .

چەند ڕۆژێك بەر لە گەیشتنی لیژنەکە ئەدمۆندز خۆی سەردانی سلێمانی کردو چاوی بە (چاپمن) کەوت ، کە ئەوکات هێشتا سەرپەرشتیاری ئیدارەی شارەکە بوو . لەو سەردانەدا چاوی کەوت بەگەورە پیاوان و بازرگانانی شارەکە ، وەك ( شێخ قادری حەفید ، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ ، حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا ) و لەو دیمانەیەدا ئەدمۆندزیان دڵنیا کردۆتەوە کە بە ئاشکرا باس لە خراپە کاریەکانی حکومەتی عوسمانی دەکەن و ئەوەش ڕادەگەیەنن کەخوازیارن لەگەڵ عێراقدا یەکبگرن و نا یا نەویٚ جارێکی دیکە بچنەوە ژێر دەستی ئەو دەستەلاتەی لەسایەیدا تالاوی زۆریان چەشتووە [٤١] .

ئینگلیزەکان سلێمانیان زۆر لامەبەست بوو ، چونکە دەیانزانی مەسەلەی ڕاپرسیو دواندنی خەڵکی ئەم شارە لە بەرژەوەندی ئەواندا نیەو ناشێت پشتی پیٚ ببەستن ، خەڵکەکە هێشتا ئەوەیان لە یادە کە هێندە نابێت بە زۆر ئالاّی بەریتانیان پیٚ هەڵکردن ، دوای ئەوەی بە هەموو شێوەیەك ئەوەیان ڕەتکردەوە کە بخرێنە سەر عێراق .

بۆیە ئەدمۆنز دەڵێت بڕیارماندا هۆکاری ئابووری زەق بکەینەوە و لیستی ئەو ناوانەش کەپرسیاریان لێدەکرێت لەسەر بنەمای کەسایەتی وپلە و پایە بێت، بۆیە دەبوایە لیژنەکە ئاگادار بکەینەوە کە فەرمانبەر و مەئمورەکانی شاری سلێمانی پشت گویٚ نەخەن و تەنها وەك دارو دەستەی حکومەت تەماشایان نەکەن ، چونکە ئەوانە لەسەر بنەمای شوێن و پێگەی کۆمەلاّیەتیان بۆ ئەو پلە و پایانە دەست نیشان کراون [٤٢] .

---

[٤٠] ژیانەوە ژمارە : (١٧ ) ١٩٢٥/٢/٢٣ .

[٤١] کرد وترك وعرب ، ل ٣٦٨-٣٦٩.

[٤٢] سەرچاوە ی پێشوو ، ل٣٣٦ ، ٣٦٧ .

لیژنەکە لە ڕێکەوتی ۲۷ ی شوباتی ۱۹۲۵ بە کاروانێکی بیست ئۆتومبیلی گەیشتنە سلێمانی [٤٣] ، ئەندامانی لیژنەکە زۆریان حەز بە بیستنی بیروڕای ئەو خەڵکە دەکردکە لە ساڵانی ڕابردودا باشترین بەڵگەی سەربەخۆیی فیکری خۆیان سەلماندبوو ، ئینگلیزەکانیش لای خۆیانەوە ئەو حەقیقەتەیان دەزانی کە بیرو ڕاو قسەی خەڵکی سلێمانی لەگەڵ لیژنەکەدا قسەی یەکلایی کەرەوەیە هەر بۆیە ئەدمۆندز هەر لەڕێوە هەوڵی ئەوەی دەدا کەوا بارو دۆخی سلێمانی بۆ ئەندامانی لیژنەکە ڕوون بکاتەوە تێیان بگەیەنێت ،کەسلێمانی ژمارەیەکی کەم لە خەڵکانی نەتەوە پەروەری توند ڕەوی تێدایە ، بەڵام زۆرینەی دانیشتوانەکەی نیشتمان پەروەری میان ڕەون حەز بە یەکگرتن دەکەن لەگەڵ عێراقدا ، بە مەرجێك فەرمانبەرانی ناوچەکەیان کوردبن و زمانی کوردی زمانی ڕەسمی دام ودەزگاکان بێت و لەخوێندنگاکاندا منالان بەکوردی بخوێنن، بەڵام بازرگان و خاوەن موڵکەکان زۆر بەتوندی لایەن گری چونە پاڵ عێراق دەکەن بەبێ هیچ مەرجێك چونکە جیا بوونەوە مانای ماڵ وێرانیان دەگەیەنێت ، ژمارەیەکی کەمیش تورکخوای تێدایە ، ئەوانیش خانەنشین و کۆنە مووچەخۆرەکانی سەردەمی عوسمانین [٤٤] .

(جەواد پاشا) کە یاوەری لیژنەکە و تورك بوو ، لیستێکی دابوو بەئەندامانی لیژنەکە بە ناوی ئەو کەسانەی گوایە نێردراون بۆ سلێمانی بە مەبەستی ئاژاوە نانەوە بۆیە داوایان کردبوو کە ئەوانە دوور بخرێنەوە . ناوەکانی نێو لیستەکەش بریتی بوون لە (بابەکر ئاغای پشدەری ، شێخ عبدولقادری سەنگاو، حاجی شێخ عارفی سەرگەڵو، ئەحمەد بەگی وەسمان پاشای جاف و کەریم بەگی جاف ) ، ئەمانەش سەرجەمیان لایەنگری ئینگلیز بوون جیٚباوەڕیان بوون ، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون بەو داوایەی تورکەکان ڕازی بن [٤٥] .

---

[٤٣] ژیانەوە : ژمارە (١٩) ، ١٩٢٥/٣/٣ .

[٤٤] ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل ٣٧٣-٣٧٤ .

[٤٥] سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٧٤ .

له بەر گرنگی شاری سلێمانی بڕیار درابوو هەموو ئەندمانی لیژنەکە لەسلێمانی حازربن ، هەر بۆیە ئەوانەی دواش کەوتبوون پەیوەندیان پێوەکردن له سلێمانی[٤٦] .

که جگه له ( ڤیرسن ، پۆل تیلکی ، ڕۆدلۆ و هۆراس بۆ تالییه ) هەریەك له جەنراڵ (جواد پاشا ) و (کامل بەگی ) یان لەگەڵدابوو وەك نوێنەری تورکیا (نازم بەگ نەفتچی زاده ) و (فەتاح ئەمین عەتار ) یش، یاوەریان بوون ، نوێنەرانی عێراقیش جگه له (صبیح نشأت ) هەریەك له ( چاردین ، ئەدمۆندز ) هاوشانی ئەو لیژنەیه هاتبوونه سلێمانی[٤٧] .

ئەندامانی لیژنەکە دوای گەیشتنیان به ناو بازاڕدا سوڕانەوه ، کەسیان لێ کۆنەبۆوه زۆر ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا ، بەڵام دواتر نوێنەرانی تورکیا نەیان دەوێرا لەو خانووەی بۆیان دەست نیشان کراوه بچنەدەرەوه . هەر ئەو ڕۆژە بابەکر ئاغای پشدەر بە خۆی و سەد سوارەی چەکدارەوە گەیشتە سلێمانی[٤٨] .

لیژنەکە ماوەی سێ ڕۆژ لە سلێمانیدا مایەوە و، گفتوگۆی لە گەڵ خەڵکیدا دەکرد، بەپێی ئەو لیستانەی ئامادە کرابوو لەلایەن ئینگلیزەوە پرسیاری ئاراستەی دانیشتوانی شارەکە دەکرد[٤٩] ، بەڵام ئەو لیژنەیە لە کاتی ڕاپرسیەکەدا فێڵێکیان لە خەڵکی کرد ، چونکە خەڵکی سلێمانی زۆربەیان سەربەخۆییان دەویست بەڵام ئەوان لە خەڵکیان دەپرسی "دەتەوێ لەگەڵ تورك بژیت یان لەگەڵ عەرەب بژیت ؟ " نەیان دەووت (سەربەخۆییت دەوێ یان نا ؟) لەبەر ئەوە ئەوانەی داوای سەربەخۆییان دەکرد ،وا دادەنرا کەڕەئیان نەداوە، ئەوانەش کە ڕەئیان دابوو بە بۆ

٤٦ ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل٦٣٠ .
٤٧ سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٢٩ .
٤٨ ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل ٣٧٥ .
٤٩ سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٧٦ .

چوونی لیژنەکە زۆربەیان دەیانویست لەگەڵ عێراقدا یەکبگرن [٥٠].

لەلایەکی دیکەشەوە کوردەکانی کوردستانی باشوور، داوای ئەوەیان دەکرد کە ئەگەر بێتوو ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لەئارادا نەبێت، ئەوا یەکگرتن لەگەڵ عێراقدا بە چاك دەزانن [٥١].

لە سلێمانیشدا وێرای ئەوەی خەڵکەکەی خوازیاری سەربەخۆیی بوون ،بە ئاشکرا سەرجەم دژێوی و گەندەڵیەکانی حوکمڕانی تورکیان لەم وڵاتەدا خستبوە ڕوو. لەم لایەنەشەوە بازرگانەکانی شارەکە پاڵپشتێکی دیکەی بەریتانیا و حکومەتی عێراق بوون [٥٢].

دوای گەڕانەوەی لیژنەکە ڕۆژنامەی (ژیانەوە) باسی لە میکانیزمی کارەکانی لیژنەکە کردووە لە سلێمانیدا، کە چۆن پرسیاریان لە سەرجەم دانیشتوانی شاری سلێمانی کردووەو هۆزو عەشیرەتەکانی دەوروبەریشیان دواندوەو ئەوەیان بۆ ئاشکرا بووە کە لە هەموو لیواکەدا کەسێك نیە زەرەیەك ئارەزووی هاتنەوەی حکومەتی تورکیای لە دڵدا بێت [٥٣].

بەم شێوەیە لیژنەکە، دوای تەواو بوونی کارەکانی لەسلێمانی گەڕایەوەو بەپێ ی قسەکانی ئەدمۆندز وەڵامی خەڵکەکە بەدڵی ئینگلیز بوو، چونکە هەموو دژ بە تورکیا دەنگیان دابوو. بەڵام وەك لە ڕاپۆرتەکەی (ڤێرسن) دا هاتبوو، هەستی نەتەوایەتی لەسلێمانیدا لە هەموو شتێکی دیکە زاڵتر بوو، خەڵکەکەی بەئاشکرا داوای سەربەخۆیی تەواویان کردووە و پێیان باش بووە لە ژێر چاودێری بەریتانیادا بن، بەڵام وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ئەوان لەکاتی پرسیار کردندا، بواری ئەوەیان بۆ بەرامبەر نەهێشتبۆوە کە ڕایەکەی هیچ سودێکی هەبێت، ئیدی ئەدمۆندز سەبارەت بە ئاکامی ڕاپرسیەکەی سلێمانی و بیروڕای خەڵکی شارەکە دەڵێت : " بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار ئەو پاروە نانەی (نۆئیل) لەیەکەم هاتنیدا بۆ سلێمانی دای بە

---

[٥٠] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ( ئیبراهیم ئەحمەد )، کۆمەڵەی کەلەپوری کورد ، مامۆستا (حەمە صالح سعید) لە ڕێکەوتی ١٣/٢/١٩٢٢ ئەنجامی داوە ..

[٥١] د. کەمال مەزهەر : پێشەکی ژیانەوە ، ل ١٣ .

[٥٢] ئەدمۆندز : هەمان سەرچاوە ، ل ٣٧٦ .

[٥٣] ژیانەوە : ژمارە (١٩) ٣/٣/١٩٢٥ .

خەڵکەکە ، خێرەکەی بە چەندان کولێرە بۆمان گەڕایەوە لەو ساتە ناهەموارو دژوارەی دەوڵەتی عێراقدا "[٥٤] .

لەکۆتایدا لیژنەکە دوای گەڕانەوەی ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش کردوو ، بڕیاردرا کەوا ئەو زەویانەی دەکەونە خوار هێڵی (برۆکسل)* ەوە بدرێتەوە بە عێراق ، بەڵام بۆ ئەم مەبەستە دوو مەرجی دانابوو:-

یەکەم :- عێراق بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ لەژێر چاودێری بەریتانیادا بمێنێتەوە .

دووەم :- بارودۆخی تایبەتی کوردەکان لەبەر چاو بگیرێت و داخوازیەکانیان ڕەچاو بکرێت لەوەدا کە فەرمانبەرانی نێوچەکە کوردبن و لەخۆیان بن ، زمانی ڕەسمی دام و دەزگاو دادگاکان کوردی بێت و لە خوێندنگاکاندا بە کوردی بخوێندرێت . سەبارەت بەخاڵی یەکەم (کۆمەڵەی گەلان) بەریتانیای مولزەم کرد کە بۆ ماوەی (٢٥) ساڵی دیکە عێراق لەژێر ئینتدابی خۆیدا بهێڵێتەوە ، ئەمەش لەڕێگای بەستنی پەیمانێکی نوێوە کە لەنێوان هەردوولادا ببەسترێت . بەڵام تەنها مەسەلەیەك کە بووە بوارێك بۆ خۆپەڕاندنەوەی عێراق و بەردەوام نەبوونی ئینتداب ، مەسەلەی سەربەخۆیی عێراق و بەئەندام بوونی بوو لە (کۆمەڵەی گەلان ) کە ئەمەش دواتر بوو بەگورزێك و لە هیواکانی کورد درا ، چونکە (کۆمەڵەی گەلان ) نەیتوانی هیچ شێوازو ئامرازێکی وەها بدۆزێتەوە کە حکومەتی عێراق ناچاربکات دوای سەربەخۆ بوون ، مامەڵەیەکی باشی کورد بکات لەعێراقدا[٥٥] .

ئیدی لەکۆتایدا (کۆمەڵەی گەلان) لەڕێکەوتی ١٦ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ دا بڕیاریدا ویلایەتی موسڵ بخرێتەوە سەر عێراق .

---

[٥٤] کرد وترك وعرب ، ل ٣٧٦-٣٧٧ .

* ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان لە (برۆکسل)ی پایتەختی بەلجیکا کۆبوونەوەیەکی نا ئاسایی ئەنجام دا ، کە یەکەم دانیشتنیان لە ١٩٢٤/١٠/٢٧بوو، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لەو ئاژاوەو پشێویانەی لەسەر سنوردا رودەدات. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لە ١٩٢٥/١١/١٥دا هێڵێکیان دەستنیشان کرد بۆ دیاری کردنی سنوور، هەردوو حکومەتی بەریتانیاو تورکیا ئەو هێڵەیان پەسند کرد کە بەهێڵی برۆکسل ناسرا.(فاضل حسین: هەمان سەرچاوە، ل٨٠،٨٢).

[٥٥] د. عبد الفتاح علي يحى البوتاني : وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية ،ط١ ، أربيل ، ٢٠٠١ ، ل٣٣ .

# باسی دووەم
# کۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسیەکانی سلێمانی ..

دوای چارەسەر کردنی کێشەی ویلایەتی موسڵ، سلێمانی بەڕەسمی خرایەوە سەر عێراق ، لێرە بەدواوە هەردوو حکومەتی بەریتانی و عێراقی پشتیان کردە کوردو داواکاریەکانی، چونکە سیاسەتی بەریتانیا لە سەر ئەوە جێگیرببو کە کوردەکانی باشور لەنێو چوارچێوەی عێراقدا بن بێ دیاریکردنی هیچ مافێکی سیاسی دیاریکراو هەربۆیە کاتێك ڕوناکبیران و نیشتمانپەروەرانی سلێمانی ئەم هەڵوێستەی ئینگلیزیان بۆ ئاشکرا بوو بەرامبەر بە مافەکانی گەلی کورد لەم پارچەیەدا . دووبارە دەستیان کردەوە بە چالاکی سیاسی نواندن و جم و جۆڵ.

ئینگلیزەکانیش لای خۆیانەوە دوای یەکلایی بوونەوەی کێشەی موسڵ ، کەوتنە خۆ بۆ جێگیر کردنی ئیدارە لە سلێمانیدا ، بۆ ئەم مەبەستە (ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگ )* ی کردە موتەسەڕیفی سلێمانی و بەبۆنەی دەست بەکار بونیەوە (چاپمەن) وتەیەکیشی بۆ خەڵکی سلێمانی خوێندەوە[56]، و سلێمانی بە ڕەسمی ناونرا لیوای سلێمانی[57]. بەم شێوەیە حکومەتی بەریتانیا دوای ئەوەی مەبەستەکانی خۆی بەدیهێنا ، سەرەتا لەپێناو دڵنیاکردنەوەی خەڵکی سلێمانی ، چەند جارێك وەفدی هەردوو

---

* یەکێك بوو لە پیاوە ناسراوەکانی سلێمانی لە ساڵی ١٨٩٨ لەدایکبووە، خزمایەتی لەگەڵ پشدەریەکاندا هەبووە، ئاستێکی خوێندەواری باشی هەبووە، لە ڕۆژگاری داگیرکردنی ئینگلیزەوە چەند پۆست و پلەو پایەیەکی گرنگی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٢٤ دوای داگیرکردنەوەی سلێمانی کراوەتە (متصرف)ی شارەکە.(نجدة فتحي صفوة: العراق في الوثائق البريطانية، سنة١٩٣٦،ترجمة وتحرير مركز دراسات الخليج العربي، جامعة البصرة، ١٩٨٣، ل٥٧).

[56] ژیانەوە : ژمارە (٢٠) ١٩٢٥/٣/٩ .

[57] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمود قارەمان ، ب٢ ، ل٥٦١ .

دڵنیاکردنەوەی خەڵکی سلێمانی ، چەند جارێك وەفدی هەردوو حکومەت سەردانی سلێمانیان کردووە ، بۆ نمونە لە ٤ ی نیسانی١٩٢٥ ( لۆردئێمری) وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا بە یاوەریی ژمارەیەك لە ئەفسەرانی پایە بەرزی ئینگلیز سەردانی سلێمانیان کردووەو خەڵکی چوونەتە پێشوازیان ، هێندەی پێنەچووە لە سەرەتای مانگی مایس ی ١٩٢٥ ( یاسین الهاشمی ) سەرۆك وەزیران سەردانی سلێمانی کردووە[٥٨]. کاتێکیش (کۆمەڵەی گەلان) بڕیاری یەکلایی کەرەوەی خۆی ڕاگەیاندو ویلایەتی موسڵی لەگەڵ عێراقدا جوتباقە کرد ، لە سلێمانی ئاهەنگێکی گەورە سازکراو جگە لە موتەسەڕیف چەندین پیاوی گەورەی نێو دام و دەزگاکانی شارەکە وتاریان خوێندەوەو خوێندکارانی خوێندنگاکان هێنرابوونە سەر شەقامەکان ، بە جۆرێك سەرجەم ژمارە (٥٤) ی ژیانەوە بۆ ڕێ و ڕەسمی ئەو ئاهەنگە تەرخان کرابوو[٥٩].

هەر ئەو سەردەمە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك سەردانی سلێمانی کردووەو خوێندنگایەکی نوێی کردۆتەوە ، بەو خوێندنگا تازەیە سلێمانی بووە خاوەنی دوو خوێندنگا[٦٠].

کاتێك ڕوناکبیرانی سلێمانی کەوتنە چالاکی و کاری سیاسی کردن ، وەك پێشتر دوو ڕەوت لە گۆڕەپانەکەدا هەست پێدەکرا ، کە بریتی بوون لە ڕەوتێکی میانڕەو کە مەبەستیان تەنها بەدەستهێنانی جۆرێك بوو لە مافی (ئۆتۆنۆمی)، بەڵام ڕەوتی دووەم کەسانێکی توندڕەو بوون و خاوەنی دەیان خەونی گەورەی نیشتمانی بوون ، جودا بوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ ئاواتی هەرەپێشینەیان بوو[٦١].

لەسەرەتادا ڕەوتە میانڕەوەکە پێیان وابوو دەتوانن لەسایەی بەریتانیادا کاربکەن ، لە هەموو مەسەلەیەك زیاتر گرنگیان بە خوێندن و خوێندەواری

---

[٥٨] ژیانەوە : ژمارە (٢٤) ١٩٢٥/٤/١٩؛ (٢٦) ١٤ /١٩٢٥/٥ .

[٥٩] ژیانەوە : ژمارە (٥٤) ١٩٢٥/١٢/٢٤ .

[٦٠] ژیانەوە : ژمارە (٣٠) ١٩٢٥/٧/١٠ .

[٦١] د. عبد الفتاح علی یحی البوتانی : وثائق عن الحرکة ، ل ٣٤-٣٥ .

دەدا ، بۆ ئەم مەبەستەش دەستەیەکیان (ئەنجومەنی مەعاریفی سلێمانی) یان دامەزراند ، بە سەرۆکایەتی موتەسەرپیف بەمەبەستی پێشخستنی خوێندن و خوێندەواری ، بۆ ئەم مەبەستەش لە رێکەوتی ١٢ ی تشرینی دووەمی ١٩٢٥ دا یەکەم دانیشتنیان ئەنجامدا[٦٢] . جگە لەوەش لە چەند ژمارەیەکی رۆژنامەی (ژیان)* دا، داوا لە نوێنەرانی کورد دەکەن لە پەرلەمانی عێراقدا، کە هەموو هەوڵ و کۆششێکیان بخەنەگەڕ بۆ پێشخستنی خوێندن و خوێندەواری لە کوردستانداو مامۆستاو پرۆگرام دابین بکەن و خانەی مامۆستایان بکەنەوە[٦٣]ناکبیرانی ئەوسای سلێمانی زۆر چاك ئەو راستییەیان دەزانی کە سلێمانی لە هەموو لیواکانی دیکەی عێراق دواکەوتوترەو لە سالآنی رابردوودا زۆر ناخۆشی و نەهامەتی توش هاتووە[٦٤] .

ئەو سەردەمە هێشتا کەس نەیدەوێرا بە ئاشکرا خۆی لە قەرەی هیچ جۆرە چالاکیەکی سیاسی بدات ، هێندە نەبێت ئەندامە کوردەکانی نێو پەرلەمانی عێراقی ، لایەنگیری (عبدالمحسن السعدون) یان دەکردو کەوتبوونە جم و جۆڵ ، بەتایبەتی پاش ئەوەی نێوبراو لەرێکەوتی ٢١ ی کانونی دووەمی ١٩٢٦ دا لە نێو پەرلەماندا وتارێکی خوێندەوە ، بەئاشکرا داوای دەکرد کە مافەکانی کورد لە بەرچاو بگیرێت، لەدامەزراندنی فەرمانبەرانی کورد لە نێوچە کوردییەکانی ویلایەتی موسڵ و بەرەسمی کردنی زمانی کوردی[٦٥] .

[٦٢] ژیانەوە : ژمارە (٥٠) ١٩٢٥/١١/٢٦ .

* رۆژنامەیەکی سیاسیی ئەدەبیی هەفتانە بوو ، یەکەم ژمارەی لە ١٩٢٦/١/٢١بلاو بووەوە، و تا سالّی١٩٣٨بە بەردەوامی دەردەچوو، دواژمارەی کە ژمارە(٥٥٣)بوو لە ١٩٣٨/٣/١٠ بلاو بووەوە.(فاروق علی عمر:هەمان سەرچاوە،ل١٠٤،١٠٥،١٠٦)

[٦٣] ژیان : ژمارە (٩) ١٩٢٦/٣/١٨ ؛ (١٠) ١٩٢٦/٣/٢٥ .

[٦٤] ژیان : ژمارە (٨) ١٩٢٦/٣/١١ .

[٦٥] عبد الرزاق الحسنی : تاریخ الوزارات العراقیة ، ج ٢ ط ٧ ، بغداد ، ل٥٠ ؛ لطفي جعفر فرج عبد الله : هەمان سەرچاوە ، ل٢٣٦-٢٣٧ .

لەبەر ئەوەی ئینگلیزو حکومەتی عێراق بەهەموو شێوەیەك چاودێری جم و جۆڵی ڕوناکبیرانی سلێمانیان دەکرد ، نەدەکرا ، هێندە بەئاسانی چالاکی سیاسی ئەنجام بدرێت ، بۆیە لەسەرەتاوە نیشتمانپەروەران پەنایان بۆتەرزە کۆمەڵ و ڕێکخراوێك دەبرد کە سیمایەکی سیاسی ئاشکرای نەبێت . هەر بۆیە لە ١ ی شوباتی ١٩٢٦ دا بە نوسراوێکی ڕەسمی داوای مۆڵەتی دامەزراندنی جەمعیەتێکیان کرد بە نێوی (جەمعیەتی زانستی کوردان) و لە ٢٤ ی شوباتی هەمان ساڵدا ڕێگایان پێدرا ، لە سەرەتاوە داواکاریەکە لەلایەن سێ ڕوناکبیری سلێمانیەوە پێشکەش کرابوو کە بریتی بوون لە ( فائق مەعروف ، ڕەفیقی محامی ، ڕەمزی فەتاح ) .

ئەم دەستەیە بەئاشکرا لە پەیڕەو پرۆگرامی خۆیاندا دانیان بەوەدا دەنا کە بە هیچ شێوەیەك دەست لە سیاسەت وەرنادەن و هیچ چالاکیەکی سیاسی ناوێنن ، مەبەستیان بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری یە لە کوردستاندا لە ڕێگای (بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە، نوسین و وەرگێڕانی کتێب، کردنەوەی قوتابخانە، ڕۆشنبیرکردنی خەڵکی) ، پاش ئەوەی بەنوسراوی ڕەسمی لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە وەڵامیان درایەوە. لە شەوی٣/٢ - ٤ - ١٩٢٦ دا ئاهەنگی کرانەوەی جەمعیەتی زانستی سازکراو لە ڕێکەوتی ١٩٢٦/٤/١٣ دەستەی بەڕێوەبەری جەمعیەت هەڵبژێردرا کە لەم ناوانە پێکدەهات :-

١- ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگی موتەسەڕیف - سەرۆك .

٢- جەمال بابان - حاکم - جێگر .

٣- شێخ مستەفا قەرەداغی - قازی - ئەندام .

٤- حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا - ئەندام .

٥- عیزەت بەگی عوسمان پاشا - ئەندام .

٦- غەفور ئاغا - ئەندام .

٧- ڕەمزی فەتاح - ئەندام .

٨- فائق مەعروف بەگ - ژمێریار .

٩- ڕەفیق ئەفەندی - سکرتێر[٦٦] .

گەر هەڵوەستەیەك لە ئاست ناوی ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر بکەین ، دەبینین سەرجەمیان خەڵکی بەرچاوو فەرمانبەری خاوەن پلەو پایەن ، هیچ مۆرکێکی سیاسیان پێوە دیارنیە ، بەڵام دواتر لەسەر دەستی جەمال بەگی بابان ، کە جێگری سەرۆك بوو ، بەرەبەرە بەرەو بەسیاسی بوون بەکێش دەکراو سیمایەکی سیاسیشی پێ بەخشرا[٦٧] ، کە دواتر دەبینین خوێندکارانی مەکتەبی شەوانی زانستی ، چ ڕۆڵێکی بەرچاویان دەبێت لە جۆشدان و گەرم کردنی ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلولی بەردەرکی سەرا[٦٨] ، ئەم مەکتەبی شەوە ، یەکێك بوو لەو خزمەتانەی جەمعیەتی زانستی کە کردبوویەوە بۆ ئەو کەسانەی بەڕۆژ لە بەر کارکردن و نان پەیدا کردن نەیان دەتوانی بخوێنن . بەشەو دەچوونە ئەو مەکتەبە.

شایانی باسە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری ئەم کۆمەڵەیە ، لەو ڕۆژگارەدا بەپێی بارودۆخی جولانەوەی نیشتمانی پێیان وابوو هەل و مەرجی نالەباری کوردستان واپێویست دەکات لە هەموو شت زیاتر بایەخ بە خوێندەواری و زانست بدەن ، ئەم ڕێگایەشیان بە چاکترین شێواز دەزانی بۆ گەیشتن بە کاروانی پێشکەوتن و ڕۆشنبیر کردنی کوردەواری[٦٩] . بەڵام ئەم

---

[٦٦] ڕۆژنامەی ژیان : ژمارەکانی ( ١١) ١٩٢٦/٤/١؛ (١٢) ١٩٢٦/٤/١٢ ؛ ( ١٣) ١٩٢٦/٤/٢٢

[٦٧] پی ڕەش : العراق دولة بالعنف ، ل ٤٤ .

[٦٨] غەفوری میرزا کەریم : کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، ل١١١ .

[٦٩] غەفوری میرزا کەریم : کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی ، ل١١١ .

کۆمەڵەیە وێڕای خزمەتی زۆریان لە شاری سلێمانیدا ، بەڵام لە ئاستی پێویستدا نەبوون ، چونکە ئەمان ماف ئەوەیان هەبوو لە دەرەوەی سنوری سلێمانیش لقی جەمعیەتی زانستی دابمەزرێنن و خزمەت بکەن ، بەڵام چالاکیەکانیان لە ئاستی سلێمانی نەچووە دەرەوە[٧٠] .

بەڵام دوای ئەوەی نیشتمانپەروەرانی کورد بەگشتی و سلێمانی بەتایبەتی ئەوەیان بۆ دەرکەوت . کە ئینگلیزو دەوڵەتی عێراق هیچ نیاز پاکیەکیان بەرامبەر بەکورد نیە، کەوتنەوە خۆئامادەکردن بۆ خەبات کردن ، کە لەو رۆژگارەدا ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی باکووری کوردستان لەژێر ستەمی کەمالیەکان هەڵاتبون و خۆیان گەیاندبووە باشوری کوردستان ، ئەمەش بۆخۆی فاکتەرێکی دیکەی ئەو گورو تینە بوون کە ڕوناکبیرانی گرتبۆوە[٧١] .

تەنانەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٥ دا (شێخ مەهدی) برای شێخ سەعیدی پیران سەردانی سلێمانی کردووەو ماوەیەکیش لە شارەکەدا ماوەتەوە ئەمەش کاری کردبووە سەر بەشەکانی دیکەی کوردستان[٧٢] .

بەم شێوەیە ، ڕوناکبیران کەوتنەوە سەر بیری دامەزراندنی کۆمەڵەو ڕێکخراوی سیاسی بۆ بەرگرتن بە سیاسەتی حکومەتی عێراق و بەریتانیا لەم بوارەشدا چەند کۆمەڵەو ڕێکخراوێك لە سلێمانیدا دامەزران کە بریتی بوون لە:-

---

[٧٠] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ( ئیبراهیم ئەحمەد ) ، کۆمەڵەی کەلەپوری کورد مامۆستا( حەمە صالح سعید ) لە ڕێکەوتی ١٣/٢/١٩٢٢ ئەنجامی داوە ..

[٧١] د. عبد الفتاح علی یحی البوتانی : وثائق عن الحرکة القومیة الکوردیة ، ل٣٤ .

[٧٢] ژیانەوە : ژمارە (١٥) ١٩٢٥/١٢/٣ .

## ١- جەمعیەتی پێشکەوتنی کوردان :

زانیاری زۆرکەم سەبارەت بەم کۆمەڵەیە لەبەردەستدایە ، کە لە دامەزراندن و پەیڕەو و پرۆگرامی بدوێ ، (کریس کۆچیرا) ئاماژەیەکی سەرپێیانە دەکات بۆ ئەم کۆمەڵەیە،کە لە ساڵی ١٩٢٦ لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کۆمەڵەیەکی نهێنی بە نێوی ( پێشکەوتن ) ئاشکراکردووە ، کەبە مەبەستی خزمەتکردنی کورد دامەزراوە[٧٣] .

جگە لەم سەرچاوەیەش ، (پی ڕەش) بەهەمان شێوە باس لەوە دەکات کەوا کۆمەڵەیەك بەنێوی (پێشکەفتی) لەلایەن ئینگلیزەوە ئاشکرا کراوە[٧٤] .

بەڵام تەنها سەرچاوەیەك کە لە بەردەستدا بێت و بە وردی باس لەم کۆمەڵەیە بکات ، دەستنوسێکی نێو ئەرشیفەکەی (مستەفا صائیب) ە ، لەم بەڵگە نامەیەدا ، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت ، کەدوای هەڵوەشاندنەوەی (جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن)، (جەمعیەتی پێشکەوتنی کوردان ) وەك یەکەمین کۆمەڵەی سیاسی نهێنی لە باشوری کوردستاندا پێکهاتووە ، لە پرۆگرامەکەشیاندا ، بەئاشکرا باس لەوە دەکەن کە مەبەستیان بەدیهێنانی مافی ڕەوای گەلی کوردە ،وێڕای ئەوەی بلاوکردنەوەی زانست و ڕوناکبیری ئامانجێکی جەمعیەتەکەیانە، هەرچەندە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە بەریتانیایان بەڕێبەری خۆیان ناسیوە، بەڵام وەك بەڵگە نامەکە ئاماژەی پێدەکات لە یەکەم هەفتەی دامەزراندنیاندا لەلایەن سیخوڕەکانی ئینگلیزەوە ئاشکرا کراوەو، پرۆگرامەکەیان وێنەیەکی لەبەر گیراوەتەوەو دراوە بە موتەسەریفی سلێمانی. ئەمەش لە ڕێکەوتی ٧ کانوونی دووەمی ١٩٢٦ دا بووە . بەڵام بەحوکمی ئەوەی ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری ئەم کۆمەڵەیە بەریتانیایان بەڕێبەری خۆیان ناسیوە ، پێناچێت شێخ مەحمود هیچ

---

[٧٣] کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، وەرگێڕانی محمد ڕیانی، چ٢، تەهران ، ١٣٦٩، ل ١٨٣.
[٧٤] العراق دولە بالعنف ، ل٤٤ .

ئاگاداری ئـەم کۆمەڵەیـە بووبـێ، هەرچـەندە نـاوی ئـەندامانی دەسـتەی دامەزرێنـەری ئاشـکرانەبووە . هۆکـارێکی سـەرەکی زوو ئاشـکرا بـوون و هەڵوەشاندنەوەش بۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە لـە پرۆگرامەکـەیاندا باسـیان لـە (حقوقی مەشروعە) ی کورد کردووە، ئەوکاتـەش نە ئینگلیزو نـە حکومـەتی عێراق ئامادەنەبوون بەهیچ شێوەیەك گوێ بیستی ئەم دەستەواژەیە بن[٧٥].

حکومـەتی عـێراق و ئینگلـیز نـەك ڕێگایـان بـە دامـەزراندنی هیـچ ڕێکخراوێك نەدەدا ، بەڵکو ، هـەچ کەسێك بۆنـی نیشـتمان پـەروەری لێبهاتایـە دووریـان دەخسـتەوە ،تەنانـەت (حـاجی مسـتەفا پاشـا یـامولکی) کـە پـڕو پاگەندەی ئـەوەی بۆ دەکرا پیـاوی ئینگلـیزە ، کـاتێك دەسـتەیەك لـە پیـاو ماقوڵانی سلێمانی و بازرگانـەکان، لای خۆیانـەوە بۆ ئـەندامێتی ئەنجومـەنی نوێنـەرانی عـێراق هـەڵبژێردرا . وەك نوێنـەری سـلێمانی[٧٦]. (شافەیسـەڵ) بـە هـەموو شێوەیەك ئـەو مەسـەلەیەی ڕەتکردەوەو نەیهێشـت ببێـت بـە ئـەندامی پەرلەمان[٧٧] .

## ٢- جەمعیەتی زەردەشتی :-

سەبارەت بە مێژووی دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە ، دوو بیروڕا هەیە :

یەکەمیان ئەو ڕایەی (مستەفا صائب) ە کە دەڵێت : "ئەندازیار بووم لـە بـەغدا سـاڵی ١٩٢٦ گەڕامـەوە سـلێمانی لەگـەڵ چـەند لاوێکـی نیشـتمانپەروەردا ، کۆمەڵەیـەکی نـهێنیمان دامـەزراند بـەناوی کۆمەڵـەی ( زەردەشتی ) ، خۆم بووم بە (موعتەمید)[٧٨] ". بەڵام شێخ سـەلامی شـاعیر لـە

---

[٧٥] کەمال ڕەئووف محەمەد :جەمعیەتی پێشکەوتنی کـوردان ، کوردسـتانی نـوێ ، ژمـارە ١٤٦٢-١٤٦٣ ، ١٩٩٧/٦/١٤ ، ١٩٩٧/٩/١٦ .

[٧٦] ڕۆژنامەی ژیان : ژمارە (٥) ، ١٩٢٦/٢/١٨ .

[٧٧] کەمال ڕەئووف محەمەد :جەمعیەتی پێشکەوتنی کوردان ، کوردستانی نوێ ، (١٤٦٢ ) .

[٧٨] ئارام : کۆمەڵەی زەردەشت لەمێژووی کورددا ، بەیان ، ژمارە (١٩) ١٩٧٤ ، ل٨ .

پێشەکی دیوانەکەیدا دەڵێت : "ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٢٨ دا دامەزراوەو من بووم بە موعتەمید"[٧٩] . بەڵام هیچ بەڵگەیەکی دیکە بۆ سەلماندنی قسەکەی لە ئارادا نیە ، هەر بۆیە ، قسەکەی (مستەفا سائیب) کە دەڵێت : ئەم جەمعیەتە لە ساڵی ١٩٢٦ دامەزراوەو تا ساڵی ١٩٢٩ لە کاردا بووە ، گەواهیەکی ڕاستترە[٨٠] .

دەستەی دامەزرێنەری ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوون لە :- ( شەوکەت بەگی عەزمی بەگی بابان ، عوسمان فایەق ، فوئاد مەستی ، شێخ سەلامی شاعیر ، کەریم سەعید ، کەریم شالوم، عەبدولواحید نوری، کامیل حەسەن ، ئەحمەد عەزیز ئاغا[٨١] و ئیسماعیل حەقی شاوەیس)[٨٢] . شێخ مەحمودی بەرزنجی کاتێك بە هەواڵی ئەم کۆمەڵەیەی زانیوە داوای کردووە ، لە ڕیزەکانیدا قەبوڵ بکرێت،ئەوانیش بە تێکڕای دەنگ بەسەرۆکی فەخری قەبوڵیان کردووە[٨٣] .

مەڵبەندی سەرەکی (جەمعیەتی زەردەشتی) لە بەغدا بووە، بەڵام دوولقی لەسلێمانی و هەولێر بووە و ئامانجی هەرەسەرەکیان ، بەدیهێنانی (موختاریەتی ئیدارە) بووە بۆ کورد ، کە بەگوزارشتی ئەوسەردەمە مانای (ئۆتۆنۆمی) گەیاندووە ، لەم پێناوەشدا دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەو پەیوەندی کردن لەگەڵ هۆزو سەرکردە کوردەکاندا ، لەم بوارەشدا نامەیان ناردووە بۆ (مەحمود خانی کانی سانان) و (شێخ مەحمود)،

[٧٩] دیوانی شێخ سەلام : بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل١٥ .

[٨٠] سدیق سالح : کامیل حەسەن، لاپەڕەیەکی ون گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە (٨) ١٩٩٩، ل٢٩.

[٨١] د. کەمال مەزهەر : صفحات یرویها الأستاذ فؤاد مستی ، التآخی عدد (١٥٨٢) ، ١٩٧٤/١/٢١ ؛ ئارام : کۆمەڵەی زەردەشت لەمێژووی کوردا ، بەیان ، ژمارە (١٩) ١٩٧٤ ،ل٨ ؛ سدیق سالح : کامیل حەسەن ، لاپەڕەیەکیون،ل١٧.

[٨٢] د. کەمال مەزهەر : خێرو بێری ڕاپۆرنوسێکی کورد ، بەشی دووەم ، گۆڤاری ڕەنگین ، (٩٠) ، ١٩٩٦ ، ل٧٠٦.

[٨٣] د. کەمال مەزهەر : صفحات من الماضی... التآخی (١٥٨٢ ) .

جگەلەوە، ویستویانە لە ڕێگای ئەم کۆمەڵەیەوە دژایەتی ڕەوتی تورکچێتی و تورکخواکان بکەن لە کوردستاندا[٨٤]. تەنانەت کاتێك ئینگلیزەکان ویستیان لە ساڵی ١٩٢٨ بۆ مەبەستی خۆیان شێخ مەحمود هان بدەن لە حکومەتی عێراق ڕاپەڕێت کە ئەو کاتە لە (پیران) دادەنیشت ، لەلایەن (جەمعیەتی زەردەشتیەوە) ، چەند خاڵێکیان بۆ گەلاڵە کردووەو بۆیان ڕەوانە کردووە تاوەکو لەسەر بنەمای ئەوخاڵانە داواکاریەکانی کورد بخاتە بەردەستی ئینگلیزەکان و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات[٨٥]. بەڵام د. کەمال مەزهەر بەپێ ی ئەو بەڵگەنامانەی بەردەستی کەوتووە دەڵێت : "کۆمەڵەی زەردەشتی داوایان لە شێخ مەحمود کردووە کە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت نەکات و لەگەڵیان ڕێك نەکەوێت ، چونکە نیازیان لەگەڵ کورد پاك نیە[٨٦] ". بەڵام مەسەلەیەك کە مایەی تێڕامانە لە جم و جوڵ و چالاکیەکانی ئەم ڕێکخراوە ، ئەوەیە ، کە وایان بەچاك زانیوە بنکەی چالاکیەکانیان بگوازنەوە شاری (سنە) لە ڕۆژهەلاتی کوردستان و چاویان لەوەبووە کە ئێران یارمەتیان بداو باربویان بکات[٨٧] . هەروەها باس لەوەدەکرێت کە بەنیازبوون لەشاری (سنە) ڕۆژنامەیەك چاپ بکەن وەك زمانحاڵی جەمعیەتی زەردەشت ، بە نێوی (سخن)[٨٨] . لێرەدا واپێدەچێت دووهێڵ لە ڕیزەکانی ئەم کۆمەڵەیەدا هەبووە بێت ، هێڵێکی نەتەوە پەروەر ژیرو کارامە[٨٩] . هێڵی دووەمیش ئەوانەبوون کە پەیوەندیان بە (ئاسف ئەعزەمی سنەیی ) ئێران و باڵیۆزخانەی ئێران لە بەغدا هەبووە[٩٠] . لێرەدا بۆ ڕاستی هەبوونی دووهێڵ لەم کۆمەڵەیەدا ،

---

[٨٤] خێرو بێری ڕاپۆرنوسێکی کورد ، بەشی دووەم ، گۆڤاری ڕەنگین ، (٩٠) ، ١٩٩٦ ، ل٧؛ ئارام : کۆمەڵەی زەردەشت لە مێژووی کوردا ، بەیان ،ل٨

[٨٥] ئارام : سەرچاوەی پێشوو ، ل٨ .

[٨٦] د. کەمال مەزهەر : خێرو بێری ڕاپۆرنوسێکی کورد ، ب٢ ، ڕەنگین (٩٠) ، ل ٧٠٦ .

[٨٧] دیوانی شێخ سەلام: ل١٢؛ یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید ، ل ١٧٩ .

[٨٨] دیوانی شێخ سەلام ،ل١٨ .

[٨٩] کمال ڕەئووف محەمەد : مستەفا صائب ئەستێرە گەشەی کورد، سلێمانی ،١٩٩٨، ل ١٧.

[٩٠] کمال ڕەئووف محەمەد : مستەفا صائب ئەستێرە گەشەی کورد ، ل١٧ .

دەتوانین پشت بەقسەیەكی فوئاد مەستی ببەستین ، كەدەڵێت : "هەندێ لە ڕۆشنبیران پێیان وابوو ، قورسایی خەبات بگوازینەوە كوردستانی ئێران، چونكە لاوازترین ئەڵقە بوو بۆ سەپاندنی ئیرادەی كوردو باشترو زیاتر بەرەنگاربوونەوەی ئینگلیز" [٩١] . وا پێدەچێت ئەندامانی ئەم هێڵە كەوتبنە هەڵەی گەورەوە ، چونكە ڕووداوەكانی كۆتایی بیستەكان و سەرەتای سییەكان ئەوەیان دەرخست كە ئێران ئەولایەنە نیە پشتی پێ ببەسترێت [٩٢] .

جەمعیەتی زەردەشتی ساڵی ١٩٢٩ لە لایەن ئینگلیزەكانەوە ، ئاشكرا كراو كەوتنە دوورخستنەوەی ئەندامەكانی و قەدەغە كردنی [٩٣] ، چونكە مەترسیەكی گەورەی هەبوو بۆ سەریان . تەنانەت (جەمعیەتی زەردەشت) ڕایەڵی پەیوەندیەكانی خۆی هێندە فراوان كردبۆوە ، وێڕای ژمارەیەكی زۆر لە ئەندام و لایەنگرانی پەیوەندی لەگەڵ هۆزە كوردەكانیش هەبووە وەك ( هەمەوەندو پشدەریەكان ) ویستویانە شارۆچكەی ڕەواندوز بكەنە بنكەیەك بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ كوردەكانی باكوردا [٩٤] .تەنانەت پەیوەندیان لەگەڵ كوردەكانی (سوریاو لوبنان و ئێران ) یشدا هەبوو ، هەر بۆیە ئینگلیزەكان ئاوەها بەزوویی هەڵیان وەشاندەوە [٩٥] .

---

[٩١] د. كەمال مەزهەر : صفحات من الماضی یرویها... التآخی ، عدد (١٥٨٢) .
[٩٢] د. كەمال مەزهەر : خێرو بێری ڕاپۆرنوسێكی كورد ، ب٢ ، ڕەنگین (٩٠) ، ل٦– ٧ .
[٩٣] ئارام : كۆمەڵەی زەردەشت لە مێژووی كورددا ، ل ٨.
[٩٤] د. كەمال مەزهەر : خێرو بێری ڕاپۆرنوسێكی كورد ، ب٤ ، ڕەنگین (٩٢) ، ١٩٩٦ . ل٧.
[٩٥] كمال ڕەئووف محەمەد : مستەفا صائب ، ل١٦.

### ٣- لقی (خۆیبون) لە سلێمانی :-

ساڵی ١٩٢٧، سەرانی چەند ڕێکخراوێکی سیاسی کوردی کۆنگرەیەکیان لەهاوینە هەواری (بحمدن) بەست لە ( لوبنان ) ،ئەم کونگرەیە، ماوەی (٤٥ )ڕۆژی خایاند لە ئاکامدا دروست بونی ڕێخراوێکی سیاسی گەورەو فراوانی لێ کەوتەوە بەناوی (خۆیبون )[٩٦]، کەئامانجی ئەوە بوو سوود لە شکستەکانی ڕابردوو وەربگرێت و لەسەر بنەمایەکی نەتەوەیی خەبات بکات، هەر بۆیە دوان لە دامەزرێنەرانی ئەم ڕێکخراوە خەڵکی سلێمانی بوون، بە نێوی (کەریم شالوم)و(کامیل حەسەن)، کە پێکەوە لە بەغداوە بەرەو شام بەڕێ کەوتبون و چوبوونە (بەیروت)و پاش بەشداربونیان لە کونگرەی دامەزراندنی (خۆیبون) گەڕاونەتەوە بەغداد، کە ئەو کات (کامیل حەسەن) ئەفسەر بووە لە ڕیزەکانی سوپای عیراقدا،هەر بۆیە خۆیبون وێڕای لقەکانی لە سوریاو لوبنان و ئەمەریکاو چەند وڵاتێکی ئەوروپی، لقێکی لە شاری (سلێمانی) هەبوە[٩٧] کەبۆ خۆشاردنەوەو شوێنەونی ناویان لێناوە (شوعبەی فیدائی ژمارە یەك)[٩٨].

ئەندامانی لقی سلێمانی کۆمەڵەی خۆیبون لەژمارەیەك ڕوناك بیری کورد پەروەر پێك هاتیبون وەك:

| | |
|---|---|
| ١-مستەفا صائیب | - سەرۆکی لق |
| ٢-شێخ سەلامی شاعیر | - سکرتێر |
| ٣-غەنی شاڵی | - ئەمین سندوق |
| ٤-عوسمان فایەق | - ئەندام |
| ٥-عەلی عیرفان | - ئەندام |

---

[٩٦] د. عبد الستار طاهر شریف : هەمان سەرچاوە ، ل٦٤ ؛ زنار سلوپی : هەمان سەر چاوە ، ل١٣٤ ؛ بلەج شێرکۆ : کێشەی مێژینەوئێستای کورد ، وەرگێڕانی ، محمد حەمە باقی ،چ٣ ، کوردستانی عێراق ،١٩٩٢، ل٨٨ ؛ لازاریف واخرون: الحرکة الکردیة فی عصرالحدیث، ل١٦٤ .

[٩٧] سدیق ساڵح : کامیل حەسەن ، لاپەڕەیەکی وون گۆڤاری هەزار مێرد ، ژمارە (٨) ، ل٢٠ .

[٩٨] د. کەمال مەزهەر : خێرو بێری ڕاپۆرنوسێکی کورد ، ب١ ، ڕەنگین ژمارە (٨٨) ، ساڵی ١٩٩٦ ، ل١٤ .

٦–فوئاد مەستی – ئەندام
٧–كەریمی سەعید بەگ – ئەندام
٨–سەیدئیبراهیم – ئەندام
٩–شێخ عەزیزئەفەندی – ئەندام
١٠–واحیدئەفەندی، – ئەندام
١١–عەلی ئاغا، –ئەندام
١٢–حاجی سالح، –ئەندام
١٣–عەزمی بەگی بابان، –ئەندام
١٤–شەوكەتی عەزمی بەگی بابان، –ئەندام
١٥–جەلال فەتاح ئەفەندی، –ئەندام
١٦–ئەحمەدی عەزیز ئاغا، –ئەندام
١٧–شێخ مارف، –ئەندام
١٨–كەریم شالوم، –ئەندام

لێرەدا د. كەمال مەزهەر ، بەپێ ی بەڵگەنامەی بەردەستی دەڵێت : هەژدەكەس بوون[٩٩] ، بەلاّم وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد (كامیل حەسەن) ی ئەفسەری سوپای عێراقیش لە دەستەی دامەزرێنەری ڕێكخراوەكەدا بووە[١٠٠] ، هەر بۆیە ڕێی تێناچێت ، ناوبراو لە دەستەی بەڕێوەبەری لقی سلێمانیدا نەبووبێت . كەواتە دەبێت دەستەی بەڕێوەبەر لە هەژدە كەس زیاتر بووبن .

ئەندامانی ئەم لقە لەنێو خۆیاندا لە سلێمانی دەستەواژەی (سنجوق ئەسێنین) یان وەك نهێنی بەكارهێناوە بۆیەكتر ناسینەوە ، كە ئەم دەستەواژەیە واتا هاتووین سجوق بكڕین[١٠١] . پێدەچێت لەم نەریتەیاندا لاسایی (ماسۆنیەكان)یان كردبێتەوە.

ئەم دەستەواژە نهێنیەش بۆ خۆی بەڵگەیەكی دیكەیە ، كە ئەندامانی ئەم لقە ژمارەیان زۆر بووەو هەموویان یەكتریان نەناسیوە . بۆیە لەنێو خۆیاندا بۆ یەكتر ناسینەوەو لێك ئاشكرا بوون ، پەنایان بۆ نهێنی بردووە .

---

[٩٩] سەر چاوە ی پێشوو،ل١٤.

[١٠٠] سدیق سالّح : كامیل حەسەن ، لاپەڕەیەكی ون ، گۆڤاری هەزار مێرد ، ژمارە (٨) ، ل٢٠.

[١٠١] د. كەمال مەزهەر : خێرو بێری ڕاپۆرنوسێكی كورد ، ب١ ، ڕەنگین ژمارە (٨٨) ، سالّی ١٩٩٦ ، ل١٤.

# باسی سێیەم

## ڕاپەڕینی ٦ ی ئەیلولی ١٩٣٠ (بەردەرگی سەرا) : -

### ١- هۆکارەکانی ڕاپەڕینەکە :-

حکومەتی عێراق تا دەهات زیاتر پشتی لە بەڵێنەکانی خۆی دەکرد، سەبارەت بەکورد کە دەبوایە بەپێی ڕاسپاردەکانی لیژنەکەی (کۆمەڵەی گەلان) بۆی دەستەبەر بکردایە[١٠٢].

بەم شێوەیە جارێکی دیکە هەل و مەرجێکی واهاتە کایەوە کە گەلی کورد بەگشتی و خەڵکی سلێمانی بەتایبەتی بێ دەنگ نەبن لەئاستیدا و بکەونە گەڕ، هەرچەندە لە ئەنجامی ڕاودوونان و چاودێری بەردەوام یەك لە دوای یەك کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردیەکانی سلێمانی ئاشکرا دەبوون و هەڵدەوەشێنرانەوە .

لەو ڕۆژانەدا (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) موتەسەڕیفی سلێمانی بوو بارودۆخی شارەکە باش نەبوو .

وا پێدەچێت کە ناو براو نەیاری زۆر بوبێت، چونکە خەڵکی لە کۆڕو کۆبونوەکانی خۆیاندا بە خراپە باسیان دەکرد و ئیدارەکەیان بەدڵ نەبوو[١٠٣].

سەبارەت بە بێ بەڵێنی حکومەتی عێراقیش، ئەوا لە کاتێکدا دەبوایە فەرمانبەران و موچە خۆرانی نێوچە کوردیەکان . لە کوردەکان خۆیان بێت، کەچی لەکۆی (٧٣١) فەرمان بەر تەنها (٣٢٤) یان کورد بوون، ئەوانی دی کە عەرەب و تورکمان و ئاسوری بوون[١٠٤].

هەر ئەمەش وایکرد پەرلەمانتارە کوردەکان، چەند جارێك یاداشت پێشکەش بە سەرۆك وەزیرانی عێراق ونوێنەری باڵای بەرتانیا لە عێراق

---

[١٠٢] د. عبد الفتاح علی یحی: وثائق عن الحرکة القومیة الکوردیة ، ل٣٣ ؛ محمد ئەمین زەکی : دوو تەقەلای بێسوود ، گۆڤاری هەزار مێرد ، ژمارە (٤) ١٩٩٨، ل٦٢ .

[١٠٣] د. کەمال مەزهەر : خێرو بێری ڕاپۆرنوسێکی کورد ، ڕەنگین (٩٢) ، ل٧.

[١٠٤] وەلید حەمدی : هەمان سەر چاوە ، ل ١٨٨-١٨٩.

بکەن و تیایدا داوای جێبەجێ کردنی ڕاسپاردەکانی ( کۆمەڵەی گەلان ) بکەن ، بەڵام داوا کەیان پشت گوێ دەخرا [١٠٥] .

بۆ نمونە لە ڕێکەوتی ٤ی نیسانی ١٩٢٩ دا شەش پەرلەمانتاری کورد لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا یاداشتێکی گرنگیان دا بە سەرەك وەزیرانی عێراق ، دەربارەی مافەکانی کورد .

جارێکی دیکە لە ساڵی ١٩٣٠ دا دوو بارە نوێنەرانی کورد ڕاپۆرتێکیان پێشکەشی نوێنەری باڵا کرد ، بەڵام دووبارە ئاوڕیان لێنە درایەوە ، بۆ جاری سێیەم لە مانگی ئازاری ١٩٣٠ دا هەمان دەستە ڕاپۆرتێکی دیکەیان پێشکەش بە سەرەك وەزیرانی عێراق کرد و داوای جێ بەجێ کردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلانیان دەکرد، ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکە چەند داواکاریەکی تێدا بوو کە بریتی بوو لە :-

١. دروست کردنی لیوایەکی نوێ ، کە (دهۆك) مەڵبەندەکەی بێت .

٢. دامەزراندنی بەڕێوە بەرایەتی مەعاریفی کوردستان ، کە بەڕێوەبەرەکەی کورد بێت...

٣. یەکخستنی ئیدارەی هەر چوار لیواکە (سلێمانی ، کەرکوك ، هەولێر، دهۆك).

٤. تەرخان کردنی بودجەی تایبەت بۆ کوردستان [١٠٦] ....

بەڵام داوا کارییەکانی نوێنەرانی کورد بوو بووە هۆی ناڕەزایی و گلەیی عەرەبە ناسیۆنالیستەکان کە (یاسین الهاشمی ) سەرۆکی (حزب الشعب) نوێنەرایەتی دەکردن [١٠٧] .

ئیدی ئەم بارو دۆخە وای کرد لەکۆتایی بیستەکاندا بزوتنەوەی کوردایەتی بە گڕوتینێکی نوێوە بێتەوە نێو گۆڕەپانەکە [١٠٨] .

[١٠٥] عبد الرزاق الحسنی : تأریخ الوزارات العراقیة ، ج ٣ ، ل٦٤ .

[١٠٦] سەر چاوەی پێشوو ، ل٦٥-٦٦ .

[١٠٧] د. عبد الفتاح علی یحی: وثائق عن الحرکة القومیة الکوردیة ، ل٣٣ .

[١٠٨] د. کەمال مەزهەر : کورد لە دروشمی ڕژێمی پاشایەتیدا ، ڕەنگین ، ژمارە (١١٠) ، ١٩٩٨ ، ل١٠ .

وەك لە بەڵگە نامەیەكی ئینگلیزدا ئاشكرا دەبێت ، هەندێك لە پەرلەمانتارە كوردەكان پێیان وا بووە ، بەریتانیا سیاسەتی لەئاست كورددا گۆڕیوە و بەنیازە مافەكانی گەلی كورد دەستەبەر بكات [١٠٩].

بەڵام كاتێك دەنگو باسی ئەوە بڵاوبۆتەوە كە گفتوگۆ لە نێوان حكومەتی عێراق و بەریتانیادا لەئارا دایە بەمەبەستی مۆركردنی پەیماننامەیەكی نوێ ، كە دەبێت بەپێی ئەو پەیماننامە نوێیە ئینتیدابی ئینگلیز لە عێراقدا كۆتایی پێبێت و عێراق ببێت بە ئەندام لە (كۆمەڵی گەلان ) دا ، ئەوە بوو لە ڕێكەوتی ٣٠ حوزەیرانی ١٩٣٠ دا پەیمانەكە مۆر كرا [١١٠].

بەڵام كاتێك ناوەڕۆكی پەیمان نامەكە بڵاوبوو بووە ، دەركەوت كە بە هیچ شێوەیەك باس لە كوردو مافەكانی ناكات ، ئەمەش وای كرد ، ژمارەیەكی یەكجار زۆر سكاڵاو بروسكە و بیر خەرەوە ئاراستەی سەرەك وەزیرانی عێراق و مندوبی سامی بەریتانیا ( هەمفرین) بكرێت [١١١].

كە لە هەندێكیاندا بە ئاشكرا داوای پێكهێنانی حكومەتێكی سەربەخۆی كوردی دەكەن لەژێر سایەی (كۆمەڵەی گەلان ) دا [١١٢].

جگە لەمانەش چەندین بروسكەو یاداشتی دیكە لەلایەن گەورە پیاوان و ڕوناكبیرانی كوردی خەڵكی سلێمانیەوە ئاراستەی ( كۆمەڵەی گەلان ) كراو تیایدا داوای دەستەبەر كردنی مافەكانی گەلی كوردیان دەكرد ،لەم هەڵمەتەشدا ( حەپسەخانی نەقیب ) ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو [١١٣].

تەنانەت بە سەرۆكایەتی (حەپسەخانی نەقیب ) لە ١٩٣٠/٦/٢٨ دا (كۆمەڵی ئافرەتانی كورد) پێكهاتووە لە سلێمانیدا و (حەپسەخانی

---

[١٠٩] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢ ، ل٦٠٦ ؛ جلال الطالباني : هەمان سەرچاوە ، ل١٠١.

[١١٠] عبد الرزاق الحسني : تأريخ الوزارات العراقية ، ج٣ ، ل٢١ .

[١١١] سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٩ .

[١١٢] سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٠ .

[١١٣] یادداشتەكانی شێخ قادری حەفید ، ل٦٤ .

عیرفانەفەنی)* خێزانی جمیل صائب ، سکرتێری بووە ، بارەگاشیان هەبووە[114] .

چالاکیەکانی ڕوناکبیرانی سلێمانی لەو ڕۆژانەدا تەنها لە سلێمانیدا قەتیس نەبووە ، بەڵکو ڕوناکبیرانی ئەم شارە لە شوێنەکانی دیکەش شوێن پەنجەیان دیاربووە ، بۆ نمونە لە ساڵی (۱۹۳۰) لە موسڵ (ئیسماعیل حەقی شاوەیس و مەحمود جەودەت و فائق کاکە ئەمین و محەمەد علی کوردی و ئەمین ڕەواندوزی ) ڕێکخراوێکی نهێنیان پێکهێنا بە نێوی (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان )** بەمەبەستی هاندانی کورد بۆ داواکردنی مافە ڕەواکانی ، لەم پێناوەشدا پەیوەندیان کردووە بە ڕوناکبیران و سیاسەتمەدارانی کورد لە شارەکانی دیکە ،وەك ( ڕەفیق حلمی ، ئەحمەد خواجە ، ئەحمەد فەخری ) و داوایان لێکردوون لقی کۆمەڵەکە لە شارەکانی دیکە دابمەزرێنن[115] .

ڕۆژگاری پێش ٦ ی ئەیلول بارو دۆخی سلێمانی زۆر نائارام بووە و خەڵکی دڵگیرو پەست بوون ، چونکە پەیمانی ۱۹۳۰ مافی کوردی فەرامۆش کردبوو[116] .

جگە لەوەش فاکتەرێکی دیکەی ناهەمواری بارودۆخی سلێمانی ، بۆ ئەو قەیرانە ئابووریە گەڕاوەتەوە کە کوردستان وعێراقیشی گرتبۆوە ، لەئاکامی کێشە ئابووریەکانی جیهان کە لەساڵی ۱۹۲۹ بە دواوە جیهان گیرۆدەی ببوو ، بێگومان لە هەموان زیاتر چینی هەژار ڕووبەڕوی

---

* کچی عیرفانەفەندی یەو خێزانی (جەمیل صائب)ە، لەساڵی۱۹۰۲ لەسلێمانی لە بنەماڵەیەکی ئایینی لەدایك بووە، ژنێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار بووەو لە زۆربەی ڕوداوەکانی سەردەمی خۆیدا ڕۆڵی بینیوە،(درەخشان جەلال حەفید: هەمان سەرچاوە،ل۷۲).

[114] ڕەسوڵ هاوار :شێخ مەحمودی قارەمان ، ب۲، ل۶۰۲ .

** ئەم کۆمەڵەیە جیاوازەلەو کۆمەڵەیەی لە ساڵی ۱۹۲٦ لە سلێمانی پێکهاتووە.(توێژەر).

[115] د. کمال مەزهەر : الاستاذ اسماعیل حقی شاویس یروی صفحات من نضاله ، التآخی ، ژمارە (١٤٦٠) ۱۹۷۳ .

[116] ڕەسوڵ هاوار :شێخ مەحمودی قارەمان ، ب۲، ل۷۱۰ .

نەهامەتیەکانی ببۆوە ، بازاڕی کوردستان کز ببوو ، نرخی توتن لە کوردستاندا شەش هێندەی جاران دابەزیبوو، ئەم حاڵەتەش زۆر بەخراپی بەسەر گوزەرانی خەڵکیدا شکابووەوە [١١٧].

لەو ڕۆژگارە دژوارەدا ، حکومەتی عێراق لە ڕێکەوتی ١١ ی مایسی ١٩٣٠ دا (تۆفیق وەهبی) کرد بە موتەسەڕیفی سلێمانی لە شوێنی (ئەحمەد عوسمان هەولێری) [١١٨].

خەڵکی سلێمانی هاتنی (تۆفیق وەهبی) یان زۆر لا خۆشبوو ، خەڵکانێکی زۆریش چوون بۆپێشوازی کردنی ، ئەو ماوەیەش کە لە سلێمانی بوو ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لە برەوپێدانی چالاکی ڕۆشنبیری و سیاسی بۆ داواکردنی مافەکانی کورد [١١٩].

بۆیە ئینگلیزەکان و حکومەتی عێراقیش پێیان وابوو ، ناو براو ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە هاندانی خەڵکی سلێمانی بۆ بەشداری نەکردن لەو هەڵبژاردنەی بەنیازبوون بۆپێکهێنانی پەرلەمانی نوێ لە عێراقدا ئەنجامی بدەن ، لە کاتێکدا وەك خۆی بۆ( ڕەسووڵ هاوار ) ی باس کردووە ، ئەو ڕۆڵەی نەبووە [١٢٠] ، ئەو کاتەش حکومەتی عێراق ئەو هەڵبژاردنەی زۆر لامەبەست بوو ، چونکە بەپێیفەرمانێکی ( فەیسەڵ ) لە ١/٧ /١٩٣٠ دا پەرلەمان هەڵوەشێندرا بوەوە ، دەبوایە لە ماوەی دوو مانگدا پەرلەمانی نوێ هەڵبژێردرێت و پەیماننامەی نوێ مۆر بکات ، هەر بۆیە لە ١٩٣٠/٨/٢١ دا لەسەر کار لایان بردوو بانگیان کردەوە بۆ بغدا ، لە شوێنی ئەو (گاون ) ی موفەتیشی ئینگلیز کرایە وەکیلی موتەسەڕیف [١٢١].

---

[١١٧] ئازاد محمد عبدالرحمن : ڕاپەڕینی شەشی ئەیلول و ڕەنگدانەوەی لە شیعری کوردیدا ، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئیبن رشد ، زانکۆیبەغدا (بڵاونەکراوەتەوە) ، ١٩٩٨ ، ل١٩.

[١١٨] جەمال بابان : شارە گەشاوەکەم ، ب٢ ل٢٧٤ .

[١١٩] نەوشیروان مستەفا ئەمین:کوردستانیعێراق سەردەمی قەڵەم و موراجەعات ،(١٩٢٨-١٩٣١)،سلێمانی١٩٩٩،ل٥٣ ؛ میرزا ئەمین مەنگوڕی : هەمان سەرچاوە ، ل١٨ .

[١٢٠] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢، ل ٧١٥-٧١٦ .

[١٢١] ڕەسوڵ هاوار :شێخ مەحمودی قارەمان ،ب٢، ل٧١٤ ؛معروف چیاوك :مأساة بارزان المظلومة،ط٢، ٢٠٠١،ل٨٦.

لەو سەروبەندەدا ، ڕوناكبیران و پیاو ماقوڵانی سلێمانی بە مەبەستی خۆ ڕێكخستن ئەكەونەوە خۆیان و چەند جارێ لەماڵی (عەزمی بەگی بابان ) كۆدەبنەوە سەبارەت بە دوا ڕۆژی كورد دەدوێن ، بەتایبەتی دوای تەواوبوونی ئینتیداب و سەربەخۆیی عێراق ، دوای ڕاوێژ كردن لە ناو خۆیاندا ، دەستەیەك پێكدێنن بە ناوی ( هەیئەتی وەطەنییە ) و عەزمی بەگی بابان هەڵدەبژێرن و دەبێتە سەرۆكیان ، ئەم هەیئەتە باوەڕی بە بەكارهێنانی توندو تیژی نەبووە ، وەكو عیزەت بەگی جاف وتوویەتی "ئەم جارە سیلاح و تفەنگمان قەڵەم ومورا‌جەعاتە " ئەمانە پەیوەندیەكی فراوانیشیان لەگەڵ سەرەك هۆزە كوردەكان دروست كرد [١٢٢]

لەمانگی تەمموزی ساڵی ١٩٣٠ دا ئەمیر ( غازی ) سەردانی سلێمانی كرد بەمەبەستی هێوركردنەوەی خەڵكەكەی ، بەڵام بەر لەوەی بگاتە سلێمانی، (هەیئەی وەطەنییە ) بەم بۆنەیەوە بەیاننامەیەكی دەركرد و تیایدا مافەكانی گەلی كوردی خستبووە پێش چاو و داوای خۆ ئامادەكردنی كرد بۆ خۆ پیشاندانێكی هێمنانە ، كاتێك ئەمیر (غازی ) گەیشتە ناو شار و پێشوازی لێكرا لە لایەن حكومەتەوە ، جەماوەر بە ڕێپێوانێكی هێمنانەو لەسەر خۆ و ئارام لە بەر دەركی سەرادا كۆبونەوە و داوای مافی كوردیان دەكرد ، لە بری جەماوەریش هەر یەك لە (میرزا تۆفیق قەزاز ) و ( ڕەمزی فەتاح ) داوایان لە (غازی ) كرد دەنگیان بگەیەنێتە دەسەڵاتداران [١٢٣] .

لەم كاتەدا حكومەت پەلەی بوو دەبوایە لە ١٠ی ئەیلولی ١٩٣٠ پرۆسەی هەڵبژاردن كۆتایی پێ بێنێت ، تاوەكو پەیماننامەكە مۆر بكات [١٢٤] .

هەر بۆیە ئەم بارودۆخە نالەبارە لە بەرژەوەندی حكومەتدا نەبوو ، هەر ئەمەش وایكرد لە ٥ی ئابی ١٩٣٠ بڕیاربدەن كەوا هەیئەتێكی هاوبەش لە حكومەتی عێراق و بەریتانیا سەردانی شارە كوردیەكان بكەن ، بۆ ئەم مەبەستەش هەریەك لە (جەعفەر عەسكەری) جێگری سەرەك وەزیران و

---

[١٢٢] نەوشیروان مستەفا ئەمین : سەردەمی قەڵەم و مورا‌جەعات ، ل ٥٥ .

[١٢٣] سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧ .

[١٢٤] عبد الرزاق الحسنی : تأریخ الوزارات العراقية ، ج٣ ، ل٦٧ .

(جەمیل مەدفەعی و جەمال بابان) بەیاوەری (مێجەر یانگ) ی وەکیلی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە عێراقدا ، گەیشتنە کوردستان و سەرەتا چونە کەرکوك ، دوای بیستنی بیروڕای خەڵکەکەی ، ئینجا ڕوویان کردە هەولێر ، لەوێش بەهەمان شێوە دیدەنی خەڵکی شارەکەیان کردو گوێیان لە بیرو بۆچونیان گرت ، ئەوە بوو ( خدر بەگی دزەیی ) هەستایە سەرپێ و ووتی "خەڵکی سلێمانی چیان دەوێت ئێمەش ئەوەمان دەوێت"[١٢٥] لە دوا وێستگەدا گەیشتنە سلێمانی لە ڕێکەوتی ١٠ ی ئابی ١٩٣٠ خەڵکێکی زۆر لەپێشوازیاندا ڕاوەستابوون ، داوای سەربەخۆییان دەکرد لە ژێر سایەی بەریتانیادا[١٢٦] . (هەیئەتی وەطنیە) ئامادە بوون و ( ڕەمزی فەتاح )یان دەستنیشان کرد کە لەبری ئەوان لەگەڵ وەفدەکەدا بدوێت ، یەکەم جار سەرەك وەزیرانی عێراق قسەی کردو دوای ئەویش(مێجەریانگ ) ، بەهەمان شێوە وتەیەکی خوێندەوە ، دەستبەجێ ووشە بەوشە دەکرا بەکوردی ، دواتریش بۆ جاری دووەم جەعفەر عەسکەری قسەی کردوو، بەڵێنی دا کە حکومەتی عێراق گفتەکانی خۆی لە پێش چاو دەگرێت، بەڵام ئەوەشی بە ئامادە بووەکان ڕاگەیاند کە دژی هەموو ویست و داخوازیەکیشن ، کە مەترسی هەبێت بۆ سەر یەکێتی خاکی عێراق[١٢٧] .

لە وەڵامدا ( ڕەمزی فەتاح ) بەرپەرچی قسەکانی سەرەك وەزیرانی دایەوەو داوای دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆی دەکرد بۆ کوردستان ، ئەو حکومەتەش کە بۆ کورد پێکدەهێنرێت پێویستە بخرێتە نێو خاڵەکانی پەیماننامەکەی (١٩٣٠) ەوە ، بەڵام (مێجەریانگ) بە سەرسوڕمانەوە ئەوەی ڕاگەیاند کەئەوان سەردانی هەولێرو کەرکوکیان کردووە ، بەڵام جگە لە سلێمانی کەس داوای جیابوونەوەی نەکردووە .

نوێنەرانی حکومەت لەو گفتوگۆیەدا دەیانویست بەهەموو شێوەیەك ، قەناعەت بە نوێنەرانی ( هەیئەی وەطنیە ) بکەن کەوا ناکرێت کوردستان لە

---

[١٢٥] معروف چیاوك : هەمان سەرچاوە ، ل٨٤ .

[١٢٦] میرزا ئەمین مەنگوڕی : هەمان سەرچاوە ، ل١٤ .

[١٢٧] نەوشیروان مستەفا ئەمین : کوردستانی عێراق سەردەمی قەڵەم و موراجەعات ، ل ٥٨ .

(عێراق) جیابێتەوە ، چونکە پەیوەستی ئاینی و بەرژەوەندی ئابووری لە نێوانیاندا هەیە ، لە بەرامبەریشدا ( هەیئەی وەطنیە ) بە هەموو شێوەیەك ئەوەیان ڕەت دەکردەوە کە لەگەڵ عێراقدا جوتباقە بکرێن ، ئیدی کاتێك وەفدەکەی حکومەت زانی قسەکردن لە گەڵ خەڵکی سلێمانیدا هیچ ئاکامێکی نیە کە لە بەرژەوەندی حکومەتی عێراقدا بێت ، کۆبوونەوەکە کۆتایی پێهێنراو[128] لە ڕێکەوتی ١٢ی ئابی ١٩٣٠ دا وەفدەکە گەڕایەوە بۆ بەغدا[129].

هەرئەو ڕۆژانە بەر لە ڕودانی کارەساتی ٦ ی ئەیلول ، حکومەتی عێراق لای خۆیەوە ، هەوڵیدەدا (هەیئەتی وەطەنییە) ناو زڕاوو لەکەدار بکات ، بۆ ئەم مەبەستەش پەنای بردە بەر بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەك بەزمانی عەرەبی لە ١٩/ ٨/ ١٩٣٠ کە تیایدا بەئاڕاستەیەکی ئاینی کەوتبووە تانەوتەشەردان لەو کەسایەتی و ڕوناکبیرانەی سەرمەستی بیری نیشتمانپەروەری بوون و داوای سەربەخۆیی جیابوونەوەیان دەکرد ، بەتایبەتی ئەندامانی هەیئەتی وەطەنیە و لەگەڵ ئەوانیشدا ، تۆفیق وەهبی موتەسەڕیفی سلێمانی و عیزەت تۆپچی، بەیاننامەکە ئەو کەسانە بە بێ دین و هەڵگەڕاوەو تێکدەر لە لەقەڵەم دەدات و بەدەستی دوژمنیان دادەنێت ، کەمافی ئەوەیان نیە بەناوی کوردەوە قسە بکەن وێڕای ئەوەی لە بەیاننامەکەدا داوایان لە سەرکردە کوردەکان دەکرد دەست بخەنە دەستی حکومەتی عێراقەوەو دەست لەو داوایانە هەڵبگرن کە زیانی بۆ عێراق هەیە ، بەپێچەوانەوە کۆشش بکەن بۆ سەرخستنی حکومەتی موسوڵمانی عێراق ، هەروەها سەرجەم بروسکەو سکاڵاکانی ڕوناکبیران و سەرەك هۆزەکانی کورد کە ڕەوانەی (کۆمەڵەی گەلان ) یان ، کردبوو، ڕەتی دەکردنەوەو کوردستانی بە وڵاتێکی ئیسلامی لەقەڵەم دابوو ، زۆر بەگەرمیش داوای برایەتی کوردو عەرەبی دەکرد[130].

---

[128] ژیان ، ژمارە (٢٥٨ ) ، ١٩٣٠/٨/٢٨ .

[129] سەرچاوەی پێشوو .

[130] د. عبد الفتاح علی یحی : معاهدة ١٩٣٠ ، و الدعایة الدینیة المناهضة لمطالب الکورد القومیة ، گۆڤاری (مەتین ) ، ژمارە (١١٠) ، دهۆك ٢٠٠١ ، ل ١٠٦-١٠٧ .

ڕۆژانی بەر لە ٦ ی ئەیلول خوێندکارانی قوتابخانەی شەوانەی زانستی بەرچاوترین ڕۆڵیان هەبوو لە هاندانی جەماوەرو جۆشدانیان ، تەنانەت کاتێك ، نیشتمانپەروەران و ڕوناکبیرانی سلێمانی بڕیاریان دا ، نامە بنێرن بۆ سەرەك هۆزەکان و شێخەکانی بادینان ، ئەو خوێندکارانە نامەکانیان دەنوسی و دەیان خستە پاکەتەوە ، بەلاّم ناوەکانیان لەسەر نەدەنوسی ، ئەوەبوو دواتر (جەمال عارف) کە ئەفسەر بوولە سوپای عێراق دا بڕیاری دا ئەو نامانە بگەیەنێتە دەست خاوەنەکانی، بۆ ئەم مەبەستەش سەفەرێکی (بادینان) ی کردو نامەکانی بۆ بردن ، بەلاّم بۆ ڕۆژی دواتر کە دەچێتە سەردانی (ماجد مستەفا) کە ناوبراو ئەوکاتە قائمقامی قەزای (ئامێدی ) دەبێت ، ئەوسا دەزانێت کە شێخ و سەرەك هۆزەکان ، سەرجەم نامەکانیان هێناوەو داویانەتە دەست (ماجد مستەفا) حکومەتیش بڕیاری دەستگیر کردنی بۆ (جەمال عارف) دەرکردووە ، بەلاّم (ماجد مستەفا) دەینێرێتەوە بۆ سلێمانی و پێیدەڵێت : "دانیشتوانی ئەم ولاّتە پشتیان پێنابەسترێ ، بگەڕێوەو جارێکی دیکە کاری وا نەکەیت[١٣١] " .

تادەهات بارودۆخی سلێمانی زیاتر ڕووی لە گرژی دەکرد ، هەر ئەو ڕۆژانە ( ئەمین زەکی بەگ ) نامەیەك دەنێرێت بۆ دۆستەکانی خۆی لە سلێمانی و داوایان لێدەکات کارێکی وەها نەکەن ببێتە هۆی کوشتارو خوێن ڕشتن ، بەلاّم عیزەت تۆپچی لە وەلاّمدا، نامەیەك بۆ (ئەمین زەکی بەگ ) دەنوسێتەوەو دەڵێت : "کورد لەوە زیاتر لە ووزەیدا نیە کە بێدەنگ دانیشێت ، بەرامبەر بێ بەڵێنی حکومەتی عێراق ، کە نایەوێ بەهیچ جۆرێك لەو پەیمانەدا باسی ماف کورد بکات ، لەبەرئەوە بڕیارمان داوە ڕاپەڕینێك بکەین[١٣٢] ".

هەر بۆیە ڕوودانی کارەساتی ٦ ی ئەیلولی بەردەرکی سەرا کارەساتێکی چاوەڕوان کراو بوو.

---

[١٣١] علاء الدین سجادی : هەمان سەرچاوە ، ل١٢٣-١٢٤ .

[١٣٢] ڕەسولْ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢، ل ٧٥٢ .

٢-ڕاپەڕینەکەی بەردەرکی سەرا ..

ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرا وێڕای ئەوەی ڕەمزێکی درەوشاوەی کۆڵنەدانی گەلی کوردە لە ساتێکی مێژوویدا ، لە هەمان کاتدا بە خاڵی وەرچەرخان دەژمێردرێت لە مێژووی جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستاندا ، چونکە بۆ یەکەم جار بوو ، قورسایی شۆڕش و خەبات لە لادێوە بگوازرێتەوە بۆ شار و ، خەڵکی ڕوناکبیرو بازرگان و گەورە پیاوانی شارەکان پێشڕەوی شۆڕش و ڕاپەڕین بکەن ، ئەمەش بۆ خۆی گۆڕانکاریەکی قووڵی جولانەوەی کوردایەتی پێکدەهێنا ، لەو کاتەوە دەستەی خوێندەوارو ڕوناکبیری کورد هاتنە نێو ڕیزەکانی پێشەوەی جولانەوەی کوردایەتی [١٣٣].

جگە لەوەش لەم ڕاپەڕینەدا یەکەم جار بوو لە سلێمانیدا و لە مێژووی بزاڤی کوردایەتیدا لە کوردستانی باشور خۆپیشاندان لە ناو شارەکاندا ئەنجام بدرێت و خەڵك داواکاریەکان و دروشمەکانیان لە سەر قوماش بنوسن و بەرزی بکەنەوە [١٣٤].

هەرچەندە دەستەی پێشەنگی ئەم ڕاپەڕینە لە نێو خۆیاندا کێشەشیان هەبوو ، بۆ نمونە: لە کاتێکدا (مستەفا پاشای یامولکی) لە سلێمانی بوو بەڵام لە بەرئەوەی لەگەڵ هەندێك لە ئەندامانی هەیئەی وەطەنیە نەدەگونجا بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوو بەشداری ئەم چالاکیانە بکات [١٣٥].

لەلایەکی دیکەشەوە ، (هەیئەی وەطەنیە) بەهیچ شێوەیەك پەیوەندیان بە (شێخ مەحمود) نەکردووە ، کە شێخ ڕەوفی کوڕی شێخ مەحمود ، ئەم مەسەلەیەی والێکداوەتەوە ، گوایا ئەوانەی بەڕاپەڕینەکە هەستاون ، پڕوپاگەندەیان دژی شێخ مەحمود کردووەو وتویانە ، ئەم جارە شێخ مەحمود لەناودا نیە کورد بە مافی خۆی دەگات [١٣٦].

[١٣٣] جلال الطالبانی : هەمان سەرچاوە ، ل ١١٣ .

[١٣٤] چاو پێکەوتن لەگەڵ ماموستا ئیبراهیم ئەحمەد Med .TV سازی کردووە .

[١٣٥] معروف چیاوك : هەمان سەرچاوە ، ل٨٥ .

[١٣٦] ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢، ل ٧٤٠ .

لێرەدا پێمان وایە ، هۆکاری پەیوەندی نەکردن بە (شێخ مەحمود) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەندامانی (هەیئەی وەطەنیە) نەیان ویستووە ئەم مەسەلەیە تەشەنە بکات بۆ شۆڕشی چەکدارو خۆشیان بڕوایان بە توندو تیژی نەبووە ، بەڵام ، حکومەت سور بوو لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردن لەسلێمانیدا ، دژ بە خواستەکانی خەڵکی ، هەر بۆیە ڕۆژی ٥ ی ئەیلولی ١٩٣٠ کەوتە کارکردن بۆ ڕایی کردنی کارەکانی هەڵبژاردن ، بۆ ئەم مەبەستەش (دەستەی پشکنین) لە کاردا بوو بۆ هەڵبژاردنی ڕۆژی دواتر ، کە تا ئەوساتە خەڵکی بڕیاریان دابوو بەشداری هەڵبژاردن نەکەن [١٣٧].

حکومەتیش ئەم مەسەلەی قەبوڵ نەکرد ، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە زاری ڕەشۆڵی گۆرانیبێژەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت : " ڕەشۆڵ ئێوارەی ٥ ی ئەیلول هات بۆ ماڵمان و پرسیاری ( فایەق بێکەس) ی لێکردم ، منیش وتم بۆچیتە ؟ ووتی : ئەم ئێوارەیە لای سەراوە دەهاتمە خوارەوە ،( باباشێخ )ی باشچاوشی پۆلیس بانگی کردم ، وتی: ڕەشۆل ،هەردەڵێن هەڵبژاردنمان ناوێ و ئێمە کوردین کوردمان ئەوێ ، ئەوا ئێمە بەیانی هەڵبژاردن دەکەین ئەگەر پیاون بەیانی وەرن وابکەن بزانن چیتان لێدەکەین ،منیش دەمەوێ لەگەڵ فایەق دا بەیانی خۆ پیشاندانێك بکەین و نەهێڵین هەڵبژاردن بکرێت[١٣٨] " بەم شێوەیە بۆ سبەینێ بەیانی ٦ ی ئەیلول ، ڕەشۆڵ و فایەق بێکەس کەوتنە خۆ بۆ کۆکردنەوەی خەڵك و خۆپیشاندان ، ئەوانەش کە دەستە ڕاستی فایەق بێکەس بوون لەم کارەدا ، سێ کەس بوون بەناوی (حەمەسەعیدی دارتاش ، محێدینی سالە سور ، مەجیدی حەمامچی)[١٣٩] .

بەڵام لەسەرەتادا خەڵکێکی کەمیان لێ کۆبۆوە کە ژمارەیان هەر پەنجا کەسێك دەبوو، بەڵام دواتر کاتێك دوکاندارەکانی بازاڕ هاتنە پاڵیان ئینجا ژمارەیان زیادی کردوو گەیشتە (٤٠٠) کەسێك ، کە وەك مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد خۆی دەیگێڕێتەوە و یەکێك بووە لە بەشداربووانی ئەم ڕاپەڕینە

---

[١٣٧] علاء الدین سجادی : هەمان سەرچاوە ، ل١٢٥ .

[١٣٨] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد Med .TV .

[١٣٩] میرزا ئەمین مەنگوڕی : هەمان سەرچاوە ، ل١٨ .

دەڵێت : "یەکێك لە دوکاندارەکان ووتی ، خەلقینە بۆ هەڵناستن، ئەوا ئەو ئەفەندیانە بانگمان دەکەن ، هەقە ئێمە سوپاسیان بکەین ، ئێمە لە سەرەتا دەترساین ، کە ئەمانە ئەم کارەیان بۆ باوك و کەس و کاری خۆیان بێت ، کە ئەفەندین و بەیانی دێنە سەر حوکم ، کەچی ئێستا ئەوان بەئێمە دەڵێن وەرن"[١٤٠]

کەلێرەدا دووبارە ئەم قسانە دەبنە بەڵگەیەکی دیکە بۆ ئەو ڕاستیەی کە ڕاپەڕینی ٦ ی ئەیلول لەلایەن ئەفەندی و مامۆستاو خوێندکارەکانی زانستی شەوان پێشڕەوی دەکرا . کاتێك خۆپیشاندەران گەیشتنە بەردەرکی سەرا و کەوتنە هوتاف کێشان دژی هەڵبژاردن و پەیمانی ١٩٣٠ ، خەڵکی ناو بازاڕ ورووژابوون و چایخانەکان پڕببوون لە خەڵك و بە (گرامافۆن ) سرروودی نیشتمانی لێئەدرا ، خوێندکارانی قوتابخانەی زانستی شەوان خەڵکیان کۆ کردەوە و زیاتر جۆشیان دەدان ، بەلاّم لەم خۆ پیشاندانەدا ئەندامانی (هەیئەیوەطەنیە) هیچ کەسێکیان بەدی نەدەکران ، لەبەرئەوەی لەگەڵ توندوتیژیدا نەبوون[١٤١] .

سەبارەت بەو هوتافانەش کە لەخۆ پیشاندانەکەدا دەوترایەوە ، زیاتر گوزارشت کردن بوون لە مافەکانی کورد و ڕەت کردنەوەی پەیماننامەکە ، بەلاّم کەسانێکیش لەو ناوەدا هوتافیان دژ بە عەرەب دەکێشا بەلاّم زوو بێدەنگ کران[١٤٢] .

ئەو جەماوەرەی لەبەر دەرکی سەرادا ئاپۆرەیان بەستبوو ، مەبەستی هەرە سەرەکیان ڕێگە نەدان بوو ، بەوانەی کەدەیان ویست بچنە سەرا بۆ دەنگدان و بۆ ئەم مەبەستە بانگهێشت کرابوون[١٤٣] .

ئەوانی کە دەیانویست بچن بۆ دەنگدان (٣٠) کەسێك دەبوون ، وەك (حاجی ئبراهیم ئاغا ، مەجید بەگی حاجی ڕەسوڵ بەگ ، غالب ئاغا ، حاجی

---

[١٤٠] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد Med .TV .

[١٤١] نەوشیروان مستەفا ئەمین : کوردستانی عێراق سەردەمی قەڵم و موراجەعات ، ل ٦١ .

[١٤٢] ئازاد محمد عبدالرحمن : هەمان سەر چاوە ، ل٢٤ .

[١٤٣] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد Med .TV .

ئەحمەدی حاجی کەریم ، کەریمی عەلەکە ، سەید ئەحمەدی تونچی ، کەریم بەگی محەمەد بەگ ، حاجی کاکە حەمە ، حاجی مەلا محێدین ، حاجی عەلی حاجی حەسەن ئەفەندی ... هتد )[١٤٤] لەکاتی خۆ پیشاندانەکەدا هەندێك کەس بەنیاز بوون هەڵکوتنە سەر زیندانەکەی سەرا و زیندانیەکان بەرەڵابکەن ، بەڵام ڕابەرانی ناو خەڵکەکە ، ڕێگایان نەدان و سنورێکیان بۆ دانابوون[١٤٥] .

بەڵام هێندەی پێنەچوو جەماوەرەکە کەوتنە بەردەباران کردنی پۆلیسەکان و سەرایان دابووە بەر بەرد و پۆلیسەکانیش خۆیان کوتایەوە ناو حەوشەی سەرا لە ترسی خەڵك، چونکە پێشتر پۆلیسەکان کەوتبوونە پاڵنان بە خەڵکەکەوە و چەند جارێك ( بێکەس ) یان ڕفاندو ویستیان ، بیگرن و بیبەن بۆ سەرا بەڵام لە لایەن خەڵکەکەوە ڕزگار دەکرا[١٤٦] .

هەرچەندە بەگشتی خەڵکەکە دارو تیلایان پێ بوو بەڵام هەندێکیان تفەنگ و دەمانچەشیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو[١٤٧] . حکومەت کە زانی لەتوانایدا نیە بارودۆخەکە هێور بکاتەوە و ناتوانێت ئەو جەماوەرە کۆنترۆڵ بکات ، داوای تیپێك سەربازیان کرد بۆ پارێزگاری کردن لە خۆیان ، بەڵام سەربازەکان لەگەڵ گەیشتنیاندا لە سەر بانی سەراو ناو باخەکەدا خۆیان دامەزراند و دەستیان کرد بە تەقە کردن لە خەڵکەکە و ژمارەیەکیان پێکا ، لەوکاتەدا سەربازەکان بەفەرمانی ئەفسەرێکی عەرەبی توندڕەوی دژبە کورد بە (مەترالیۆن) دەستڕێژیان لە خەڵك کرد ، (فوئادی کوڕی صالح قەفتان ) هاواری کرد (خەڵکینە مەترسن فیشەکەکانیان پوچەڵن درۆن[١٤٨] ) ،لێرەدا دەبێ ئەوڕاستیەمان لاڕوون بێت کە حکومەت دەست پێشخەربووە لە تەقەکردن نەك

---

[١٤٤] نەوشیروان مستەفا ئەمین :سەردەمی قەڵەم و موراجەعات ، ل ١٢٨ :میرزا ئەمین مەنگوڕی:هەمان سەرچاوە،ل١٨.

[١٤٥] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد Med .TV .

[١٤٦] ڕەشید کەریم : بیرەوەری؛ ( سی و یەك ساڵ لە ژیانی مامۆستایەك) سلێمانی ، ١٩٦٠،ل ٢٠-٢١.

[١٤٧] یوسف امین رسول : صفحات مشرقة من نضالات شعبنا الكردي . معركة باب السراى ، ذكريات طفل عاصر تلك الأحداث جريدة الاتحاد ، ژمارە (٤٥٠) ، ٢٠٠١/١٢/٧ .

[١٤٨] ئازاد محمد عبدالرحمن : هەمان سەر چاوە ، ل ٢٥ .

خەڵکەکە ،[149] کە حکومەت بۆ چەواشەکاری لە بەیاننامەکەی خۆیدا سەبارەت بەو کارەساتە جەماوەری خۆپیشاندەران تاوانبار دەکات بە دەست پێشخەری[150] .

بەم شێوەیە دەستڕێژی حکومەت بڵاوەی بە خەڵکەکە کردو ئەوڕۆژە لە پۆلیس و سەرباز بترازێت کەس لە سەر شەقامەکان نەدەبینرا ، لاشەی کوژراوەکان لە حەوشەی سەرادا کەڵەکە کرابوو ، کەلە بارەی ژمارەی ئەوانەوە قسەو بۆچونی زۆر هەیە ، هەندێك سەرچاوە ژمارەیەکی خەیاڵی دادەنێن ، بەڵام بەپێی لێکدانەوەی ئەو ناوانەی لەبەردەستدان و چەند سەرچاوەیەکی نزیك لە کارەساتەکەوە ، ژمارەی قوربانیەکان لە نێوان ١٢تا ١٣ کەس دەبێت[151] .

بەڵام بریندارەکان زۆر تر بوون ، لە بەرامبەریشدا یەك سەرباز کوژراوەو دوانیش بریندار بوون ،حکومەت کەوتە دەستگیر کردنی ئەوانەی دەستیان لە خۆپیشاندان و کێشەکەدا هەبوو ، بەشی هەرە زۆری ، کەسایەتیەکانی سلێمانی دەستگیر کرد ، وەك (عەزمی بەگی بابان ، محەمەد صاڵح بەگی محەمەد عەلی بەگ ، حەمەی ئەوڕەحان ئاغا ، عزەت بەگی وەسمان پاشا ، فایەق بەگی مارف بەگ ، شێخ محەمەد گوڵانی ، مەجید ئەفەندی کانێسکانی ، ڕەمزی فەتاح ، تۆفیق قەزاز ، فایەق بێکەس ، صاڵح قەفتان[152] )* .

---

[149] چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد Med .TV .

[150] عبد الرزاق الحسنی : تأریخ الوزارات العراقیة ، ج٣ ، ل ٧١ .

[151] یوسف امین رسول : هەمان سەر چاوە ؛ عبد الرزاق الحسنی : تأریخ الوزارات العراقیة ، ج٣ ، ل ٧١ ، ئازاد محمد عبدالرحمن : هەمان سەر چاوە ، ل ٢٦ .

[152] علاء الدین سجادی : هەمان سەرچاوە ، ل١١٧ ؛ ئازاد محمد عبدالرحمن : هەمان سەرچاوە ، ل٢٥ .

* لەم هەڵمەتی دەستگیر کردنەدا (نوری قەفتان)یش گیراو ماوەی سێ مانگ لەزینداندابوو تەنانەت (فەرەنقە)یان لە دەست و پێی کرد، بەڵام صالح قەفتان خۆی شاردەوەو دەسگیر نەکرا.(چاوپێکەوتن لەگەڵ د.کاوس قەفتان،لە ٢٠٠١/١٢/٢٥،لە سلێمانی).

دواتر حکومەت دەستبەجێ ژمارەیەك لە گیراوەکانی ڕەوانەی کەرکوك کرد ، بەتایبەتی پێشەنگەکانی ڕووداوەکە کە ئەندامانی (هەیئەی وەطەنیە) بوون بەڵام دوای ڕەوانە کردنی ئەوانەش حکومەت هەر سەرقاڵی ڕاونان و گرتنی خەڵك بوو ، لەنێو بەندیخانەشدا بارودۆخیان زۆر خراپ بوو ، لەکاتی لێپرسینەوەدا فشاریان دەخستە سەریان ، تەنانەت کاپتن (گاون) دەمانچەی لە فایەق بێکەس ڕاکێشابوو بە زۆر قسەی پێکردبوو ، ماوەیەکی زۆریش لە زینداندا هێشتبویاننەوە ، هەندێکیان دوای (٢) مانگ بەرەڵا کرابوون[١٥٣] .

دوان لە گیراوەکان دران بەدادگا ئەوانیش (میرزا تۆفیق قەزازو ڕەمزی فەتاح) بوون ، دادوەرەکەش (مەعروف چیاوك) بوو، کە خۆی لە ڕاستیدا نێوبراو نوێنەری (هەیئەیوەطەنیە) بوو لە هەولێر ،بەڵام زیندانی نەکران و ئازاد کران[١٥٤] .

دوا بە دوای ئەم کارە ساتە لە ڕێکەوتی ٨/٧ ی ئەیلولی -١٩٣٠ لە بەغداوە شێخ سەلامی شاعیرو مەحمود جودت ، حەمید جودت و کامیل حەسەن ، کە ئەم سیانەی دواییان ئەفسەر بوون لە سوپای عێراقدا ، بەغدایان جێ هێشت و خۆیان گەیاندە لای شێخ مەحمود لە گوندی (پیران)[١٥٥] .

لەنێو شاریشدا بارودۆخەکە یەکجار گرژ ببوو ، حکومەتی عێراق هێزێکی ڕەوانەی سلێمانی کرد بە فەرماندەیی (بەکر سدقی) . کە هەندێکیان لە چەند شوێنێکی ناو شارو دەوروبەری بنکەو ڕەبایەیان دروست کردبوو ، وەك (گۆڕە جولەکەکان و کارێزی دایکی پاشا) ، بارەگای فەوجەکەش لە کانێسکان بوو[١٥٦] لە هەریەك لەو بنکەو ڕەبایانەدا سی سەربازی (عەرەب و سیك) دانرابوون ، تەنانەت حکومەت لە ترسی جەماوەر ، سەربانی مزگەوت و تەکیەکانیشی کردبوو بە مۆڵگەی سەربازەکانی ، وەك مزگەوتی (تەکیە ڕووتە)

---

[١٥٣] ڕەشید کەریم : هەمان سەر چاوە ، ل ٢٤-٢٥ .

[١٥٤] میرزا ئەمین مەنگوڕی : هەمان سەرچاوە ، ل ١٩؛ ڕەسوڵ هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان ، ب٢، ل ٧٢٥ ؛ چاو پێکەوتن لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد Med .TV .

[١٥٥] دیوانی شێخ سەلام ، ل ١٥ ؛ عبد الرزاق الحسنی : تأریخ الوزارات العراقیة ، ج٣ ، ل ٧٣.

[١٥٦] ڕەشید شەوقی : هەمان سەرچاوە ،ل٣٢.

